ENDÊŞE

ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەندێشە

# ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە

بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: هەژار مەجید

بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود


ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە - ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەندێشە

سلێمانی - شەقامی مەولەوی - تەلاری بازرگانیی سیروانی نوێ - نهۆمی چوارەم

http://www.endeshe.net

andesha.library@yahoo.com ● andesha@outlook.com

http://www.facebook.com/Andeshalib

07501026400

ناوی کتێب: مرۆڤ و کەرامەت
ناوی نووسەر: مەریوان وریا قانع
بابەت: فیکری
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠١٨
چاپخانە: ئەندێشە
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٦٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٢٢٠)ـی ساڵی (٢٠١٦)ـی پێ دراوە.

پێشکەشە بە هەر پێنج خوشکەکەم، کە بەبێ ئەوان
مرۆڤبوونی من کەلێنێکی گەورەی تێ دەکەوت.

# ناوەڕۆک

# ١

ئەم کتێبە باس لە سێ چەمکی سەرەکیی ناو دونیای مۆدێرن دەکات، کە بەسەریەکەوە ڕوانینێکی نوێ بۆ مرۆڤ دەهێننە کایەوە وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و یەکسان، وەک کەسێکی خاوەنکەرامەت، کە لەناو دونیا و کۆمەڵگەیەکی پلورالدا دەژی. ئەو سێ چەمکەش بریتین لە چەمکەکانی "یەکسانی" و "کەرامەت" و "پلورالیزم." ئەم سێ چەمکە، نەک تەنها چەمکە هەرە سەرەکییەکانی ناو دونیای مۆدێرنن، بەڵکو بە زۆر مانا خودی مۆدێرنە خۆشی کردەی دروستبوون و هاتنەکایەی ئەو سێ چەمکەیە، کە ڕوانینێکی تازە بۆ مرۆڤ و دیدێکی نوێ بۆ وێناکردنی کۆمەڵگە دەهێننە کایەوە. دونیای مۆدێرن دونیای لەدایکبوونی "مرۆڤی یەکسان" و "مرۆڤی خاوەنکەرامەت" و "مرۆڤی جیاوازە." "ماف"یش ئەو هەڵقەیەیە کە ئەم سێ چەمکە بەیەکەوە گرێ ئەدات، مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە بە شێوەیەکی یەکسان لەگەڵ ئەوانی تردا مامەڵە بکرێت، مافی ئەوەی هەیە کەرامەتی بپارێزرێت و مافی ئەوەشی هەیە ڕێز لە جیاوازییەکانی بگیرێت. لەپاڵ ڕەهەندێکی یاسایی گرنگدا، هەرسێ چەمکەکە ڕەهەندێکی ئەخلاقیی

هێجگار گرنگیان هەیە، کە بیرۆکەی پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ بنەمای ئەو ئەخلاقەیە کە لەدایک دەبێت. کەرامەت لێرەدا چەمکێکی ئەخلاقیی بنەڕەتییە و هێما بۆ ئەوە دەکات کە مرۆڤەکان هەم یەکسانن لەگەڵ یەکدا، هەم جیاوازن و هەم چەندان مافیان هەیە کە ناهێڵێت ئەو کەرامەتە بریندار بکرێت. مرۆڤ لەم وێناکردنەدا بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەتە و ئەم کەرامەتەش خۆی ئامانجێکی سەربەخۆیە و پابەستی هیچ ئاکارێکی ئینسانیی تایبەت نییە، واتە مرۆڤ بۆ ئەوەی وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت ببینرێت، نابەستریتەوە بە پاشخانێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراوەوە، یان بە شووناسێکی ئەتنی، یان بە بوون یان نەبوونی ئەم دین یان ئەو دینی ترەوە. لەم وێناکردنە نوێیەدا بۆ مرۆڤ، کەرامەت بەهایەکی گشتییە و خۆی لە خۆیدا ئامانجێکە کە دەبێت بپارێزرێت. کەرامەت شتێکە نە دەکڕدرێت و نەدەفرۆشرێت، ڕێزگرتنی کەرامەت وامان لێ دەکات لە یەک کاتدا هەم باوەڕ بە یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا بهێنین و هەم ڕێزی لێکنەچوون و جیاوازییەکانیشیان بگرین. لێرەوە سیانەی "یەکسانی" و "کەرامەت" و "پلورالیزم" دەبنە سیانەیەکەی لەیەکدیدانەبڕاو، بە جۆرێک کە زەحمەت بێت ئەمیان بەبێ ئەوی تریان هەبێت و پاراستنی هەریەکێکیان پێویست بە پاراستنی هەرسێکیان بکات.

ئەگەر مۆدێرنە سێ ئاکاری جیاکەرەوەی سەرەکیی هەبێت، کە لە سەردەم و دونیاکانی بەر لە خۆی جیای بکاتەوە، ئەوا هەرسێ ئاکارەکە لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدان بە مەسەلەی یەکسانی و کەرامەت و

پلورالیزمەوە. یەکەمیان، ئەگەر مۆدێرنە عەقڵ وەک پێوەری هەقیقەت و وەک سەرچاوەی مەعریفە بناسێنێت، ئەوا مرۆڤەکان لەم وێناکردنەدا هەموویان مرۆڤی خاوەنی عەقڵن و عەقڵ شتێکە بەستراوەتەوە بە وێناکردنی مۆدێرنی مرۆڤەوە وەک مرۆڤ. هەبوونی عەقڵ لەو خاڵە سەرەتاییەدا کە هەموو مرۆڤەکان تیایدا یەکسانن. لەم ڕوانینەدا دەکرێت مرۆڤ، هەموو مرۆڤێک، سەرجەمی دیاردەکان و شتەکان لە ڕێگەی عەقڵەوە بناسێت. هەم سروشت، هەم کۆمەڵگە، هەم مرۆڤ خۆی و چالاکییەکانیشی، دەکرێت لە ڕێگەی عەقڵەوە بناسرێن و عەقڵ ببێت بە پێوەر و ڕاڤەکەر و پێناسەکەریان. ئەم ڕوانینەش گەلێک دەرەنجامی جیاوازی لێ دەکەوێتەوە، یەکێکیان ئەوەیە کە دین و کتێبە دینییە پیرۆزەکان چیتر پێوەری هەقیقەت نین، پیاوانی دینییش چیتر ئەو کەسانە نین کە هەقیقەت لە ناهەقیقەت جیا دەکەنەوە، هەروەها جیاوازیی دینیش ناتوانێت نایەکسانبوونی مرۆڤەکان پاسادان بکات و بیسەلمێنێت، ناشبێت جیاوازییە دینییەکان ببنە بنەما بۆ بەهادارکردنی هەندێک مرۆڤ بەسەر هەندێک مرۆڤی دیکەدا. جگە لەمانە باڵادەستبوونی عەقڵ وەک پێوەری بەرهەمهێنان و ناسینەوەی هەقیقەت، مانای ئەوەشە کە لەپاڵ دین و دەسەڵاتی دینیدا، دەسەڵاتی سیاسییش ناتوانێت پێوەری هەقیقەت بێت. واتە ئەوانەی پێمان دەڵێن چی هەقیقەتە و چی هەقیقەت نییە، هەڵگرانی دەسەڵاتی سیاسی نین و دەسەڵاتی سیاسی ماف و توانای ئەوە بە دەسەڵاتداران نابەخشێت، هەقیقەتەکان دەستنیشان بکەن، لە یەکتریان جیا بکەنەوە. ئەوەی دەتوانێت ئەم کارانە بکات، تەنها داوەریکردنەکانی

عەقڵ خۆیەتی، کە لای هەموو مرۆڤەکان ئامادەیە. بەکورتی، لەپشتی چەمکی عەقڵەوە تەنها دونیایەکی مەعریفیی نوێ ئامادە نییە، بەڵکو وێنەیەکی نوێ و یەکسان بۆ مرۆڤیش ئامادەیە، کە تیایدا هەموو مرۆڤێک وەک خاوەنعەقڵ وێنا دەکرێت.

ئاکاری دووهەمی مۆدێرنە ئەوەیە، کە مرۆڤ وەک تاکەکەسێکی خاوەنماف دەبینێت کە لەژێر هیچ بەهانەیەکدا نابێت ئەو مافانەی لێ بسێنرێتەوە. مافی تاکەکەس لە دونیای مۆدێرندا مافێکی بنەڕەتیی تایبەت و گرنگە، پابەستە بە بوونی مرۆڤەوە وەک مرۆڤ، وەک تاکەکەسێکی تایبەت و دەگمەن، کە کەس بۆی نییە ئەو تایبەتبوون و دەگمەنبوونەی لێ بسێنێتەوە. هەر لە بنەڕەتیشەوە مافێکە لە بەرامبەر مافی یەکە کۆیی و دەستەجەمعییەکانی وەک خێزان و کۆمەڵگە و نەتەوە و یەکە دەستەجەمعییەکانی دیکەدا دانراوە. ئەوەی ئەم بەرامبەرکارییە پێشنیاری دەکات، ئەوەیە کە نابێت مافی تاکەکەسی بکرێت بە قوربانیی مافە کۆیی و دەستەجەمعییەکان، نابێت تاکەکەس خۆشی بکرێت بە قوربانیی هیچ یەکەیەکی کۆیی و دەستەجەمعی. بریندارکردنی مافەکانی تاکەکەس و گوێنەگرتنی، مانای ئیهانەکردنی مرۆڤ و ڕێزدانەنانە بۆ کەرامەتی مرۆڤ وەک مرۆڤ. لێرەوە مەسەلەی پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ وەک مرۆڤ، دەبێت بە یەکێک لە بیرۆکە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی تری ناو دونیای مۆدێرن. لەنێوان چەمکی مرۆڤی خاوەنماف و مرۆڤی خاوەنکەرامەتدا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ و بەهێز هەیە.

ئاکاری سێهەمی مۆدێرنە، بیرۆکەی دیموکراسییە. ئەگەر تاکەکەس بوونەوەرێکی خاوەنعەقڵ و خاوەنماف و کەرامەت بێت و بوونەوەرێک بێت لەگەڵ ئەوانی تردا یەکسان بێت، ئەوا یەکێک لە مافە هەرە بنەڕەتییەکانی ئەوەیە، کە بتوانێت بە شێوەیەکی یەکسان لەناو "مەجالی سیاسی"دا ئامادە بێت و بەشدار بێت لە چالاکی و گفتوگۆ و کێشمەکێشەکانی ناو ئەو مەجالەدا. بەشداربوونی یەکسانی مرۆڤەکان لە کایەی سیاسیدا و لەویشەوە لەو بڕیارانەدا کە پابەندن بە "ژیانی گشتی"ی کۆمەڵگەوە، دیاردەیەکی تەواو نوێیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا و بەقووڵی بە لەدایکبوونی دونیای مۆدێرنەوە گرێ دراوە. لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا لە هەموو دونیادا تەنها لە ئینگلتەرادا هەڵبژاردن بوونی هەبووە، بەڵام تەنانەت لە ئینگلەتەراشدا دەنگدان بۆ هەمووان نەبووە، بەڵکو تەنها کۆمەڵێک گروپی تایبەتی ناو کۆمەڵگەی ئینگلیزی مافی دەنگدانیان هەبووە، کە بریتی بوون لە خاوەنموڵک و ئەرستۆکراتی و پیاوە دینییە گەورەکان. مێژووی بەدەستهێنانی مافی دەنگدانی یەکسان بۆ هەمووان، مێژوویەکی ئاڵۆز و درێژە و هەر جارە هێزێکی کۆمەڵایەتی، دوای خەبات و کۆششێکی زۆر، ئەو مافەی بەدەست هێناوە. بەشداربوون لە ژیانی گشتیدا کردەیەکی مێژوویی پڕ هەڵبەز و دابەز و ململانێی بەردەوام بووە. ژنانی کۆمەڵگە ئەوروپییەکان، کە ئەوروپا بە بێشکەی دیموکراسیەت دادەنرێت، تەنها لە سەدەی بیستەمدا مافی دەنگدان بەدەست دەهێنن و لە هەندێک شوێنی وەک سویسرادا بەدەستهێنانی ئەم مافە بۆ ژنان، بۆ حەفتاکانی سەدەی بیستەم دوا دەکەوێت. پرسیاری

ئـەوەی کـێ بەشـدار بێت لـە چالاکییـە جۆربەجۆرەکانـی نـاو کایـەی سیاسـیدا و دەوڵـەت خۆشـی چـۆن بەڕێـوە ببرێـت بـۆ ئـەوەی زۆرتریـن بەشـداریی سیاسـی دەسـتەبەر بـکات، تەنهـا لـە سـەدەی نۆزدەهەمـدا دەبێت بـە یەکێک لـە پرسـیارە سـەرەکییەکان. کاتێک لـە کۆتاییەکانـی سـەدەی حەڤدەهـەم و سـەرەتای سـەدەی هەژدەهەمدا تاکەکـەس بۆ یەکـەم جار وەک بوونەوەرێکـی خاوەنمـاف وێنـا دەکرێت، ئـەودەم پێناسـەکردنی مـاف دەبێت بـەوەی ئایا ئـەم تاکەکەسـە چـۆن گوزارشـت لـە خواسـت و حـەز و بۆچوونەکانـی بـکات؟ لـەدوای کردنـی ئـەم پرسـیارەوە، ئیتـر ئازادییـە دینییـەکان، ئازادیـی ڕادەربڕیـن، ئازادیـی ئـەوەی مـرۆڤ ئەشـکەنجە نەدرێـت، هەبوونـی مافـی دەنگـدان، یـەک بـەدوای یەکـدا دێنـە کایـەوە. کۆمەڵگـە مۆدێرنـەکان لـە پرۆسـەیەکی هێجـگار ئاڵـۆزی پـڕ ململانـێ و توندوتیـژی و کۆنترۆڵکـردن و ئاراسـتەکردندا، لـەوەدا سـەر دەکـەون، ئـەو سـێ ڕەهەنـدە گرنگـەی مۆدێرنـە بـە شـێواز و دەرکەوتـی جیـاواز دەسـتەبەر بکـەن و بیکـەن بـە دەرکەوتـە سـەرەکییەکانی ژیـان لەنـاو کۆمەڵگـە مۆدێرنەکانـدا.

بـەلام بـۆ کەسـێک ئـاگاداری مێـژووی سـێ سـەدەی ڕابـردوو بێت، ئـەو ڕاستییە سـادەیە دەزانێت کە لەدایکبوونـی دونیـای نـوێ و لەدایکبوونـی ئـەو چەمکانـە لەنـاو ژیانـی گشـتیدا و لەوێشـەوە لەدایکبوونـی ئـەو وێنـە نوێیانـە بـۆ مـرۆڤ، لەدایکبوونێکـی سـادە نەبـوو، کردەیەکـی ئاسـان و ئاسـۆییش نەبـوو، بەڵکـو دەرەنجامـی چەنـدان پرۆسـەی سیاسـی و یاسـایی و کۆمەڵایەتـی و ئابووری و مەعریفیی ئاڵۆز بوو، کە بەسـەریەکەوە ئـەو وێنـە نوێیانەیـان بـۆ مـرۆڤ و بـۆ کۆمەڵگـە

و بۆ دەوڵەت و حوکمڕانی هێنایە کایەوە. لەم پرۆسانەدا مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی یەکسانی خاوەنئیرادەی سەربەخۆ و خاوەنماف و خاوەنکەرامەت، دەوڵەت وەک دەوڵەتی نەتەوەیی و دەوڵەتی هاوولاتی و دەوڵەتی یاسا، کۆمەڵگەش وەک کۆمەڵگەیەکی پلورال و فرەجۆری پڕ لە جیاوازی، کە زیاد لە مەرجەعێکی ڕەمزی و ئەخلاقی و کۆمەلایەتی و دینیی هەیە، لەدایک دەبن. دروستبوونی ئەم دونیا ئاڵۆزەش، کردەیەکی هێمن و لەسەرخۆ نەبوو، بەڵکو بەناو زنجیرەیەکی گەورە لە جەنگ و شەڕ و پێکدادانی زۆر و خوێناوی و بەناو چەندەها شۆڕش و یاخیبوون و کردەی توندوتیژیدا و بەناو شێوازی نوێی چەوساندنەوە و دیسپلین و کۆنترلکردندا تێپەڕی. ئەو کۆمەڵگەیانەشی لانی هەرە کەمی ئەم سێ چەمکەیان لەناو واقیعی سیاسی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگیی خۆیاندا جێگیر کردووە و پاراستووە، ئەو کۆمەڵگەیانەن کە پڕ بوون لە خەباتی کۆمەلایەتی و لە ڕیفۆرمی عەقڵی و سیاسی و یاسایی و لە گەشەدان بە کولتووری لێبووردن و قبووڵکردنی جیاوازی. ئەم کۆمەڵگەیانە لەوەدا سەر کەوتن، کە ئەو سێ چەمکە هەم بکەن بە بەشێک لە سیستمی ئەخلاقیی بالادەست، یان لانی کەم ڕەهەندێکی ئەخلاقیی بەهێزیان پێ ببەخشن، بە جۆرێک، دەستبۆبردن و بریندارکردنیان وەک بەدئەخلاقی دەر بکەوێت. هەم لەوەشدا سەر کەوتوون، کە چوارچێوەیەکی یاسایی و دەزگاییان بۆ بدۆزنەوە بۆ پاراستن و پتەوکردنیان. ڕێزگرتنی ئەم سێ چەمکە سەرەکییە و گواستنەوەیان بۆ ناو ژیانی گشتی،

لەبەر ئەوە نەبووە ئەو کۆمەڵگەیانە پێشوەخت باوەڕیان بە یەکسانی و پیرۆزیی ئەو چەمکانە هەبوویێت، یان بە جەوهەر مرۆڤدۆست بووبن، یان دینەکەیان و ئەخلاقیان لە دین و ئەخلاقی میللەتانی تر باشتر بوویێت، بە پێچەوانەوە، داهێنان و بەرگریکردن لەو چەمکانە بە مەبەستی ئەوە بووە سنوورێک بۆ جەنگ و پێکدادان و خوێنڕشتە ناوەکییە گەورەکانیان دابنێن، جۆرێک لە ئاشتی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی دروست بکەن، کە نەک تەنها درێژخایەن و پتەو بێت، بەڵکو شوێنی متمانە و باوەڕپێکردنی مرۆڤ و گرووپ و هێزە سیاسی و دینی و کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان بێت. یەکێک لە مەبەستە سەرەکییەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە، بەرگری لەو تێزە بکات، کە ناکرێت ئاسایش و ئاشتیی مەدەنییانە بوونیان هەبێت بەبێ گەڕانەوەیەکی بەردەوام بۆ هەرسێ چەمکەکە، گەڕانەوە بۆ ئەم چەمکانە لەبەر مرۆڤدۆستی و ئاشتیپەرستی نییە، بەڵکو بۆ ڕێگرتنە لە کوشتن و بڕین و وێرانکردنی زیاتر و هەمەلایەنتر. ئینتیمای ئەتنی و دینیی جیاواز، بیرکردنەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەلسەفیی جیاواز، هەبوون یان نەبوونی دین، دەوڵەمەندبوون یان هەژاربوون، نابێت هۆکارێک بن بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بە شێوازی نایەکسان مامەڵە بکرێن و کەرامەتیان بریندار بکرێت و ڕێز لە جیاوازبوونیان نەگیرێت. کۆکردنەوەی یەکسانی و کەرامەت و پلورالیزم بەیەکەوە، ئەو ستراتیژییە سیاسی و ئەخلاقی و کولتووری و مەدەنییەیە، کە دەشێت هاریکارمان بێت بۆ دەرچوون لەو دۆخە ناهەموارەی ئەمڕۆکە.

## ٢

سـەدەی حەڤدەهـەم و هەژدەهـەم، سـەدەی هاتنەکایـەی سـەرەتاکانی دەوڵەتـی مۆدێرنـە، ئـەو دوو سـەدەیەش، دوو سـەدەی پـڕ جەنـگ و خوێـن و توندوتیژییـن. چەنـدان تێـزی فیکریـی گرنـگ هـەن، کـە دروسـتبوونی دەوڵەتـی مۆدێـرن بـە بەرپابوونی شەڕ و شۆڕ و جەنگە گەورەکانی ئەو سەردەمەوە گرێ ئـەدەن. دەوڵەتـی مۆدێـرن هـەر لـە سـەرەتاوە، وەک لـە بەریتانیـادا دروسـت دەبێـت، لـە یـەک کاتـدا هـەم دەوڵەتێکـی نەتەوەیـی و هـەم دەوڵەتێکـی ئیمپریالییـە. ئیمپریالیبـوون ئاکارێکـی گرنگـی دەوڵەتـی مۆدێرنـە، ئینگلتـەرا لـە سـەدەی حەڤدەهـەم و هەژدەهەمدا بەشێکی گرنگی دونیا داگیر دەکات، لەناویاندا ئەمەریکا و کاریبیا و خوارووی ئاسیا. ئـەم دەوڵەتـە ئیمپریالییـە دەوڵەتێکـی میلیتـاری و سـەربازیی بەهێـزە، کـە خۆشـی لـە گەرمـەی دەیـان شـەڕ و جەنگـی گـەورەدا زیاتـر دروسـت دەبێت و گەشـە دەکات، هەمیشـە لەبـەردەم ئەگـەری لەناوچـوون و وێرانبـوون و نەمانـدا بـووە و شـتێک بـە نـاوی حەتمیەتی دروستبوون و گەورەبوون و گەشەکردنیەوە لەئارادا نەبـووە. تەنهـا لـە سـەرەتاکانی سـەدەی نۆزدەهەمیشـدا ئـەو هەسـتە دروسـت دەبێت، کـە ئـەم دەوڵەتـە مۆدێرنـە دەوڵەتێکـی جێگیـرە و ئـەو بـاوەڕە لای پیاوانـی دەوڵـەت دروسـت دەکات،

کـە لەنـاو ناچێت.[1] هەسـتکردن بـە ناجێگیـری و بـە ئەگـەری لەناوچوونـی دەوڵەتی مۆدێرن، تەنها هەسـتێکی سـایکۆلۆژی نەبـووە، بەڵکو پشتئەسـتوور بـووە بـە واقیعێکـی سیاسـیی پڕ شـەڕ و ململانێ و پێکدادانـی خوێنـاوی. لە سـەدەی هەڤدەهەمدا، لەنێـوان سـاڵانی ١٦٤٢ - ١٦٤٦، کـە سـەرەتاکانی لەدایکبوونـی دەوڵەتـی مۆدێرنـە لـە بەریتانیـادا، یەکـەم جەنگـی ناوخۆیـی لـە ئینگلتـەرا ڕوو دەدات، کـە ڕێـژەی ٢٤٪ پیاوانـی ئـەو وڵاتـەی تێدا دەکوژرێـت، ئەمـەش وەک ڕێـژە، ڕێژەیەکـی گەورەتـرە لـە ڕێژەی ئـەو پیاوانـەی لـە جەنگـی جیهانیـی یەکەمـدا دەکوژرێن. لـە هێـرش و پەلامارەکانـی ئینگلتـەرادا بـۆ سـەر ئیرلەنـدا لـە ناوەڕاسـتی سـەدەکەدا لەنێـوان ١٦٤٩-١٦٥٣، ڕێـژەی لەنێـوان ٢٥ تـا ٥٠٪ دانیشـتووانی ئیرلەنـدا دەمـرن. ئەمـە جگـە لـە جەنگەکانـی تری سـەدەکە و سـەدەی دوای ئـەوە لـە ئیسـپانیا و بەریتانیـا و ئەڵمانیـا و شـوێنەکانی دیکـەدا.[2] هـۆکاری سـەرەکیی ئـەو شـەڕانەش، پەیوەندییـان بـە مەسـەلەی "سـەروەریی دەوڵـەت"ەوە هەبـووە. پرسـیارەکە ئـەوە بـووە، کـێ دەسـەڵاتی سـەرەکیی هەبێـت، پەرلەمـان یـان پادشـا؟ ئایـا دەوڵـەت بـۆی هەبێـت بـە کۆمەڵگـە بڵێـت چ دینێکـی هەبێـت یـان نەیبێـت؟ کـێ لـە ڕووی یاسـاییەوە مافـی ئـەوەی هەیـە بـاج کـۆ بکاتـەوە؟ بەکورتـی، ئـەم شـەڕە گـەورە و وێرانکارانـە لەپـاڵ کۆمەڵێـک

---

١_بڕوانە: https://www.youtube.com/watch?v=oitDMiOJ9JU&list=PL-XXv-cvA_iDVbdSEzKJ5aNg12CVObHtX&index=1

٢_بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دید و ڕوانین و پرسدا ئەنجام دراون، کە پەیوەستن بە چۆنێتیی ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەوە و خۆشیان بەشێک بوون لە پرۆسەی دروستکردنی دەوڵەتی مۆدێرن خۆی. یەکێک لە دەرەنجامە پۆزەتیڤەکانی ئەم جەنگانە ئەوەیە، مەسەلەی "لێبووردنی دینی" کە دواتر دەبێت بە بەشێکی گرنگی بەرگریکردن لە پلورالیزم، وەک کاردانەوەیەک بە ڕووی سەدە و نیوێک جەنگی دینیدا دێتە کایەوە و دەچەسپێت. ڕێزگرتنی پلورالیزمی دینی، شتێک نەبووە بەئاسانی لەناو کتێبەکانەوە بۆ ناو واقیع دابەزیبێت، بەڵکو مێژوویەکی درێژی ململانێ و جەنگ و پێکدادان ئاراستەی کردووە. تەنانەت دوای چەسپاندنی پلورالیزمیش وەک سەرتاگەیەکی تیۆری و فەرهەنگی، لە شوێنێکی وەک ئینگلتەرا خۆشیدا، چەندان گروپی کاتۆلیکی هەبوون، بۆیان نەبووە هەندێک پۆستی گرنگ لە دەوڵەتدا وەر بگرن و بۆیان نەبووە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد بخوێنن و بۆیان نەبووە بچنە ناو لەشکرەوە و بۆیان نەبووە تفەنگیان هەبێت و بۆیان نەبووە موڵک وماڵیان بەویراسی بۆ بمێنێتەوە. هەموو ئەم جۆرە جیاکاری و هەرەمیەتە نایەکسانە لە مافەکاندا تا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم لە ئینگلتەرادا بەردەوام بووە.[1]

هاوکات لەدایکبوونی دونیای نوێ هاوشان بووە بە سەردەمی دروستبوونی برسێتی و نەخۆشی و پەتا گەورە و کوشندەکانی ناو مێژووەوە، هاوشان بووە بە هاتنەکایەی

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ڕۆژی کاری درێژ، هەندێک جار ١٦ کاتژمێر لە ڕۆژێکدا و شەش ڕۆژ کارکردنیش لە هەفتەیەکدا، تەنانەت بۆ منداڵان و ژنان و پیرانیش. کۆمەڵناسی فەڕەنسیی بەناوبانگ، پیار بۆردیۆ، لە کتێبێکیدا باس لەوە دەکات، چۆن لە سەدەی نۆزدەهەمدا تەنانەت زانا کۆمەڵایەتییەکان و کۆمەڵناسە ئەکادیمییەکان بەرگرییان لە کارکردن بە منداڵان کردووە و وەک دیاردەیەکی ئاسایی ناساندوویانە. بۆردیۆ نموونەی پیاوێکی خاوەنکارگە دەهێنێتەوە، کە سوپاسی زاناکانی ئەو سەردەمە ئەکات، چونکە سەلماندوویانە ئیشکردن بە منداڵ نیشانەی دڵفراوانی و سەخاوەتی خاوەنکارگەکانە.[1] ئەم دۆخی ئیشکردنە درێژ و زەحمەتە، کە چارلز دیکنز وێنەکانیمان لە هەندێک لە ڕۆمانەکانیدا بۆ دەنەخشێنێت، تا ڕادەی پڕوکاندن ڕۆیشتووە. بۆیە سەدەی نۆزدەهەم دەبێت بە سەدەی کۆچ و سەرهەڵگرتن و هەڵاتنی ملیۆنەها مرۆڤ لە وڵاتی خۆیان بۆ گەڕان بەدوای شوێنی تردا، کە بتوانێت کاری ئاسانتر و ژیانێکی باشتر و هێمنتریان بۆ دەستەبەر بکات. بە مانایەکی دیکە، لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن تەنها هاوشان نەبووە بە هاتنەکایەی چەندان جەنگ و پێکدادانی گەورەی ناوەکی و دەرەکیی ئیمپریالیدا، بەڵکو هاوشان بووە بە دروستبوونی دونیایەک پڕ لە نەخۆشی و برسێتی و کارکردنی قورس و زەحمەت و درێژ.

---

١_بڕوانە: بییر بوردیو (٢٠١٢). مسائل فی العلم الاجتماع. ترجمە د. هناء صبحی. هیئە ابوظبی للسیاحة و الثقافة. ل١٠.

وەک وتم سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم، کە سەدەی دروستبوونی دونیای مۆدێرنە، هاوکات سەردەمی دروستبوونی دونیای کۆلۆنیالیزم و داگیرکردن و چەوساندنەوەی میللەتە بەهێزەکانی دونیایە بۆ میللەتە لاوازەکان. ئیمپریالیزم درێژکراوەیەکی تایبەتیی ناسیۆنالیزمە، کە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دەبێت بە یەکێک لە ئایدیۆلۆژیا هەرە سەرەکی و بەهێزەکانی دونیای مۆدێرن. زۆرینەی جەنگەکانی سەدەی نۆزدەهەم، جەنگێکن ناسیۆنالیزم یان ئاراستەکەر و دروستکەرە سەرەکییەکانیانە، یان بەشێکە لە پاڵنەرە سەرەکییەکانی جەنگەکان، لەدایکبوونی نەتەوە خۆشی وەک یەکەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی نوێ، دابڕاو نییە لە جەنگە ناسیۆنالیستییەکانی دونیای مۆدێرن. سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم و نۆزدەهەم، هاوکات سەدەی بازرگانیکردنێکی بەرفراوانیشن بە کۆیلەوە، لەمسەری دنیاوە بۆ ئەوسەری دونیا. لە سەدەی شانزەهەمەوە بۆ سەدەی نۆزدەهەم، بازرگانی بە زیاد لە ١٦ ملیۆن مرۆڤەوە وەک کۆیلە کراوە. ئەم کۆیلانە بە کەشتی لە ئەفریقیاوە براون بۆ ئەمەریکا و بۆ بەشێک لە ئەوروپا، کۆیلەفرۆشەکانیش لە هەموو شوێنێکی دونیادا ئامادە بوون، هەندێکیان موسڵمانی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوون، هەندێکیان بازرگانی مەسیحیی ئەوروپی بوون، ئەوانی تر خاوەندینەکانی تری ناو ئەفریقیا و دەرەوەی ئەفریقیا بوون. مێژووی کۆیلایەتی بەشێکی گرنگ و دانەبڕاوی مێژووی دروستبوونی دونیای مۆدێرنە.

# ٣

لە ئاستێکی دیکەدا، دونیای مۆدێرن لەپاڵ لەدایکبوونی عەقڵدا وەک پێوەر و لەپاڵ دروستبوونی تاکەکەسی خاوەنمافدا، وەک بوونەوەرێکی نوێ و لەپاڵ هاتنەکایەی پلورالیزمدا وەک بەشێک لە هاتنەکایەی کۆمەڵگەیەکی نوێ، هاوکات دونیای بەرهەمهێنانی سەدەها وێنەی هەڵە و ناڕاست و ڕاسیستییانەی مرۆڤ و کۆمەڵگە جیاوازەکانە لەسەر یەکتری. ڕاسیزم وەک "زانست،" داروینیزمی کۆمەڵایەتی وەک ئایدیۆلۆژیا، هێزپەرستی وەک بەشێک لە دیاردەی دروستکردنی دەوڵەتی مۆدێرن، هەموویان بەشێکن لە مێژووی دونیای نوێ و هەموویان لە سەدەی نۆزدەهەمدا وەک هێزی نوێ لەدایک دەبن و گەشە دەکەن. ڕاسیزم یەکێکە لە "زانست"ەکانی سەدەی نۆزدەهەم، کە تیایدا مرۆڤایەتی بەسەر کۆمەڵێک ڕەگەزی جیاوازدا دابەش دەکرێت و لەم دابەشکردنەشدا ئەم ڕەگەزیان لەوی تریان بە پێشکەوتووتر و بەرزتر و باشتر دادەنرێت. ئاکارە ڕەگەزییەکانیش وا وێنا دەکرێن، وەک ئەوەی نەگۆڕ بن و لە دایک و باوکەوە بۆ منداڵەکانیان و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر بگواسترێتەوە. ڕاسیزم ئایدیۆلۆژیای نیشاندانی نایەکسانیی نێوان مرۆڤەکان و کۆمەڵگەکان و شارستانیەتەکانە.[١] ڕاسیزم

---

١_ بڕوانە: Stuurman, Siep (2010). De uitvinding van de mensheid. Amsterdam, Uitgeverij Bert Bakker. p 294-295.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەبێت بە بزووتنەوەیەکی فەرهەنگی و مەعریفیی بەهێز، تیایدا ئەوروپییەکان خۆیان وەک سەرداری شارستانیەت و سەروەری مرۆڤایەتی وێنا دەکەن، خۆیان وەک جۆرێک لە مرۆڤ دەبینن، کە لە سەروو هەموو مرۆڤەکانی ترەوەن و کولتوور و فەرهەنگیشیان وەک تاکە فەرهەنگی باڵا و بەنرخی جیهان. ئەمەش زۆر سەیر و نامۆ نییە، ئەوروپا لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەشێکی گەورەی دونیای داگیر کردبوو، لە شوێنە داگیرکراوەکانیشدا هەستکردن بەوەی کە ئەوان وەک داگیرکەر بوونەوەرێکی بەرزتر و پێشکەوتووتر و شارستانیترن، بەشێکی سەرەکیی تەکنۆلۆژیای حوکمڕانیی کۆلۆنیاڵییانە بوو. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا، زۆر زەحمەتە ڕوانینێک بۆ مێژووی مرۆڤایەتی بدۆزیتەوە، کە مەسەلەی ڕاسیزم و دابەشکردنی نایەکسانیی مرۆڤەکان و کۆمەڵگەکان بەشێک لەو ڕوانینە نەبێت. ئەگەر لە قۆناغەکانی پێشتردا شێوازێک لە شێوازەکانی ڕاسیزم بوونیشی هەبووبێت، ئەوا ئەو ڕاسیزمە مایەی ئەوە نەبووە مرۆڤ باوەڕی بە بوونی یەک مرۆڤایەتی نەبووبێت، بەڵام ڕاسیزمی سەدەی نۆزدەهەم پەلاماری ئەو باوەڕە ئەدات و بەرگری لەوە دەکات، کە زیاد لە مرۆڤایەتییەک هەیە و هەر ڕەگەزێکیش هەڵگری جۆرێکی تایبەتە لە مرۆڤایەتی.[1] ڕاسیزم لە سەدەی نۆزدەهەمدا مرۆڤایەتی لە ناوەوەڕا دابەش و پارچەپارچە دەکات.

سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم، هاوکات سەدەی

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣١٩.

لەدایکبوونی "خۆرهەڵاتناسی" یان ئۆریانتالیزمیشە. خۆرهەڵاتناسی وەک ئیدوارد سەعید دەڵێت: زانستی خۆخەریکردنێکی بێلایەنانەی خۆرئاوا نییە بە کۆمەڵگەکانی دەرەوەی خۆیەوە، هەروەها کردەی بەرهەمهێنانی زانیارییەکی بابەتیی بێمەبەست نییە لەلایەن کۆمەڵێک زاناوە، کە ئامانجیان بەرهەمهێنانی مەعریفەی زانستییە لە ژیانیاندا، بەڵکو خۆرهەڵاتناسی گوتاری دروستکردن و نمایشکردنی خۆرهەڵاتە وەک جوگرافیایەکی خەیاڵیی گەورەی بێمێژوو و بێگۆڕان و چەقبەستوو. وێناکردنی خۆرهەڵات وەک سەرزەمینێک پڕ لە بەربەریەت و تەمبەڵی و ناعەقڵانیەت و ستەمگەری و دواکەوتن و بەجێمان، خۆرهەڵاتێکی ژنانە و هەستباز و سێکسباز، خۆرهەڵاتێکی بێمێژوو، کە ئەرکی خۆرئاوایە دەستی بگرێت و فێری بکات و هاریکاری بێت بۆ ڕاکێشانەوەی بۆ ناو مێژوو بە مەبەستی پێشکەوتنی. لە خۆرهەڵاتناسیدا کۆمەڵێک نووسەر و دەزگا و ڕشتە لە زانکۆکاندا گوتارێک بەرهەم دەهێنن بە مەبەستی سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی جیهان، بە شێوەیەک نیشانی بدەن، خۆرئاوای سەردەمی ئیمپریالیزم بەشە پێشکەوتوو و عەقڵانی و دیموکراسەکەی دونیایە و دەرەوەی خۆرئاواش، بەتایبەتی خۆرهەڵات، سەرزەمینی ناعەقڵانیەت و دواکەوتن و ستەمگەریی هەمەجۆرە. خۆرهەڵاتناسی وەک ڕشتە وا دەکات لە سەدەی نۆزدەهەمدا شتێکی ئاسایی بێت، شارستانیەتی چەند هەزار ساڵەی میللەتەکانی تری دونیا وەک شارستانیەتێکی بێنرخ و ناعەقڵانی و نەگۆڕ و دواکەوتوو

ناو ببرێت. فەرهەنگی میللەتانی تر وەک نافەرهەنگ و وەک تۆمارێکی ڕۆحی بۆ توندوتیژی وێنا بکرێت. وەک ئێدوارد سەعید دەڵێت: خۆرئاوا لە خۆرهەڵاتناسیدا تەنها وێنەی خۆرهەڵات ناکێشێت وەک سەرزەمینێکی دواکەوتوو و خورافی، بەڵکو بە پلەی یەکەم وێنەی خۆی دەکێشێت وەک سەرزەمینی عەقڵانیەت و پێشکەوتن و دیموکراسیەت، وەک لانکەی شارستانیەت و زانست و زانین، وەک بەشە نێرینە و زاناکەی دونیا، کە مرۆڤی پێشکەوتوو و عەقڵانی و لێبووردەی بەرهەم هێناوە. ئەم وێنەیە بۆ ئەورووپا، کە لە ژینگەی گەشەکردنی ئیمپریالیزم لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا دروست دەبێت، پێویستی بەوەیە وێنەی دەرەوەی ئەورووپا وەک سەرزەمینی دواکەوتن و نەزانین و بەجێمان و خورافەت بکێشێت و مرۆڤەکانیشی وەک مرۆڤی بێمێشک و نەزان و دواکەوتوو و ناعەقڵانی و گەمژە و توندوتیژ. لێرەشەوە ڕەوایەتی بەو تێزە سەرەکییەی ئیمپریالیزم ببەخشێت، کە پێی وایە مەبەستی کۆلۆنیالیزم و داگیرکردنی دونیا، پێشخستنی وڵاتە داگیرکراوەکان و بڵاوکردنەوەی شارستانیەتە بەناو خەڵکەکەیدا، نەک تاڵانکردنیان. لەم خوێندنەوەیەدا ئیمپریالیزم پەیامێکی شارستانییانەی پێیە و بە دونیادا بڵاوی دەکاتەوە. ڕستە هەرە بەناوبانگەکەی مارکس، کە ئێدوارد سەعید لە کتێبەکەیدا هێمای پێ دەکات، نموونەی ئەو شێوازەیە لە بیرکردنەوە، کە لەسەر وێنەیەکی تەواو هەڵە و ناڕاست و نامێژوویی ئەو کۆمەڵگانە دروست بووە. هیندستان، کە لە

ساتەوەختی داگیرکردنیدا لەلایەن بەریتانیاوە مێژووی پێنج هەزار ساڵی شارستانیەتی هەبووە، مارکس وای دەبینی کە خەڵکەکەی توانای نوێنەرایەتیکردنی خۆیان نییە، بۆیە دەبێت نوێنەرایەتی بکرێن، ئەوەشی نوێنەرایەتییان دەکات، بەریتانیای سەدەی نۆزدەهەمە.[1] مارکس تاکە فەیلەسووفی سەدەی نۆزدەهەم نییە کە هەڵگری ئەم دیدەیە بۆ دەرەوەی ئەورووپا، جیمس میل و جۆن ستیوارت میلیش هەمان دیدیان هەبوو. میل باوەڕی وا بوو کە مرۆڤ لە هیندستان لە قۆناغی منداڵیی شارستانیەتدا دەژی، بۆیە پێویستە وەک منداڵ پەروەردە و گەورە بکرێن و ئەرکی بەریتانیایە وەک میللەتێکی پێشکەوتوو ئەم ئەرکە پەروەردەییە جێبەجێ بکات.[2] بەکورتی، خۆرهەڵاتناسی لە سەدەی نۆزدەهەمدا دوو وێنە بۆ مرۆڤ پێشنیار دەکات، کە تەواو بە یەکتری ناکۆکن، یەکێکیان مرۆڤێکی زانا و شارستانی و پێشکەوتووە، کە لە خۆرئاوادا دەژی، ئەوی تریان مرۆڤێکی نەزان و گەمژە و توندوتیژە، کە لە خۆرهەڵاتدا دەژی. بەمەش تەواو باز بەسەر ئەو وێنە مۆدێرنەی مرۆڤدا دەدرێت، کە هەمووان وەک بوونەوەری یەکسان نمایش دەکات.

بە قسەی هەندێک فەیلەسووفی دژەمۆدێرن، دونیای مۆدێرن دونیای لەدایکبوونی کۆمەڵگە و مرۆڤی چاودێریکراو و دیسپلینکراوە، وەک لای میشێل فۆکۆ، یان دونیای

١_بڕوانە: Said, Edward (1979). Orientialism. New York: Vintage Books.

٢_بڕوانە: Stuurman, Siep (2010) لاپەڕە ٣١٩.

دروستبوونی مرۆڤی هۆمۆساکەر و کەمپە گەورەکانی کوشتنە، وەک لای ئاگامبن. بەڵام بە بۆچوونی من، هەم فۆکۆ و هەم ئاگامبن، بەتایبەتی ئاگامبن، موبالەغەیەکی هێجگار گەورە بە ڕووکارە نێگەتیڤەکانی مۆدێرنەوە دەکات، لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا کەمەکێک درێژتر لەسەر بۆچوونەکانی ئاگامبن دەوەستین. بەکورتی، لەپاڵ ئەم هەموو کارەسات و تراژیدیا گەورانە و لەپاڵ ئەو ڕوانین و تێزە ڕاسیستییانە کە باس کران، کە بێگومان بەشێکی گرنگ و سەرەکین لە دروستبوونی دونیای نوێدا، بە شێوەیەکی گشتی ئەوەی لەم دونیایەدا ڕوو دەدات دروستبوونی دونیایەکی ئازادتر و یەکسانتر و پلورالتر و مافدارترە لە دونیاکانی بەر لە خۆی، دونیایەکە چەندان پرۆسە و دەزگا و ئەگەری تایبەتی تێدایە، کە دەکرێت بە هۆیانەوە ڕووکارە پۆزەتیڤ و ئینسانییەکانی ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی، گەورەتر و فروانتر بکرێتەوە، بە شێوەیەکی لەسەرخۆش دۆخی گشتیی ژیانی کۆمەڵگەکان بەرەو ئاستێکی باشتر و پێشکەوتووتر پاڵ پێوە بنرێت. هەروەها کۆتاییش بە بڕێک لەو کێشە و گرفتانەش بهێنرێت، کە لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا کێشەی سەرەکیی کۆمەڵگەکانی دونیا بوون. ئەگەر مۆدێرنە مانایەکی ڕاستەقینە و گرنگی هەبێت، ئەوا لەو جەنگ و ڕەخنە ناوەکییانەدایە کە خۆی لەگەڵ خۆیدا بەرپای دەکات و خۆی لە خۆی دەگرێت. هیچ قۆناغ و سەردەمێک لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، بە ئەندازەی مۆدێرنە، بە نوقسانی و مەترسی و گرفتەکانی خۆی و بە ئەگەر و

توانا و مژدەکانیشی هۆشیار نییە، ئەم هۆشیارییەش وا دەکات و وای کردووە، مۆدێرنە داخرانی تەواوەتیی تێدا نەبێت. کێشەی هەبێت، کێشەی گەورە و قووڵیشی هەبێت، بەڵام هەمیشە ئەگەر و توانا و هێزیش بۆ دەرکپێکردن و بیرکردنەوە لە چارەسەرکردنی ئەو شتانەی پێ بێت. سەفەری مۆدێرنە بەناو سروشت و دونیای ماددیدا، بەناو تەکنیک و زانستدا، بەناو ناوەوە و دەرەوەی مرۆڤدا، بەناو جەستە و خوددا سەفەرێکی پڕ دۆزینەوە و ئاشکراکردن و داهێنانە، وەک چۆن سەفەری دروستکردنی کێشە و گرفت و تەحەدا و مەترسیی گەورە و نوێشە. ڕەخنەی مۆدێرنە لە خۆی، ئەو پەنجەرەیەیە کە هەمیشە هێما بۆ ئەگەری تر و ئاسۆی تر و دونیای تر دەکات، ئەگەر مۆدێرنە وەک ڕەخنەگرتن لە دونیای بەر لە خۆی هاتبێتە کایەوە، ئەوا ڕەخنەکردنی ئەو ڕەخنانە و ڕەخنەکردنی ڕەخنە بە شێوەیەکی گشتی، لە ئاکارە سەرەکییەکانی ئەم دونیایە. هیچ یەکەیەک لە دونیای مۆدێرندا نادۆزینەوە بەر ڕەخنە نەکەوتبێت و نەکەوێت، ڕەخنە لە کولتوورەوە بۆ سیاسەت و لە فیکر خۆیەوە بۆ تەکنیک، لە ئابوورییەوە بۆ ئایدیۆلۆژیا و لە کۆمەڵگەوە و بۆ زمان و لە خودەوە بۆ ئەوی تر. ئەگەر شتێک هەبێت ناوی ئومێد بێت لە دونیای ئەمڕۆدا، ئەم ڕۆحی ڕەخنەکردنی ڕەخنەیەیە کە وەک یەکێک لە میکانیزمە ناوەکییەکانی ناو مۆدێرنە کار دەکات، ئەو بیرکردنەوە بەردەوامەیە کە لە هیچ تێزێک لە تێزەکان و لە هیچ ڕوانینێک لە ڕوانینەکانی خۆیدا

ناوەستێت و وەک موقەدەس مامەڵەیان ناکات. ئەمە وای کردووە مۆدێرنە دوور بێت لە دارمانی یەکجارەکی و پەککەوتن و کوژاندنەوەی هەتاهەتاییەوە، هاوکات هێزێک بێت بەردەوام بتوانێت لە خۆی و لە بەرهەمەکانی داببڕێت و شتگەلێکی نوێ و بیرلێنەکراوە بهێنێتە کایەوە. دابڕان ئەو میکانیزمە سەرەکییەیە کە مۆدێرنە لە ناوەوە ئاراستە دەکات و وای لێ دەکات بەناو کارەسات و جەنگ و توندوتیژی و پەتا گەورە و ترسناکەکانی خۆیدا تێبپەڕێت و لە هیچ یەکێکیاندا نەوەستێت. ئەگەر ئومێدێک لەپێشمانەوە هەبێت، ئومێدە بەم جووڵە و توانا و هێزی دابڕانە، کە چەند سەدەیەکە بەشێکە لە مێژووی مرۆڤایەتی.

وەک وتم، ئەم کتێبە لەسەر سێ دەرکەوتی گرنگ و سەرەکیی دونیای مۆدێرن دەوەستێت و هەوڵی شیکردنەوەی ڕەگوڕیشە مێژوویی و فیکرییەکانیان ئەدات. ئەو سێ دەرکەوتەش بریتین لە مەسەلەی یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدیدا، مەسەلەی کەرامەتی مرۆڤ وەک شتێک کە دەبێت بپارێزرێت، ئینجا مەسەلەی بینین و پاراستنی پلورالیزم لە دونیادا. هەرسێ دەرکەوتەکە لە دەرکەوتە پۆزەتیڤەکانی دونیای مۆدێرنن، کە لەپاڵ تاریکییە زۆرەکانی ئەم دونیایەدا ئامادەن، هاوکات بەشێکی گرنگن لە هەوڵ و کۆششە بەردەوامەکانی مرۆڤی مۆدێرن بۆ باشترکردن و پێشخستنی زیاتری ژیانی تاکەکەسی و دەستەجەمعیی ناو ئەم کۆمەڵگەیانە.

## ٤

یەکسانبوونی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا دیاردەیەکی نوێی ناو مێژووی مرۆڤایەتییە، لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەدرێژی باس لە چۆنێتیی دروستبوون و هاتنەکایەی ئەم ڕوانینە بۆ مرۆڤ لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا دەکەین و ڕەگەکانی پێداگرتن لەسەر یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا بۆ سەدەی هەژدەهەم دەبەینەوە. سەدەی نۆزدەهەمیش لە زۆر سەرەوە سەدەی لەدایکبوونی ئەو ئایدیۆلۆژیایانەن کە پێ لەسەر یەکسانیی تەواوی مرۆڤەکان دادەگرن، شێوازە جیاوازەکانی ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم لەو سەدەیەدا خەونی یەکسانیی تەواوی نێوان مرۆڤەکان دەبینن. هەمووشیان لە ڕەخنەکردنی ئەو سەرەتا لیبراڵەوە دەست پێ دەکەن، کە پێی وایە مرۆڤەکان تەنها لە خاڵی سەرەتادا یەکسانن و دوای ئەوە بە هۆی جیاوازی لە توانا و سەلیقە و ئامادەگیی هەرکەسێکەوە بۆ کارکردن و کۆششکردنی کەمتر یان زیاتر، نایەکسانی لەنێوانیاندا دروست دەبێت. لە زۆربەی ئەم ئایدیۆلۆژیا سۆسیالیستی و لیبراڵانەدا، مرۆڤ بۆ یەکەمین جار، بەبێ گوێدان بە پاشخانە دینی و کۆمەڵایەتی و ئەتنی و زمانی و ناوچەییەکانی، وەک تاکەکەسێکی یەکسان وێنا دەکرێت. ئەمەش هەم گۆڕانێکی زۆر نوێی ناو مێژووی مرۆڤایەتییە، هەم گۆڕانێکی تەواو

ڕادیکاڵ و شۆڕشگێڕانەشە. شۆڕشی ئەمەریکیی ساڵی ١٧٧٦ و شۆڕشی فەرەنسیی ساڵی ١٧٨٩ دوو ڕووداوی هەرە سەرەکیی ناو ئەم وەرچەرخانە گەورەیەن و هەردووکیان وێناکردنی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی یەکسان بە مرۆڤەکانی تر دەکەنە یەکێک لە گۆڕانە سەرەکی و گرنگەکانی ناو دونیای مۆدێرن. ئەم دوو شۆڕشە وێنەیەک بۆ مرۆڤ پێشنیار دەکەن، کە تیایدا هەرکەسێک بەوی تر یەکسانە و هیچ کەسێک لەوی تر مرۆڤتر نییە.[1] گرنگیی ئەم وێنە نوێیە کاتێک زیاتر دەر دەکەوێت، کە بۆ نموونە، بە وێنەی مرۆڤ وەک کۆیلە بەراوردی بکەین، کۆیلە وەک کەسێک کە نەک تەنها بە کەسی تر یەکسان نییە، بەڵکو خۆی موڵک و خاوەنی خۆی نییە، بەڵکو موڵکی کەسێکی ترە و خاوەنێکی هەیە کە خۆی نییە. وەک دەشزانین کۆیلەیەتی بەشێکی دانەبڕاوە لە مێژووی مرۆڤایەتی تا سەدەی نۆزدەهەم. لەبەر ئەوەی لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەدرێژی لەسەر دیاردەی کۆیلەبوونی مرۆڤ و ڕوانینی بڕێک لە فەیلەسووفە کلاسیکییەکانی وەک ئەرستۆ لەسەر کۆیلەیەتی نیشان ئەدەین، هەوڵ ئەدەم لێرەدا لە وێنەیەکی نایەکسان و نالەباری تری مرۆڤ بدوێم، کە بەتایبەتی لە هیندستاندا ئامادە بووە، ئەویش وێنەی مرۆڤە وەک "پاریا Pariah" یان ئەوانەی پێیان دەگوترێت "دەستلێنەدراو" یان

---

[1] ـ ئەگەرچی شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی ١٧٩٤دا کۆیلایەتی بەڕەسمی هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام لە ١٨٠٢دا ناپلیۆن جارێکی دیکە کۆیلایەتی دەگەڕێنێتەوە، تا دواجار لە شۆڕشی ساڵی ١٨٤٨دا فەرەنسا جارێکی دیکە کۆیلایەتی هەڵدەوەشێنێتەوە.

"پیسەکان-untouchable" ئەو کەسانەی پلەی کۆمەڵایەتییان ئەوەندە نزمە و ئەوەندە بێنرخ و سووک سەیر دەکرێن، بە شایستەی ئەوە نازانرێن دەستی کەسیان بەر بکەوێت، خۆ ئەگەر بە ڕێکەوت دەستی کەسێک لە کاستەکانی سەرەوەی کۆمەڵگە بەر ئەمانە کەوت، ئەوا پێویستە ڕاستەوخۆ خۆی بشوات و خۆی پاک بکاتەوە. لە هیندستاندا دەستدان لە پشیلە و سەگ و ئاژەڵی تر ئاسایی بوو، بەڵام دەستدان لەم مرۆڤانەوە گڵاو بوو. ئەم بە گڵاوتەماشاکردنە هۆکاری ئەوەیە، کە دروستبوونی هەر پەیوەندییەک لەنێوان ئەمانە و کاست و توێژە باڵاکانی ناو کۆمەڵگەدا یاساغ بکرێت و دەستلێنەدراوەکان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە تەنها بکەون و بە زۆر مانا بکەونە دەرەوەی کۆمەڵگەوە. لە کۆمەڵگەی هیندیدا براهماکان بەرزترین کەسی ناو کۆمەڵگە بوون و پاریاش نزمترینیان. پێگەی پاریاکان لە کۆمەڵگەدا شتێک لە پێگەی کۆیلەکان باشتر بووە، یان وردتر بدوێین، پاریابوون جۆرێک لە کۆیەلایەتییەکی کەمێک ڕیفۆرمکراو بووە.[1] پاریا بەم مانایە، ئەو کەسانەن کە گڵاون و شایانی دەستلێدان نین، لە هیندستان خۆیدا کاستەکانی سەرەوە باوەڕیان وا بووە ئەمانە بە ڕادەیەک گڵاون، گەر بچنە ناو ڕووباری غانجەوە ئەویش وەک خۆیان گڵاو دەکەن.[2] کەسانی پاریا

---

١_بڕوانە: Sawyer, W. Stephen (). Global pariah. **Encyclopedia of Global Studies. Edt: Helmut K. Anheier & Mark Juergensmeyer. SAGE Publications. P. 1290-1294**

2_: Charsley, Simon (1966).`Untouchable': What is in a Name? The Journal of the Royal Anthropological Institute, Vol. 2, No. 1 (Mar., 1996). p.1.

ئەو کارە جەستەییە قورس و زەحمەت و بێزخانەیان ئەنجام داوە، کە چین و توێژەکانی تر نەیانکردووە، بۆ نموونە، بەخێوکردنی ئەسپ و ئاژەڵ و کشتوکاڵکردن. ئەم شێوازە لە ئیهانەکردنی مرۆڤ و لە شکاندنی کەرامەتی نەوە دوای نەوە لە هیندستاندا ئامادە بووە، تا لە دەستووری هیندستانی ساڵی ١٩٥٠دا بە بەندێکی دەستووری یاساغ دەکرێت.

لەدایکبوونی وێنەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی یەکسان بەوانی تر، مانای دابەزینێکی ئۆتۆماتیکیانەی وێنەکە نییە بۆ ناو واقیع. خاڵێک بمەوێت لێرەدا بەخێرایی ئاماژەی پێ بکەم، ئەو ڕاستییەیە کە تەنانەت لە دونیای ئەمڕۆشدا و دوای تێپەڕینی سێ سەدە بەسەر هاتنەکایەی ئەم ڕوانینە تایبەتەدا بۆ مرۆڤ، هێشتا یەکسانی لەنێوان مرۆڤەکاندا شتێک نییە دروست بووبێت یان خەڵکی ئەم سەدەیە بەردەوام بەرگریی لێ بکات و پێی خۆش بووبێت. هەر لە هیندستان خۆیدا هێشتا عەقڵیەت و وێناکردن و پراکتیکی ئیهانەکردن و بەکەمترتەماشاکردنی بڕێکی گەورەی پاریاکانی جاران و کاستەکانی خوارەوە هەر ماوە، بەتایبەتی لە ناوچە گوندنشینە کشتوکاڵییەکانی هیندستاندا و بەتایبەتیتریش لە تەماشاکردنی بەشێک لە خەڵک بۆ دانیشتووانە هەژارە لادێنشینەکانی هیندا.[1] تا ئەمڕۆش لە ئەمەریکا خۆشیدا، کە بەیاننامەی یەکسانبوونی مرۆڤەکانی تێدا لەدایک دەبێت، هێشتا بەشێک لە سپیپێستانی ئەو وڵاتە خۆیان بە خاوەنی وڵاتەکە دەزانن و ڕەشپێستەکان وەک میوانێکی بێزارکەر دەبینن. تا

١_ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٦.

بۆشیان بکرێت دژایەتیی بیرۆکەی یەکسانی دەکەن لەنێوان سپیپێستان و ڕەشپێستانی ئەو ولاتەدا. لەناو ئەورووپاشدا مەسەلەی یەکسانی لەلایەن هەمووانەوە قابیلی قبوولکردن نییە، مەغریبییەک و تورکێک و کوردێکی کۆچکردوو، با پەنجا سالیش بێت کۆچیان کردبێت و مندالەکان و مندالی مندالەکانیشیان لەو ولاتانەدا لەدایک بووبن، با ئەو مندالانە جگە لە زمانی ئەو ولاتانە زمانی دیکە و جگە لەو ولاتانە نیشتیمانی تریان نەبێت، بەلام هێشتا لەلایەن بەشێک لە دانیشتووانی ئەو ولاتانەوە وەک هاوولاتیی ڕاستەقینە و یەکسان تەماشا ناکرێن. لە خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا هەمان دیاردە بە دەیان شێوازی خراپتر و ترسناکتر ئامادەیە، لە ئێران و عێراق و تورکیا و سووریادا بە هیچ جۆرێک هیچ جۆرە یەکسانییەک لەنێوان گروپە ئەتنییە کەمینەکان و ئەتنییەتی بالادەستی ئەو ولاتانەدا، بوونی نییە. لە هیچ ولاتێکی ناوچەکەدا یەکسانی لەنێوان دیندار و بێدین و موسلمان و ناموسلماندا بوونی نییە. کۆچی بەکۆمەلی مەسیحییەکانی عێراق و سووریا و میسر بۆ ئەورووپا و ئەمەریکا، بەشێکە لە دیاردەیەکی گەورەتری وێنانەکردنی مرۆڤ وەک بوونەوەری یەکسان لەگەل یەکدا. لەگەل هاتنی سەلەفیەتی ئیسلامیشدا بەگشتی و سەلەفیەتی جیهادیدا بەتایبەتی، نەک تەنها یەکسانیی نێوان مرۆڤەکان و دینەکان لەگەل یەکدا پەکی خراوە، بەلکو نەوەیەک لە دینداری درندە دروست بووە، کە خۆی وەک مرۆڤێکی بالاتر لە هەموو مرۆڤەکانی تر، بە مرۆڤە دیندارەکانی تریشەوە،

دەبینێت. ئەمانە پێیان وایە گرتنی ئافرەت بە سەبایا و بەکۆیلەکردنەوەی مرۆڤەکان دیاردەی ئاسایین و نابێت پەک بخرێن و لەناو ببرێن. جیاوازیی نایەکسانیی دینەکان لەگەڵ یەکدا، جیاوازیی نایەکسانیی دیندارەکان لەگەڵ یەکدا، جیاوازیی نایەکسانیی نێوان نێر و مێ و جیاوازیی نێوان ئەوانەی مەیلی سێکسیی جیاواز و شێوەژیانی جیاوازیان هەیە، بەشێکە لەو هەندەسە کۆمەڵایەتییەی لەو ناوچەیەدا سەروەرە. بەکورتی، ئەگەرچی مرۆڤایەتی زیاد لە دوو سەدەیە قسە لە یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتریدا دەکات، بەڵام هێشتا ئەم یەکسانییە مەسەلەیەک نییە بەڕاستی پیادە کرابێت و پێناچێت ئەم کێشە سەرەکی و بنەڕەتییەی مێژووی مرۆڤ بەم زووانە چارەسەر بکرێت. دونیای ئەمڕۆ پڕە لە شێوازی نوێی نایەکسانی و مرۆڤەکانی ئەم سەردەمەش بە شێوازی جیاواز پۆلێنی نایەکسان و نادادپەروەرانە دەکرێن.

لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەدرێژی لەسەر چۆنێتیی هاتنەکایەی چەمکی یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا دەوەستین و بەناو ساڵە درێژ و زەحمەتەکانی سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم و بیستەمدا تێدەپەڕین. هەروەها باس لە بەشێک لەو چەمک و ڕوانینانە دەکەین، کە بۆ نموونە لە یۆنانی کۆندا لای ئەرستۆ هەبووە بۆ بەخشینی ڕەوایەتیی بەکۆیلەکردنی مرۆڤ، هاوکات لەناو کەلەپووری ئیسلامیشدا لەسەر هەندێک چەمک دەوەستین، کە پەیوەندییان بە مەسەلەی یەکسانی و نایەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا هەیە.

## ٥

مەسەلەی کەرامەت، کە بەشی دووهەمی ئەم کتێبە پێک دەهێنێت، پابەستی مەسەلەی وێناکردنی مرۆڤە وەک مرۆڤ، خاڵی سەرەکی لێرەدا وێناکردنی مرۆڤە وەک بوونەوەرێکی خاوەنی ڕێز و بەها و ماف و کەسایەتیی سەربەخۆ. مەسەلەی کەرامەت مەسەلەی پاراستنی مرۆڤبوونی مرۆڤە هەم لە ژیانی تایبەتیی خۆیدا و هەم لە ژیانی گشتیدا، مامەڵەکردنیەتی وەک بەهایەکی ئەخلاقیی گرنگ. کەرامەت لەم ئاستەدا بەتوندی بەو فەلسەفە و ڕوانین و وێناکردنەی مرۆڤەوە گرێ دراوە، کە پێ لەسەر دەستەبەرکردن و پاراستنی مافە هەرە بنەڕەتی و سەرەکییەکانی مرۆڤ دادەگرێت. ڕێزدانان بۆ مرۆڤ وەک بەهایەکی سەربەخۆ، وەک ئامانجێک لەسەروو ئامانجەکانی ترەوە، وەک نرخێک کە نە دەشکێندرێت و دابەش دەکرێت، جەوهەری ئەم مافانەیە. لە سەرێکی دیکەوە کەرامەت پرنسیپی پاراستن و ڕێزگرتنە لە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنجەستە و خاوەنفیکر، خاوەنحەز و خاوەنئارەزوو و ئیرادە، وێناکردنی مرۆڤە وەک بوونەوەرێک، کە دەتوانێت خۆی ژیانی خۆی دابهێنێت، خۆی کەسایەتیی خۆی دروست بکات، توانای بەرهەمهێنانی بۆچوون و ئامانجی تایبەتیی بۆ ژیانی خۆی هەیە. لە سەرێکی دیکەوە پاراستنی کەرامەت مانای ڕێزگرتنی تواناکانی داوەریکردنی ئەخلاقییانەیە لای مرۆڤ، تا ئەو شوێنەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێک وێنا بکات کە خۆی دەتوانێت نووسەر و یاسادانەر و بەهادروستکەری ژیانی

خۆی بێت، توانای بەشداریکردنی سیاسی و توانای هەڵگرتنی بەرپرسیاریەت و توانای بڕیاردانی لەسەر دونیا هەبێت. کەرامەت بەهایەکی ناوەکییە، گرێدراوی گەڕاندنەوەی ڕەهەندی ئەخلاقییە بۆ ئەو پەیوەندییانەی لەنێوان مرۆڤەکاندا دروست دەبن، پابەندی مامەڵەکردنی ئینسانە وەک بوونەوەرێک، کە نابێت دەست بۆ ژیانی ببرێت و نابێت بریندار و بێنرخ بکرێت. لە ئاستە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکەیدا کەرامەت ئاماژە بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەک دەکات، تیایدا ڕێز یەکێک لە چەمکە سەرەکییەکانی ڕێکخستنی ژیانی گشتی و پەیوەندیی نێوان دەزگاکان و تاکەکەسەکان بێت. کۆمەڵگەیەک فەیلەسووفی ئیسرائیلی ئەڤیشای مارگەلیت ناوی "کۆمەڵگەی حورمەت"ی لێ دەنێت. "کۆمەڵگەی حورمەت" ئەو کۆمەڵگەیەیە کە دەزگاکانی ئیهانەی مرۆڤەکان ناکەن و وەک بوونەوەری بچووک و بێنرخ و گرگن مامەڵەی ناکەن. لێرەدا پاراستنی کەرامەت پەیوەندییەکی سەرەکیی بە ڕێگرتن لە ئیهانەکردنی مرۆڤەوە هەیە، لە ئاستە دەزگاییەکەیدا مانای دروستکردنی تۆڕێک لە دەزگا، کە ڕێزی بەهاکانی مرۆڤبوون بگرن، لە ئاستە ئەخلاقییەکەشیدا مانای وازهێنان لە قسەکردن دەربارەی مرۆڤ بە زمانی گەمژە و گاگەل و جاهیل و نەزان. لە هەردوو دۆخەکەدا باوەڕهێنان و داننانە بەوەدا کە مرۆڤ بەهایەکی ناوەکیی تایبەتیی هەیە و نابێت ئەم بەهایە بریندار بکرێت. بەکورتی، کەرامەت چەمکێکە پەیوەندیی بە پەیوەندیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتر و پەیوەندیی ئەوان و کۆمەڵگە و ئەوان و دەزگاکانەوە هەیە. مامەڵەکردنی مرۆڤەکانیش وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و وەک بوونەوەرێکی یەکسان بەوانی تر، بەشێکی هێجگار گرنگی پاراستنی کەرامەتی مرۆڤە لە کۆمەڵگەدا. کەرامەت

هێمایە بۆ پێداویستیی دروستبوونی زمانی تر و دەزگای تر و کۆمەڵگەی تر، کە تیایاندا مرۆڤ وەک بەهایەکی گرنگ ببینرێت و مامەڵە بکرێت.

ئەم کتێبە لە بەشی دووهەمیدا بەدرێژی لەسەر چەمکی کەرامەت لای سێ نووسەری گرنگی دونیای مۆدێرن دەوەستێت، کە بریتین لە فەیلەسووفی ئەڵمانی ئیمانوێل کانت و فەیلەسووفی کەنەدی چارلس تایلەر و یەکێک لە فەیلەسووفەکانی نەوەی سێهەمی قوتابخانەی فرانکفۆرت، ئالیکس هۆنیس. کانت کەرامەت وەک نرخ مامەڵە ناکات، پێی وایە کەرامەتی مرۆڤ شتێکە بە هیچ جۆرێک قابیلی ئەوە نییە بزانین نرخەکەی چەندە، ناتوانین قورساییەکە و نرخەکەی بپێوین، چونکە مەسەلەیەکە پەیوەندیی بە مرۆڤبوونی مرۆڤەوە هەیە. کەرامەت لای ئەم فەیلەسووفە، شتێکە لەسەرووی هەموو شتەکانی ترەوەیە و هیچ شتێک ناتوانێت نرخی کەرامەت دیاری بکات، لە هەموو شتێکی دیکە بەهادارتر و قورسترە. بۆیە لای کانت لەبەرامبەر کەرامەتدا نرخ ئامادە نییە، بەڵکو ئینسانبوونی ئینسان خۆی ئامادەیە، ئینسان وەک بوونەوەرێکی خاوەنعەقڵ و خاوەنتوانای بیرکردنەوە و خاوەنهەستکردن. کانت پێی وایە کاتێک دەڵێین شتێک خاوەنکەرامەتە، ئەمە مانای ئەوەیە ناتوانین ئەو شتە بە هیچ شتێکی دیکە بگۆڕینەوە، ناتوانین نرخێکی تایبەتی بۆ دابنێین، چونکە کەرامەت نرخ و بەهایەکی ناوەکی دەبەخشێت، کە قابیلی پێوان و مەزەنەکردن نییە، کەرامەت نرخێکی ناوەکییە، کە قورساییەکەی لەناو خۆیدایە و لە دەرەوەی ڕێزگرتنی مرۆڤدا بە هیچ شتێکی تر ناپێورێت.

لای چارلس تایلەر، کەرامەت چەمکێکی سیاسی و فیکریی

بنەڕەتیی ناو دونیای مۆدێرنە، هەڵگری ڕەهەندێکی گەردوونیی یەکسانخوازە، وای لێ دەکات باوەڕمان بەوە بێت مرۆڤەکان لە هەر شوێنێکی دونیادا بن خاوەنی کەرامەتن و بڕی ئەم کەرامەتەش لەناو هەمووان‌دا بەهەمان ڕادەیە. هیچ مرۆڤێک کەرامەتی زیاتر یان کەمتری لە مرۆڤێکی تر تێدا نییە. لای تایلەر کەرامەت چەمکێکە ئاماژە بۆ شووناسی تاکەکەس دەکات وەک مرۆڤ، ئەوەی مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ و ئەوەی شووناسی مرۆڤبوون بە مرۆڤ دەبەخشێت کەرامەتە. لای ئەم فەیلەسووفە، کەرامەت شتێک نییە پابەست بێت بە کولتوورێک لە کولتوورەکانەوە بە تەنها، یان بەم میللەت و نەتەوە و گروپی دینی و فەرهەنگییەوە. مرۆڤ مادام مرۆڤە، کەواتە خاوەنی کەرامەتە و خاوەنی کەرامەتی یەکسانیشە لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا. لە دیدی چارلس تایلەردا، مرۆڤی ناو دونیای مۆدێرن، وەک مرۆڤێکی خاوەنکەرامەت لەدایک دەبێت و کەرامەت بەشێکە لە وێناکردنە سەرەکییەکانی فیکری مۆدێرن بۆ کۆمەڵگە و مرۆڤی مۆدێرن. ئەگەر لە کۆمەڵگە تەقلیدییەکان‌دا چەمکی "شەرەف" چەمکی سەرەکی بێت، ئەوا چەمکی سەرەکیی ناو دونیای مۆدێرن چەمکی کەرامەتە. جیاوازیی سەرەکیی نێوان چەمکی "شەرەف" و چەمکی "کەرامەت" لەوەدایە، لە کۆمەڵگە تەقلیدییەکان‌دا مرۆڤەکان هەموویان بەقەدەر یەکتری خاوەنی "شەرەف" نەبوون، چونکە هەندێک لە مرۆڤەکان "ئەشراف" بوون و هەندێکی تریش "عەوام،" ئەشرافەکان شەرەفی زیاتریان هەبووە لە عەوامەکان و عەوامەکان شەرەفیان کەمتر بووە لە ئەشرافەکان. بەڵام لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکان‌دا، چەمکی کەرامەت دەچێتە شوێنی شەرەف و مرۆڤەکانیش بە هەمان

ڕادە خاوەنکەرامەتن و کەس لەوی تر کەرامەتی زیاتر یان کەمتر نییە. چەمکی کەرامەت لای تایلەر، تەنها چەمکێکی فیکری و تیۆری نییە، بەڵکو ڕەهەندێکی سیاسیی هێجگار گرنگیشی هەیە، چونکە ئەم چەمکە بەتوندی بە شێوازێکی دیاریکراو و تایبەتی ڕێکخستنی کۆمەڵگەوە گرێ دراوە. ئەمەش مانای ئەوەیە، کۆمەڵگە دەشێت بە جۆرێک ڕێک بخرێت، کە بەردەوام کەرامەتی مرۆڤەکان بریندار بکات و ژێرپێی بنێت، بەڵام دەشێت بە جۆرێکیش ڕێک بخرێت، کە ئەو کەرامەتە بپارێزێت. لە بەشی دووهەمی ئەم کتێبەدا بەدرێژی لەسەر ڕوانینەکانی تایلەر بۆ چەمکی کەرامەت دەوەستین و ڕەهەندەکانی تری نیشان ئەدەین، بەتایبەتی پەیوەندیی نێوان کەرامەت و دانپیانان و کەرامەت و دیالۆگ.

چەمکی کەرامەت لای ئالیکس هۆنیس پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە مەسەلەی "دانپیانان"ەوە هەیە، واتە ئیعتیرافکردن بە مرۆڤبوونی مرۆڤەکان. هۆنیس دانپیانان وەک یەکێک لە پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ دەبینێت و وەک بەشێکی گرنگی وەدیهێنانی مرۆڤ بۆ ئینسانبوونی خۆی وێنای دەکات. ئەم فەیلەسووفە سێ شێواز لە دانپیانان لە یەکتری جیا دەکاتەوە و پێی وایە هەموو مرۆڤێک پێویستییەکی گەورەی بە هەریەکێک لەو سێ شێوازە لە دانپیانان هەیە. یەکەمیان بریتییە لە خۆشەویستی؛ دووهەمیان بریتییە لە بوونی ماف؛ سێهەمیان بریتییە لە بوونی هاریکاری و بەدەمەوەچوونی ئینسانی و کۆمەڵایەتی. بە بۆچوونی هۆنیس، مرۆڤ تەنها دوای وەدیهێنانی ئەو سێ شێوازە لە دانپێدانان دەکەوێت، دەتوانێت پەیوەندییەکی پۆزەتیڤی بە خودی خۆیەوە هەبێت. نەبوونی هەریەکێک لەمانە،

شەبەقێکی گەورە لە بوونی مرۆڤانەی مرۆڤدا دروست دەکات. لای ئەم فەیلەسووفە مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت شووناسێک بۆ خۆی دروست بکات، هەست بە کەسبوونی خۆی بکات، هەرسێ شێوازەکەی دانپیانان بنەڕەتی و سەرەکین. لای هۆنیس، خۆشەویستی وەک دانپیانان بە مرۆڤبوونی مرۆڤدا، شتێکە لە "مەجالی تایبەت"دا دروست دەبێت، لە پەیوەندییەکانی ناو خێزان و هاوڕێیەتی و پەیوەندیی خۆشەویستیدا. بەڵام دوو شێوازەکەی تری دانپیانان، شێوازی دانپیانانن، کە لە "مەجالی گشتی"دا دروست دەبن، لەناو کۆمەڵگەدا و لە ڕێگەی ئەو پەیوەندییانەوە کە مرۆڤ لەناو کۆمەڵگەدا دروستیان دەکات. لای ئەم نووسەرە، دانپیانان لەم ئاستەدا ڕەهەندێکی سیاسیی هێجگار گرنگی هەیە و پێشی وایە ئەوەی سیستەمە سیاسییەکان لە یەکتری جیا دەکاتەوە، بڕ و ڕادەی فراوانی و بەرتەسکیی داننانە بە مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت. دابەشکردنی سیاسەتی باش و خراپیش لەسەر بنەمای بڕی دانپیانانەکان لە یەکتری جیا دەکاتەوە، سیاسەتی باش، ئەو سیاسەتەیە کە مەودا و ڕووبەری دانپیانانە جیاوازەکان گەورە دەکات و پیادەیان دەکات، سیاسەتی خراپیش لەسەر بچووککردنەوە و لەناوبردنی ئەو شتانە کار دەکات.

لە سی ساڵی ڕابردووی مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دوو شۆڕشی گەورە ڕوویان داوە، یەکەمیان شۆڕشی ئێرانی ساڵی ١٩٧٩یە، کە تیایدا کۆمەڵگەیەک ڕاپەڕی و دەسەڵاتدارێکی شاهەنشاهانەی بەهێزی خست. دووهەمیان "بەهاری عەرەبی"یە، کە تیایدا چەندان کۆمەڵگە هاتنە قسە و چەندان دەسەڵاتداریان خست. دوو شۆڕشی گەورە و خوێناوی لە ماوەی سی ساڵدا.

لەدوای هەریەکێک لەم دوو ڕووداوەشەوە، دۆخێکی نوێ هاتە کایەوە، یەکەمیان دۆخی بەئیسلامیکردنێکی تەواوی ناوچەکەیە لەپاڵ گووتارێکدا لەسەر "ڕەسەنایەتی" و "گەڕانەوە بۆ خود" و "بەگژاچوونەوەی غەربزەدەگی." لە کاتێکدا لە دووهەمیاندا دۆخی هەڵاتن لەو پرۆسەی بەئیسلامیکردنە و هەڵاتن لەو کۆمەڵگە ئیسلامی و لەو گووتارانە لە ئارادایە، کە شۆڕشی یەکەمیان دروستی کردووە. شۆڕشی ئێرانی بە ناوی بەرگریکردن لە "کەرامەتی نەتەوەیی" و "کەرامەتی فەرهەنگی" و "کەرامەتی خۆماڵیبوون"ەوە ئەدوا. لە کاتێکدا دووهەمیان بەرگری لە "کەرامەتی تاکەکەس" و "کەرامەتی مرۆڤ" وەک مرۆڤ دەکات و پاراستنی ئەم کەرامەتە تاکەکەسییەشی بە یەکێک لە ئامانجە هەرە سەرەکییەکانی خۆی دادەنا. درووشمی سەرەکیی "بەهاری عەرەبی،" "نان و ئازادی و کەرامەت" بوو، لە کاتێکدا درووشمی شۆڕشی ئێرانی "نە شەرقییە نە غەربییە، جمهوری ئیسلامییە بوو."

شۆڕشی ئێرانی خاوەنی دوو تیۆریستی ئایدیۆلۆژیی ڕادیکاڵ بوو، کە عەلی شەریعەتی و ئایەتوڵڵا خومەینین، لە کاتێکدا یەکێک لە ڕووکارە جوانەکانی "بەهاری عەرەبی" غیابی بیرۆکەی "زەعیم" و "زەعامەت" و "تیۆریست"ی ژمارەیەکە تیایدا. بەهاری عەرەبی، کە بەرگریی لە کەرامەتی تاکەکەسی دەکرد نەک لە کەرامەتی فەرهەنگی یان نەتەوەیی، نە زەعیمێکی سیاسیی دیگۆلی یان غاندیئاسا و جیڤاراییی هەبوو، نە زەعیمێکی ڕۆشنبیری و فەلسەفیی وەک جان پۆل سارتەر و عەلی شەریعەتی. ئەم بەهارە بەهاری مرۆڤە ناڕازی و بێزاربووەکان بوو لە سەرجەمی درۆ دەستەجەمعییەکان و

باسکردنی مرۆڤەکان بوو لە خۆیان وەک تاکەکەکسی تایبەت. هەر ئەمە بوو وای کرد ئەم بەهارە تەمەنکورتە چەمکی پاراستنی "کەرامەت" بکاتە یەکێک لە چەمکە سەرەکییەکانی ناو ئەو بزووتنەوەی یاخیبوونەی کە بەرپایان کردبوو. هەر لە بنەڕەتیشەوە کەش و هەوای ئەم بەهارە کەش و هەوای دروستکردنی زەعیم نەبوو، نە زەعیمی سیاسی و نە زەعیمی تیۆری، پێشم وایە ئەمە یەکێک لەو خاڵە گرنگ و پۆزەتیڤەیە کە لەدوای ئەم بەهارەوە بۆ نەوەکانی ئایندە دەمێنێتەوە. ئەو تێزەی دەمەوێت لێرەدا بەرگریی لێ بکەم، ئەوەیە کە کەرامەت بەشێکە لەو ڕوانینانەی لەم ناوچەیەی ئێمەدا لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگە هاتۆتە کایەوە. بەڵام لە دۆخی شۆڕشی ئێرانیدا چەمکی کەرامەت کورت کراوەتەوە بۆ "کەرامەتێکی دەستەجەمعی"ی گریمانکراو، کە لەپاڵ وێناکردنێکی داخراوی شووناسی دەستەجەمعیدا نمایش کراوە و یەکێک لە دەرەنجامە هەرە کوشندەکانی بریتی بوو لە قوربانیدان بە "کەرامەتی تاکەکەسی" لەپێناوی ئەو کەرامەتە دەستەجەمعییە وێناکراوەدا. ئەمەش دواجار شۆڕشی ئێرانی دەگۆڕێت بە یەکێک لە مۆتەکە سیاسییە گەورەکانی ناوچەکە و دونیا. دووهەمیان، کە بەهاری عەرەبییە، مەسەلەی کەرامەتی مرۆڤی وەک تاکەکەس خستە خانەی یەکەمی نەخشەی یاخیبوونی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی ئەم ناوچەیەوە. تێکشکانی بەهاری عەرەبی و زاڵبوونی دوژمنانی ئەم بزووتنەوە گرنگە بەسەر بزووتنەوەکەدا، لەو ڕاستییە کەم ناکاتەوە، کە چەمکی کەرامەت بووە بە یەکێک لە چەمکە سەرەکییەکانی ناو زمانی سیاسی و فیکری و فەرهەنگیی ئەم ناوچەیە.

## ٦

مەسەلەی پلورالیزم، کە بەشی سێهەم و کۆتاییی ئەم کتێبەیە، مەسەلەیەکە پەیوەندیی بە مەسەلەی ڕێکخستنی جیاوازییەکانەوە هەیە لە کۆمەڵگەدا، ئیتر لە جیاوازییە دینییەکانەوە بیگرە تا بە جیاوازییە سیاسی و ئەتنی و فەرهەنگی و سێکسی و نەتەوەیییەکان دەگات. پلورالیزم ئاماژەکردنە بۆ ئەو ڕاستییە سادەیە کە لە کۆمەڵگەدا دید و ڕوانین و خەون و چاوەڕوانیی جیاواز بوونیان هەیە و ئەم جیاوازییانەش لەناو سیستمی ئەخلاقی و دینی و ڕەمزیی جیاوازدا ڕەنگ دەدەنەوە. ئەمانەش لەو کێشە گەورانەن کە چارەسەرکردنیان ئاسان نییە. هیچ دونیایەک بێجیاوازی نییە و هیچ کۆمەڵگەیەکیش لە مێژوودا بوونی نییە، کە هەموو مرۆڤەکانی لەیەکچوو بن، بەتایبەتی کۆمەڵگە مۆدێرنەکان، کۆمەڵگەی پڕ مرۆڤ و بەها و دید و ڕوانین و ئەخلاقی جیاواز و هەمەڕەنگ و فرەجۆرن. وەک فەیلەسووفی ئەمەریکی جۆن ڕاوڵز دەڵێت، ئاکاری کۆمەڵگە دیموکراسەکانی دنیای مۆدێرن ئەوەیە، کە ڕوانین و دیدی فەلسەفی و ئایینیی هێجگار بەربڵاو و فراوانیان تێدایە، comprehensive، و ناکۆکییەکان و جیاوازییەکانی نێوانیان چ لە ئێستا و چ لە ئاییندەیەکی نزیکدا هێشتا قابیلی چارەسەرکردن نین. بەڵام ڕاوڵز لە جنسی ئەو فەیلەسووفە ڕەشبینانە نییە کە پێی وا بێت دونیای ئەمڕۆ دونیایەکی بێهیوایە و سیستمێکی بەربەریانە حوکمی دەکات، کە لە ڕۆخی وێرانبوون و دارمانێکی

تەواوەتی نزیکی خستۆتەوە. ڕاوڵز باوەڕی وایە، مرۆڤەکان دەتوانن لەژێر تیشکی ئەوەی ناوی "عەقڵێکی ئینسانیی هاوبەش"ی لێ دەنێت، کێشە سەرەکییەکانیان چارەسەر بکەن و بە لانی کەمی هاریکارییشەوە لەگەڵ یەکدیدا بژین، وەک چۆن لە هەمان کاتدا ئەو ڕاستییەش دەبینن و دانیشی پێدا دەنێن، کە کۆمەڵێک جیاوازی و ناکۆکییش لەنێوانیاندا هەیە، بەتایبەتی سەبارەت بە دیدی دینی و فەلسەفی و فەرهەنگییان بۆ دونیا.[1] ئەوەی ڕاوڵز لێرەدا باسی دەکات، مەسەلەی بینین و نکووڵینەکردنی جیاوازییەکانە، بەڵام هاوکات پێداگرتنیشە لەسەر بوونی توانا بۆ کاری ئینسانیی هاوبەش و هاریکار، سەرەڕای بوونی ئەو هەموو جیاوازییانە، کە مرۆڤەکان و کۆمەڵگەکان لە یەکتری جیا دەکاتەوە. ڕاوڵز لێرەدا باس لە یەکێک لە دەرکەوتە هەرە سەرەکییەکانی ناو دونیای مۆدێرن دەکات، کە مەسەلەی پلورالیزم و فرەدیدییە، پلورالیزم بەتایبەتی لە ئاستی پرسیارە گشتی و ڕوانینە گشتییەکانی مرۆڤدا بۆ ژیان و جیهان و کۆمەڵگە، هاوکات پلورالیزم لە بواری بەها ئەخلاقی و دینی و تەنانەت سیاسییەکاندا. قبوڵکردنی ئەم جیاوازییانە و وێناکردنی دونیا لەم دیدە پلورالیستەوە، دەرەنجامێکی گرنگی بۆ ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەیە، کە بریتییە لە قبوڵکردنی ململانێ و ناکۆکی وەک بەشێکی نەگۆڕ و هەمیشەیی ژیان لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا، بەتایبەتی لە ژیانی سیاسی و ئەخلاقیدا. پێداگرتن لەسەر ئەو ڕاستییە سادەیە، کە لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا هەمیشە و هەردەم ناکۆکی و فرەبۆچوونی لە زۆر بواری ژیانی

---

١_بڕوانە: John Rawls (1993). *Political Liberalism*. New York: Columbia University Press. p. 140-41.

کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیدا هەیە و دەمێنێتەوە، تا ئەو شوێنەش کە ناکرێت ڕێککەوتنی ڕاستەقینەیان لەنێواندا دروست بکرێت، بەشێکە لە هۆشیاریی مۆدێرن خۆی، بۆیە ئەلتەرناتیڤی ئینسانی ئەوە نییە یەکێکیان ئەوی تریان لەناو ببات، یان ئەمیان بۆ هەتاهەتایە ئەوی تریان بێدەنگ بکات، یان یەکێکیان ئەوی تریان بێنرخانە مامەڵە بکات، بەڵکو ئەوەیە کە بتوانن پێکەوە و لەناو یەک چوارچێوەدا بژین، ژیانێک لەپاڵ بوونی کۆمەڵێک ناکۆکیدا، کە دەکرێت ناوی "ناکۆکیی ماقووڵ" و "ناکۆکیی بەعەقڵانیکراو"یان لێ بنێین.

مەسەلەی ڕێکخستنی پلورالیزم تەنها مەسەلەی دەستەبەرکردنی کۆمەڵێک مافی بنەڕەتی و بنچینەیی نییە سەبارەت بە یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا، بەتەنها مەسەلەی پاراستنی کەرامەتی مرۆڤەکانیش نییە، کە هەڵگری دیدی جیاوازن بۆ دونیا، بەڵکو پێویستی بە خولقاندنی فەزایەکی کۆمەڵایەتییش هەیە، کە تیایدا ئینسانەکان بتوانن بەدوای وەدیهێنانی ئامانجە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیانەوە بن، بە هاوئاهەنگی لەگەڵ ئەوانی تردا، هەروەها بتوانن لەسەر هەندێک ڕەوشی تایبەت ڕێک بکەون، بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانیان. هەر لە سەرەتاشەوە ئەو ئەگەرە ئامادەیە کە دەشێت لە دۆخە پلورالەکاندا هێزی سیاسیی دەستەجەمعیی داهێنەر لەدایک ببێت، کە بتوانێت پلورالیزم پۆزەتیڤ بنرخێنێت و وەک توانا و ئەگەرێک بۆ بەهێزبوون مامەڵەی بکات، نەک وەک دۆخێک بۆ وێرانکردن. واتە مەرج نییە هەمیشە جیاوازی و پلورالیزم گەشە بکات بۆ سێکتاریزمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دینی، مەرج نییە لەوی ترنەچوون هەمیشە ببێتە هەنگاوی یەکەم بۆ لەناوبردنی

ئەوی تر. جیاوازی و فرەڕەنگی دەشێت ڕێک بخرێن و بەتاڵ بکرێنەوە لە هەڕەشە و مەترسییەکان. لە هەموو ئەمانەدا خاڵێک تەواو ئاشکرایە، کە بریتییە لەوەی پلورالیزم ناتوانێت بەبێ ڕێککەوتن هەبێت و بژی، ناتوانێت بەبێ بوونی عەقڵیەتێک ئامادە بێت، کە نەیەوێت دانووسان بکات و ڕێگەچارەیەک بۆ لێکنەچوونەکان بدۆزێتەوە. بەڵام ڕێککەوتن مانای لێکچوون یان هەوڵدان بۆ لەیەکچوون نییە، مانای سڕینەوەی جیاوازییەکان و کۆپیکردنی یەکتری نییە، مانای ئەوەش نییە هێزێک یان دیدێک یان دونیابینییەک خۆی بەسەر ئەوانی تردا بسەپێنێت. ڕێککەوتن مانای کۆبوونەوەیە لەدەوری هەندێک پرنسیپی زۆر گشتی، کە قبووڵنەکردنیان ناعەقڵانی و ناڕاست و ترسناک بێت، لەوانەش، بۆ نموونە، کۆبوونەوە لەدەوری ئەو پرنسیپەی کە پێی وایە پێویستە هەمووان وەک یەک و بە شێوەیەکی دادپەروانە مامەڵە بکرێن. هەرکەسێک ئەم پرنسیپەی قبووڵ نەبێت، ڕووبەڕووی مەترسیی ئەوە دەبێتەوە، کە خۆی بە شێوەیەکی نایەکسان و ستەمگەرانە مامەڵە بکرێت.

لە دونیای مۆدێرندا، ڕێککەوتن لەسەر ئەو پرنسیپە گشتییانە زۆربەی جار مانای بوونی دەستوورێکە، کە پرنسیپە بنەڕەتییەکانی پێکەوەژیانێکی یەکسان و مافدار و بێئیهانەکردنی تێدا جێگیر کرابێت. دەستوور وەک تێکستێک، کە پرنسیپە گشتییەکانی چەندان ڕووبەری ناسیاسیی ئازاد بۆ تاکەکەسەکان دروست بکات، کە بتوانن لەناویدا و بەبێ حیسابکردن بۆ زۆرینە و کەمینە، بۆ بەهێز و لاواز، بۆ دەوڵەمەند و هەژار، بتوانن بژین و بجووڵێن و بیر بکەنەوە، بەو شێوەیەی دەیانەوێت و بەو جۆرەی بە ڕاستی دەزانن، بە مەرجێک، ئەو شێوە ژیان و بیرکردنەوە

و جوولانە، پرنسیپە دەستوورییە گشتییەکان بریندار و پێشێل نەکەن. جگە لەمە پلورالیزم هەمیشە پەیوەندیی بە مەسەلەی شووناسەوە هەیە، بەلام شووناس هەرگیز دروستکراوێکی داخراو نییە و هیچ شووناسێکیش کامڵ و تەواوبوو نییە و هیچیشیان لە تەنهاییدا و بە دابڕان لە شووناسەکانی تر و لە پەیوەندییەکان و لە کارلێکردنەکان دروست نابێت. هەموو جیاوازییەک بۆ ئەوەی وەک جیاوازی ببینرێت و بژی، پێویستی بە شتێک هەیە کە لەو نەچێت، واتە جیاوازی کە زۆر جار بنەمای شووناسە، تەنها لە پەیوەندیدا بە شتێکی دیکەوە کە لەو نەچێت، لە پەیوەندیدا بە جیاوازییەکی دیکەوە، قابیلی دروستبوون و مانەوەیە. بۆیە هەموو شووناسێک هەم لە ڕووی سیاسییەوە و هەم لە ڕووی ئۆنتۆلۆژیشەوە هەمیشە چەند شووناسێکی تری لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە، یان گریمانی هەبوونی ئەو شووناسانەی کردووە. بێگومان ئەو پەیوەندییانەی لەنێوان جیاوازییەکان و شووناسەکاندا دروست دەبن، دەشێت پەیوەندیی ترس و بەدگومانی بن، پەیوەندیی تووڕەبوون و وەڕسبوون بن، یان پەیوەندیی بەدحاڵیبوونێکی گەورە بێت، بەلام دەشکرێت هیچ یەکێک لەمانە نەبێت و بە پێچەوانەوە، پەیوەندیی نێوان شووناسەکان پەیوەندیی کرانەوەیەکی پڕ ڕێز و تەنانەت سەرسووڕمان بێت بە یەکتری. ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان شووناسەکان مەسەلەیەکی ئاسان و پێشوەخت پێدراو و حازربەدەست نییە، بەڵکو پێویستی بە پرۆسەیەکی درێژخایەنی دروستکردنی دەزگا و پراکتیک و شێوازی نوێی خودبوونی نوێ هەیە.

ئەو خاڵەی گرنگە لەم پێشەکییەدا جەختی لێ بکەین،

ئەوەیە کە پلورالیزم پێکهاتێکی هێجگار سەرەکی و بنەڕەتیی کۆمەڵگەکانی دونیای ئەمڕۆیە. مۆدێرنە، وەک کۆمەڵناسی ئەمەریکی: پیتەر بێرگەر دەڵێت، مەرج نییە هاوڕێ بێت لەگەڵ عەلمانیەت و عەلمانیەت لەگەڵ خۆیدا بهێنێت، بەڵام هەمیشە پلورالیزم لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. دونیای مۆدێرن مەرج نییە دونیایەکی بێدین بێت، بەڵام هەمیشە دونیایەکە پڕ لە دیدی جیاواز بۆ دین و دینداری، دونیایەکە بەردەوام شووناسی تایبەت و لەیەکنەچووی دینی و نادینی دروست دەکات. بۆیە ئەوەی لە دۆخێکی لەو بابەتەدا وەک نان و ئاو پێویستە، تیۆرییەکی یۆتۆپی و گشتگیر نییە لەسەر گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیی یەکئاراستەیی، بەڵکو پێداگرتنی زیاتر و زیاترە لەسەر بەهاکانی یەکسانی و ڕێز و لێبووردن و مافە تاکەکەسی و دەستەجەمعییەکان. لە ڕاستیدا هەڵسوکەوتی ئەخلاقی کاتێک ماناکانی بەتەواوی وەک هەڵسوکەوتێکی ئەخلاقی وەر دەگرێت، کە بتوانێت هەمیشە هۆشیار بێت بەم دۆخە پلوراڵە، هۆشیار بێت بەو دەورووبەرە کە پڕە لە مرۆڤ و شێوەژیان و خولیای جیاواز، پڕە لە دید و ڕوانینی جیاواز و ناکۆک و لەیەکنەچوو.

بێگومان بەرگریکردن لە پلورالیزم مانای بەرگریکردن نییە لە ڕێژەگەراییەکی پەڕگیر، کە پێی وایە هەموو شتێک ڕاستە و هیچ شتێک هەڵە نییە، یان هەموو شتەکان و هەموو بۆچوونەکان و هەموو ڕوانینەکان وەک یەکن و ئەمیان لەوی تریان باشتر و ئەخلاقیتر نییە. لەپشتی ئەم دیدە ڕێژەگەراییە ڕەهایەوە وێناکردنێکی هەڵە و ترسناک بۆ شووناس ئامادەیە، کە وەک شتێکی دابڕاو و داخراو وێنای دەکات، شتێک، گوایە لە سێنتەرێکی داخراو و لەناو ڕووبەرێکی تەواو تایبەت و

بێپەیوەندی لەگەڵ شتەکانی دیکەدا دروست دەبێت، بەڵام ئەم ڕوانینە بۆ شووناس، تەواو ناکۆکە بەو ڕوانینەی شووناس وەک دەرەنجامی چەندان شێوازی کارلێک و کارلێکی پێچەوانەوە و چەندان شێوازی پەیوەندیی جیاواز و حەزی فرەجۆر و خواستی ناکۆک و ویستی ناتەبا، وێنا دەکات. ئەوەی پلورالیزم پێویستی پێیەتی، زمانێکە کە قەتعی و بنبڕ و گشتگیر نەبێت، زمانێک لەناو خۆیدا ئەگەر و توانای ڕێژەییبوونی خۆی هەڵگرتبێت و پێی وا نەبێت زمانێکی پاکژە و لە دەرەوەی ململانێکان و شووناسەکان و فۆرمە جیاوازەکانی میتافیزیکدایە. پلورالیزم زمان و عەقڵیەتێکی دەوێت، هەمیشە لە دۆخی پشکنینێکی ناوەکیی خۆیدا بێت بۆ دۆزینەوەی دەرکەوتە جیاوازەکانی موتڵەقگەرایی لە خۆیدا و ڕاستکردنەوەی ئەو دۆخەش لە ڕێگەی دەرگاکردنەوە لەسەر ڕێژەگەراییەکی تەندروست. پلورالیزمی ڕاستەقینە، پلورالیزمێک ڕێزی پرنسیپە سەرەکییەکانی خۆی بگرێت، بەشێکی زۆری ئەوانەش دەگرێتە خۆی، کە باوەڕیان بە پلورالیزم نییە، بێگومان تا ئەو شوێنەی ئەو بێباوەڕییە دەبێت بە هەڕەشەیەکی بنەڕەتی بۆ سەر پلورالیزم خۆی.

لە بەشی سێهەمی ئەم کتێبەدا، سەفەرێکی درێژ دەکەین بەناو ڕوانین و بۆچوونەکانی فەیلەسووفی ئەڵمانی: هانا ئارێنت و فەیلەسووفی ئیتالی: جیانی ڤاتیمۆ و فەیلسووفی ئیسلامی: فارابیدا، لە پەیوەندییاندا بە مەسەلەی جیاوازی و پلورالیزمەوە. هەریەکێک لەم سێ نووسەرە گەورەیە، لە دیدێکی تایبەت و جیاوازەوە لە پلورالیزمی ڕوانیوە و هەریەکەشیان بە شێوەیەکی تایبەت بەرگریی لە پلورالیزم کردووە.

# ٧

خەمی من لە نووسیندا هەرگیز خەمێکی تیۆری نەبووە بەتەنها و ئارەزووی تیۆریزەکردن نووسینی منی ئاراستە نەکردوە، ئەوەی منی جوولاندووە غەمی خوێندنەوەی "ئێستا" بووە، ڕاڤەکردن و تێگەیشتن بووە لەو "دونیابوونەی" لەناویدا ئامادەین. تێگەیشتن لەم ئێستایە و هەوڵدان بۆ گۆڕین و دارشتنەوەی بە شێوەیەکی باشتر و ئینسانیتر و کراوەتر، ئەو پاڵنەرە سەرەکییەیە کە وا لە من دەکات بنووسم. نووسین لای من هەوڵدانە بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکی تایبەت بە دونیاوە، پەیوەندییەک، خاڵی هەرە گرنگ تیایدا تێگەیشتنە لە دونیا بە مەبەستی گۆڕین و دەستکاریکردنی، بۆ کردنی بە جێگەیەک، بکرێت مرۆڤ لەناویدا مرۆڤبوونی خۆی بەبێ ترس و بێ سووکایەتی و ئیهانەکردن بژی. ئەم پەیوەندییەش بە نووسینەوە تەنها پەیوەندییەکی فیکری و تیۆری نییە بەتەنها، هەروەها پەیوەندییەکی سیاسییش نییە بەتەنها، بەڵکو پەیوەندییەکە تیایدا فیکر بەشێکە لە سیاسەت و سیاسەتیش بەشێکە لە فیکر. **ئێستا** لای من کێشەیەکی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و فیکرییە، کێشەیەکی ئاڵۆزە و چەندان ڕەهەندی جیاوازی هەیە و پێویستی بە زیاد لە شێوازێکی بەرەنگاربوونەوە و دارشتنەوە هەیە. هەم بۆ دەستکاریکردنی نووسین خۆی و هەم بۆ

گۆڕین و دەستکاریکردنی دونیاش، زیاد لە ستراتیژێک و زیاد لە فۆرمێکی مەعریفیی پێویستە. هەموو "ئێستا"یەک پێدراوێکی دروستکراوە، کە هەرگیز لە دروستکردن ناوەستێت، پێدراوێکە پڕ لە نهێنی و تاریکی و ڕووناکی، کە بەردەوام بە یەکتری تێکەڵ دەبن و لە یەکتری جیا دەبنەوە. کاری فیکر بەرهەمهێنانی زمان و چەمک و تیۆرە و ڕوانین و پراکتیکە، کە هاریکاریی کۆمەڵگە بکات بۆ ئەوەی باشتر لەو ئێستایە تێبگات و باشتر بیر لە کردەی گۆڕانکاری و دەستکاریکردنی ئەو **ئێستایە** بکاتەوە. لەکوێدا فیکر لە ویست و خەونی گۆڕین و دەستکاریکردنی ئێستا کەوت، خۆی وا نمایش کرد، کە کردەی ئازادبوون کردەیەکە لە ئاستی فیکردا دەبێت ڕوو بدات، ئەوەدەم هەموو ئەو پردانە وێران دەکات کە بە دونیاوە گرێی ئەدات، بەمەش وەک هێزێکی نەبوو وایە، وەک گیانلەبەرێک وایە لەناو شووشەیەکدا لە دەرەوەی بوونی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا.

هەموو **ئێستایەکیش** هەمیشە ئێستایەکی کاتییە، هیچ ئێستایەک نییە ئەبەدی و نەگۆڕ، لە ڕابردووەوە بۆ ئەمڕۆ هاتبێت و لەمڕۆشەوە بۆ سبەینێ و دووسبەی بپەڕێتەوە و لە دۆخی خۆدووبارەکردنەوەیەکی بەردەوامدا بێت. قسەکردن لەسەر **ئێستا** کاتێک دەتوانێت لانی کەمی بەهای میتۆدی و زانستیی هەبێت، کە لەناو دیدێکی دینامیکییەوە هاتبێت، خۆی لە کۆمەڵێک کلێشەی فیکری و تیۆری پاراستبێت. بە بۆچوونی من، کاری فیکر لە ئێستای دونیای ئێمەدا، "نووسینە بە دەنگی بەرز،" بە دەنگێک، بکرێت هەموو

ئەوانە ببیستن کە بەشێکن لەو ئێستایە و بەشدارن لە دروستبوون و بەهێزبوون و پاراستن و گۆڕین و نەگۆڕین و داڕشتنەوەیدا. ئێستای ئێمە ئێستایەکی ترسناکە و پێویستی بە دەستکاریکردنێکی هەمەلایەن و بەرفراوان هەیە، مرۆڤ لەم ئێستایەدا بە شێوازی جیاواز بریندار و بێکەرامەت و ترساو و بێئومێد دەکرێت، کەم نین ژمارەی ئەو نووسەر و ڕۆشنبیر و سیاسییانەی سەری زمان و بنی زمانیان بەگەمژەسەیرکردن و مامەڵەکردنی مرۆڤەکانی ناو کۆمەڵگە ئێمەیە. کەم نین ژمارەی ئەو نووسەر و سیاسییانەی بە کار و کردەوە و نووسین و بیرکردنەوە دژ بە پلورالیزمن، کەم نین ئەو نوخبەگەرانەی پێیان وایە مرۆڤ هەیە بالایە و مافی زیاتر و نرخی زیاتر و کەرامەتی زیاتری هەیە و مرۆڤ هەیە نزمە و بۆ ئەوە دروست کراوە لە ڕیزی خوارەوەی کۆمەڵگەدا بژی. نووسین بە دەنگی بەرز نووسینە دژ بەم شێوازە لە بیرکردنەوە و نووسین و هەڵسوکەوتی سیاسی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی، نووسینە دژ بەم ئێستایە، کە ئەم گشتە ترسناکە دروستی کردووە. نووسین بە دەنگی بەرز خەریکی خەونبین بە ئاییندەیەکەی دوورەوە نییە، بەشێکیش نییە لە کردەی گەڕان بەدوای نەمرییەکی تاکەکەسیدا، بەکەمزانینی ئەو دیاردانەش نییە کە لە ئێستا و لێرەدا ڕوو دەدەن، بەڵکو نووسینە لەسەر ئەو پرۆسە و جووڵە و کردار و خەون و بەرگری و تێکشکاندنانەی بەسەریەکەوە ئێستا دروست دەکەن، ئێستا هەم ناشیرن و هەم جوان، هەم نائومێد و هەم پڕئومێد دەکەن. بۆیە نووسین بە دەنگی بەرز،

هەرچییەک بێت، نووسینێکی دەمامکدار نییە، فرەدەموچاو و فرەفێڵ نییە، نووسینە لە دۆخی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدا بە دونیاوە، بەبێ ئەوەی ترس لە کاردانەوە جیاوازەکانی ئەو دونیایە ناچاری بکات چەندان دەموچاو لە ڕیتۆریک و ئینشاسازی و هیچنەوتن دروست بکات.

ئەمستردام

٢٦ی تشرینی دووهەمی ٢٠١٥

# بەشی یەکەم
# مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف
## لەدایکبوونی بیرۆکەی یەکسانی لە دونیای مۆدێرندا

# سەرەتا

وەک لە پێشەکیی ئەم کتێبەدا وتمان، یەکێک لە ئاکارە هەرە سەرەکییەکانی دونیای مۆدێرن، وێناکردنی مرۆڤەکانە لەگەڵ یەکتریدا وەک بوونەوەری یەکسان، وەک کەسانێک کە هەموویان هەمان مافیان هەیە و هەمان بەرپرسیارێتییان لەسەر شانە. ئەم مەسەلەیە بە ڕادەیەک بنەڕەتی و گرنگە، ناکرێت بیر لە مۆدێرنە بکەینەوە بەبێ بیرۆکەی یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا. ڕەنگە کەس هێندەی تۆماس جیفرسۆنی سەرۆکی ئەمەریکا بەوردی ئەم ڕۆحیەتە یەکسانخوازەی مۆدێرنەی لە سەدەی هەژدەهەمدا بەرجەستە نەکردبێت. جیفرسۆن لەساڵی ١٧٧٦دا دەنووسێت: "ئێمە باوەڕمان وایە ئەم کۆمەڵە ڕاستییە بەڵگەنەویستن: هەموو مرۆڤەکان بەیەکسانی دروست کراون، دروستکەرەکەشیان کۆمەڵێک مافی پێ داون، کە ناکرێت لێیان بسەنرێتەوە، لەنێوان ئەو مافانەشدا مافی پاراستنی ژیان و مافی ئازادی و مافی گەڕان بەدوای بەختەوەریدا." ئەم دێڕە سادانە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا دەنووسرێن و دەبنە بانگەشە هەرە سەرەکییەکەی مۆدێرنە، ئەم دێڕانە شتگەلێکی تەواو تازەن و بەر لەو مێژووە شتێک بەو مانایە و بەو

ڕوونییە لە هیچ شوێنێکی دونیا و لە هیچ سەردەمێکی مێژووییدا و لە هیچ تێکستێکدا بوونی نەبووە.[1]

بێگومان لەناو هەریەکێک لە شارستانیەتە گەورەکاندا کۆمەڵێک تێکست هەن کە شتگەلێکی نزیک بەو بۆچوونانە دەڵێن، ڕێزگرتن لە مرۆڤ شتێک نییە جیفرسۆن دای هێنابێت، بەلام ئەو پێداگرتنە بێچەندوچوونە لەسەر یەکسانبوونی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا و لەسەر بوونی کۆمەڵێک مافی بنەڕەتی بۆ هەمووان، کە هیچ کەسێک نەتوانێت لە مرۆڤی بسێنێتەوە، شووناسی سەرەکیی ئەو شارستانییانە و ئەو سەردەمە مێژووییانە نییە. مۆدێرنە ئەم شێوازە لە ڕوانین بۆ مرۆڤ و ئەم شێوازە لە نرخاندن و داوەریکردن، نەک تەنها بۆ شێواز و نرخاندنی سەرەکی دەگۆڕێت، بەڵکو دەشیکات بە شووناسی سەرەکیی خۆشی. شانزە ساڵ دوای ئەو قسانەی جیفرسۆن، شۆڕشی فەرەنسی لە پاریس بەرپا دەبێت و لەگەڵ ئەم شۆڕشەشدا "بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوولاتی" لەدایک دەبێت. لەم ڕووداوە تازەیەشدا، پێداگیریی تەواو لەسەر مافەکانی مرۆڤ دەکرێت وەک کۆمەڵێک مافی سروشتی و نەگۆڕ و پیرۆز، کە هیچ هێز و لایەن و دەسەلات و حکومەتێک بۆی نییە لێیان لا بدات و ڕێزیان نەگرێت. ئەم دارشتنە تایبەتە وا دەکات ئەو مافانە وەک بنەمای هەموو دەسەلاتێک دەر بکەوێت، کە بخوازێت بەشێک بێت لە دونیای مۆدێرن و هەڵگری پێدراوە سەرەکییەکان و نرخ

[1] بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم خاڵە، بڕوانە:
Allen(1998 ،(Jayne *Jefferson's Declaration of Independence: Origins, Philosophy and Theology.* Lexington, Ky.: The University Press of Kentucky.

و بەها بنەڕەتییەکانی ئەو دونیایە بێت. هەم لای جێفرسۆن و هەم لە بەیاننامەکەی شۆڕشی فەڕەنسیدا، مرۆڤەکان بۆ یەکەم جار بەبێ لەقەب و پێگە و ئینتیمای دینی و ئەتنی و چینایەتییان وەک بوونەوەرێک نمایش دەکرێن، کە هەموویان لەگەڵ یەکدا و لەبەردەم یاسادا یەکسانن، کەس لەسەر بنەمای ئەسڵ و فەسڵ، دین و کولتوور، ڕەگەز و ئەتنیەت لە کەسی تر باشتر و خاوەنمافتر و بەنرختر و بەرزەجێتر نییە. ئەوەشی لەم دوو ڕووداوەدا سەرنجڕاکێشە، ئەوەیە کە ئەوان تەنها باسی خەڵکی فەڕەنسا یان ئەمەریکا ناکەن، بەڵکو باسی "هەموو مرۆڤێک،" "هەموو خەڵک" و "هەموو کۆمەڵگە"یەک دەکەن، باس لە "هەموو هاووڵاتییان"ی هەموو پارچە جیاوازەکانی دونیا دەکەن، بەمەش ڕەهەندێکی بان کولتووری و بان دینی و بان نەتەوەیی و گەردوونی بەم ڕوانینە تازەیە بۆ مرۆڤ، دەبەخشن.[1]

## مرۆڤی نایەکسان

مەسەلەی ئەوەی بەبێ گوێدانە پاشخانی کۆمەڵایەتی و دینی و ئەتنی، بەبێ حیسابکردن بۆ پلەوپایەی کۆمەڵایەتی، بێ گوێدانە ڕەنگی پێست و شێوازی دەرەوەی جەستەی مرۆڤ، بڵێین مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا یەکسانن، وتنێکی مۆدێرن و شۆڕشگێڕانەیە. لە بەشی هەرەزۆری مێژووی مرۆڤایەتیدا کەس نەیوتووە مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا یەکسانن، کەس

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشو.

نەیوتووە دیندار و بێدین، دەوڵەمەند و هەژار، خەڵکی شار و خەڵکی گوندەکان، ڕەش و سپی، نێر و مێ لە وێناکردنی یەکەمدا مرۆڤن و ئەم مرۆڤبوونەشیان وایان لێ دەکات لەگەڵ یەکتریدا یەکسان بن. دەڵێم بەشی هەرەزۆری مێژووی مرۆڤایەتی، مێژووی ڕوانینە بۆ مرۆڤەکان وەک مرۆڤی نایەکسان، هەندێک لەوانی تر خاوەنمافتر و باڵاتر و نرخدارتر بوون و لەسەر ئەو وێناکردنەش بە شێوەیەکی جیاواز مامەڵە کراون.

لە فیکری کلاسیکی کۆندا، بیرۆکەی یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا نەک تەنها ئامادە نییە، بەڵکو بە چەندان شێوەش بەرگری لە نایەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتریدا کراوە. بۆ نموونە لە دونیای کۆندا ڕوانینێکی بایۆلۆژی و نیمچەبایۆلۆژی هەیە، کە مرۆڤە جیاوازەکان وەک خاوەن لەشی جیاواز وێنا دەکات و لەسەر بنەمای ئەم وێناکردنەش نرخ و بەهای جیاواز بە هەریەکێکیان دەبەخشێت. جیاکردنەوەی لەشی ئافرەت لە لەشی پیاو، لەشی کۆیلە لە لەشی خاوەنکۆیلە، لەشی دەوڵەمەند لە لەشی هەژار، لەشی دینی لە لەشی نادینی، دابەشکردنێکە بە دەیان شێوە بە نرخاندنی جیاواز و نایەکسانەوە گرێ دراوە. لە هەمان کاتدا ڕوانینێکی فەلسەفییش بۆ مرۆڤ لەئارادا بووە، کە مرۆڤی کەمتر وەک "خاوەنجەستە" و زیاتر وەک "خاوەنڕۆح" وێنا کردووە، ڕۆحیش وەک شتێک پێناسە کراوە، تەواو ناکۆک بە جەستە. جیاکارییەکە لێرەدا لەنێوان جەستەی مرۆڤەکاندا نییە، بەڵکو لەنێوان ڕۆحی مرۆڤەکاندایە. ئەم جیاکارییەش تا ئەو شوێنە دەڕوات کە هەندێک مرۆڤ وا وێنا بکرێن وەک

ئەوەی خاوەنرۆح نەبن، یان ڕۆحیان بەو ڕادەیە گەشەی نەکردبێت، بکرێت بە خاوەنرۆح ناو ببرێن، ئەم جۆرە مرۆڤانە تەنها جەستەن، جەستەی بێرۆح. لەم ڕووەوە، بۆ نموونە، ئیبن سینا کە باس لە بەهەشت دەکات، پێی وایە بەهەشت هەم چێژی جەستەیی تێدایە، هەم چێژی ڕۆحی، چێژە جەستەییەکان بۆ ئەو مرۆڤانەیە کە توانا ڕۆحییەکانیان لاوازە و تەنها دەتوانن چێژی جەستەیی ئەزموون بکەن، لە کاتێکدا چێژە ڕۆحییەکان، کە چێژی بالاترن، هی ئەو مرۆڤانەیە کە خاوەن ڕۆحێکی تایبەتن، جیاواز لە ڕۆحی ئەوانی تر. ئەم ڕوانینەی ئیبن سینا بۆ بەهەشت، کە تیایدا شوێنێکیش بۆ ئەوانە دەکاتەوە کە دەتوانن تەنها چێژی جەستەیی ببینن، تەواو ناکۆکە بەو ڕوانینەی فارابی، کە پێی وایە جەستەی مرۆڤەکان لە قەبردا دادەڕزێت و کۆتایی پێ دێت، ئەوەی بۆ بەهەشت دەڕوات تەنها ڕۆحەکانە. بەلام فارابی پێی وایە هەموو ڕۆحێک ناچێتە بەهەشتەوە، بەهەشت تەنها هی ئەو ڕۆحانەیە کە گەشەیان کردووە و دەتوانن چێژە ڕۆحییەکان ئەزموون بکەن. ئەم جۆرە ڕۆحەش تەنها ڕۆحی بیریار و فەیلەسووف و خوێندەوارە گەورەکانە، نەک ڕۆحی مرۆڤە سادە و ئاساییەکان.[1] تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەمیش، یەکێک لە پرسیارە سەرەکییەکانی ئەو مژدەبەرە مەسیحییانەی لە کیشوەری ئەفەریقادا خەریکی بلاوکردنەوەی ئایینی مەسیحیەت بوون، ئەوە بوو: ئایا ئەفەریقییەکان ڕۆحیان هەیە یان نا؟ ئایا

١_بڕوانە: Rahman, Fazlur (2002). *Islam*. The University Chicago Press, Chicago. لاپەڕە١١٩.

ئەوانیش وەک مرۆڤە سپییەکان خاوەنی جەستە و ڕۆحن پێکەوە، یان بەتەنها خاوەنی جەستەن؟ بەر لەوەی لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بێمە سەر باسکردنی هەندێک لە دەرکەوتە سەرەکییەکانی نایەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا لە فەلسەفەی کلاسیکیدا، دەمەوێت لێرەدا جەخت لەو خاڵە بکەمەوە، کە لەناو دینەکان و هەندێک کەلەپووری بیرکردنەوەی کلاسیکیدا، چەند وێنەیەکی مرۆڤ بوونی هەیە، کە دەکرێت وەک سەرەتایەکی زۆر سادەی وێناکردنی مرۆڤ وەک بوونەوەری یەکسان وێنای بکەین. دەڵێم وەک سەرەتایەکی زۆر سادە، چونکە شێوازی سەرەکیی بیرکردنەوە لە مرۆڤ، ئەو ڕوانین و بیرکردنەوانە بوون کە مرۆڤەکانیان وەک بوونەوەری نایەکسان وێنا کردووە. بۆ نموونە لە ئینجیلدا هاتووە، کە پێویستە "هاوسێکەتت خۆش بوێت وەک چۆن خۆتت خۆش دەوێت،" یان لە ئیسلامدا هاتووە "هیچ کەس لە ئێوە باوەڕدارێکی ڕاستەقینە نییە، تا ئەو کاتەی حەز بکات براکەشی هەمان ئەو شتەی هەبێت کە ئەم حەز دەکات خۆی هەیبێت." ئەم جۆرە ڕوانینانە کە ئاماژە بۆ هەندێک دەرکەوتی یەکسانی لەنێوان مرۆڤەکاندا دەکەن، دەکرێت لە زیاد لە کەلەپوورێکی دینی و نادینیی ناو مێژوودا بدۆزرێنەوە، بەڵام پرسیاری سەرەکی ئەوەیە: ئایا دەستەواژەی "دراوسێ" و "برا" لەو دێڕانەی سەرەوەدا باس لە کێ دەکەن و چۆن لەناو ئەو دینانەدا ئەو کەسانە پێناسە کراون؟ بەر لە هەموو شتێک، دەستەواژەی "دراوسێ" و "برا" دوو دەستەواژەی سنووردارن و ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە برا و دراوسێ نین. ئەم خاڵە گەرچی گرنگییەکی تایبەتی

هەیە، بەڵام مەسەلەکە تەنها بوونی ئەم سنوورە دیاریکراو و بەرتەسکە بۆ پێناسەکردنی مرۆڤ نییە، بەڵکو ئەوەشە کە پێداگرتن لەسەر خۆشەویستی بۆ دراوسێ و برا، لە باشترین لێکدانەوەدا کۆمەڵێک پرنسیپی ئەخلاقین، نە یاسا و نە دەزگا و نە کەلەپوورێکی سیاسی بوونی نییە کە ئەو دیدە ئەخلاقییە بۆ دیدێکی سیاسی گەشە پێ بدات و خۆشەویستی بۆ دراوسێ و برا بگۆڕێت بۆ ماف. ئەم شێوە ڕوانینە کلاسیکییانە بەشێکن لە هەندێک پرنسیپی ئەخلاقی، کە پێویستە تاکەکەسەکان هەڵگری بن، بەڵام پرنسیپن بەبێ گوتار و بەبێ دەزگا و بەبێ دونیابینییەکی سیاسی، واتە پرنسیپن بەبێ ئەوەی بووبن بە ماف. کەلەپوورێکی دێرینی تریش هەیە، کە پێم وایە لە بەشێکی زۆری کۆمەڵگەکانی دونیادا بوونی هەیە و بوونی هەبووە، ئەویش کەلەپووری خەمخواردن و مشوورخواردن و بەدەمەوەچوونی "کەسانی تر"ە. زۆربەی جار ئەم کەسانە کەسە نزیکەکانن، بۆ نموونە دایک و باوک و خوشک و برا و دۆست و ناسراوەکانن، بەڵام مەرج نییە ئەم کەسانە هەموو ئەوانە بن کە مرۆڤ بە ئەرکی خۆی دەزانێت و زانیوە خەم و مشووریان بخوات. بۆ نموونە کەسانی پیر و پەککەوتە، کەسە لاوازەکانی ناو کۆمەڵگە، ئەوانەی زۆر هەژارن، ئەوانیش لە هەندێک دۆخدا مشووریان خوراوە و ئاگاداری کراون. ئەم کەسانە مەرج نییە مرۆڤ بیانناسێت بۆ ئەوەی مشووریان بخوات. بەڵام ئەم جۆرە مشوورخواردنەش پەیوەندیی بە مافەوە نییە و بەشێکە لە دیدگەیەکی ئەخلاقی، کە پابەستە بە ئامادەگیی هەندێک کەلەپووری دینی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەوە،

کە لە بەشێکی زۆری کۆمەڵگەکانی دونیادا بوونی هەیە و بوونی هەبووە.

ئەو بۆچوونەی پێی وایە مرۆڤەکان هەموویان یەکسانن و نابێت لەسەر هیچ بنەمایەکی دینی و ئەتنی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و جنسی و ڕەگەزی، جیاوازی لەنێوانیاندا بکرێت، بۆچوونێکی تازەیە و مێژووەکەی بۆ لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن دەگەڕێتەوە. ئەم دونیایەش لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمەوە هێدی هێدی دروست دەبێت. پێویستە هەر لە سەرەتاوە ئەو خاڵە تەواو ئاشکرا بێت، کاتێک باس لە بیرۆکەی یەکسانیی نێوان مرۆڤەکان لە دونیای مۆدێرندا دەکەین، باس لە "واقیعی یەکسانی" ناکەین، واتە باس لەوە ناکەین ئایا مرۆڤەکان لە واقیعدا لەگەڵ یەکدا یەکسانن، یان نا؟ ئایا باوەڕبوون بەوەی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا یەکسانن، فیکرەیە یان واقیع؟ باس لە بوونی چەندەها شێوازی گەورەی نایەکسانی لەناو دونیای مۆدێرندا ناکەین، ئەوەی دەمەوێت باسی بکەم، لەدایکبوونی ئەو دۆخە نوێیە گشتییەیە کە تیایدا ئەگەری وێناکردنی مرۆڤەکان وەک بوونەوەری یەکسان لەدایک دەبێت و ئەو وێناکردنەش هەم دەبێت بە بەشێک لە فیکر و تیۆرەکان خۆیان و هەم بە بەشێکیش لە مێژوو، واتە شتێک لەو یەکسانییە و شتێک لە وێناکردنەکانی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی یەکسان لەناو واقیع و مێژووی دونیای مۆدێرندا هەیە و ئامادەیە، سەرەڕای هەموو جیاوازییەکان و نایەکسانییەکانی ناو ئەم مێژووە.

مێژووی وێناکردنی مرۆڤەکان وەک بوونەوەری یەکسان

لەگەڵ یەکدا، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەهەم و بەر لەو سەدەیە بەدەگمەن نەبێت شتێک بە ناوی یەکسانبوونی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا نادۆزینەوە. بەر لە سەدەی هەژدەهەم، لە هیچ شوێنێکی دونیادا مرۆڤ بوونەوەرێکی "خاوەنماف" و "یەکسان" نەبووە، مرۆڤ "خودێکی یاسایی" نەبووە، کە ئەم یاساییبوونەی بنەمای هەبوونی کۆمەڵێک ماف بێت، هیچ کەس و لایەنێک نەتوانێت لەناویان ببات. بینینی یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا وەک ماف، دیدێکی تەواو تازەیە. بەڵام وەک وتم، کە باس لە "مرۆڤی یەکسان" دەکەین، ئەوەندەی باس لە "وێنەیەکی زیهنی" یان "بیرۆکە"یەکی ئەبستراکت، یان ئایدیالێک دەکەین، ئەوەندە باس لە واقیعێکی مێژوویی بەرجەستە و فراوان ناکەین، چونکە هەموومان دەزانین کۆیلایەتی لە شێوە فەرمییەکەیدا تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و مامەڵەکردنی ژنان وەک بوونەوەرێکی پلەدوو لە زۆربەی کۆمەڵگەکانی دونیادا، بۆ سەدەی بیستەم دوا دەکەوێت. ئەمە جگە لە چەندان شێوازی دیکەی نایەکسانی و هەڵاوردن، کە تا ئەمڕۆش بەشێکن لە مێژووی زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵگەکانی دونیا. ئەو چەند دێڕە سادەیەی جێفرسۆن لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا بەو ڕوونییە دەینووسێت، سەرەتایەکی تەواو تازەیە، بەڵام سەرەتایەکە تا ئەمڕۆش نەبووە بە بەشێکی ئۆرگانی و دانەبڕاو لە مێژووی کۆمەڵگە هاوچەرخەکان. ئەم ڕوانینە بنەڕەتی و تازەیە بۆ مرۆڤ، چ لەدوای شۆڕشی ئەمەریکی و چ لەدوای شۆڕشی فەرەنسییەوە، زۆر جار و لە زۆر شوێنی دونیادا تەنها وەک کۆمەڵێک وشەی سەر کاغەز

ماوەتەوە. لە فەرەنسا خۆیدا گەشەکردنی ڕووداوەکانی شۆڕشی فەرەنسی بە ئاراستەیەکدا تێدەپەڕن، کە "حکومەتی تێرۆ" دروست دەبێت و هەزاران کەس دوای داوەریکردنێکی کارتۆنی دەکوژرێن و دەستووری فەرەنساش بە جۆرێک دادەڕێژرێتەوە، تەواو ناکۆک بەو پرنسیپە گرنگانەی پێ لەسەر یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا دادەگرن. دوای ئەو ڕووداوانەش دیاردەی ئیمپریالیزم و داگیرکردن و چەوساندنەوەی بەشێکی گەورەی دونیا لەلایەن وڵاتە ئەوروپییەکانەوە دەست پێ دەکات، ئیمپریالیزمیش پەیڕەوی هەر پرنسیپێکی کردبێت، ئەوا پەیڕەوی پرنسیپی یەکسانیی مرۆڤەکانی لەگەڵ یەکتریدا نەکردووە. هەموو ئەمانە هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕن کە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمەوە وێنەیەکی نوێ بۆ مرۆڤ لەدایک دەبێت، کە تیایدا وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف، وەک کەسێکی یەکسان بە مرۆڤەکانی تر، وێنا دەکرێت. لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا دوو بەیاننامەی گرنگ لە دوو شوێنی جیاوازی دونیادا سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ دەر دەچێت، کە ئاماژە بۆ لەدایکبوونی ئەم سەرەتا تازەیە دەکەن. ئەو دوو بەیاننامەیەش بریتین لە "بەیاننامەی مافەکان-Declaration of Rights"، کە لە ١٢ی مانگی شەشی ساڵی ١٧٧٦دا لە ڤێرجینیا لە ئەمەریکا دەر دەچێت. دووهەمیان "بەیاننانەی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتی"یە، کە لە ٢٦ی مانگی هەشتی ساڵی ١٧٨٩دا لە پاریس دەر دەچێت.[١]

---

١_بڕوانە کتێبی:
Peter C. Kop (...).Men en Burger een geschiendenis van grondrechten.Walburg Pers. P. 19/20.

# چ کەسێک خاوەنمافە؟

پرسیاری ئەوەی کێ خاوەنمافە، پرسیارێکی کۆنە؟ بەڵام وەڵام بەو پرسیارە لە دونیای کۆندا تەواو جیاوازە لەو وەڵامانەی لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمەوە بەم پرسیارە دەدرێتەوە. با لێرەدا سەرنجێک لە وەڵامی یۆنانییە کۆنەکان بدەین، بەتایبەتی بزانین ئەفلاتوون و ئەرستۆ چۆن وەڵامی ئەم پرسیارە ئەدەنەوە، دوای ئەوە بەدرێژی دێینە سەر ئەو گۆڕانکارییانەی لە سەدەی هەژدەهەمدا دێنە کایەوە و وا دەکەن وێنەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی یەکسان لەدایک ببێت.

دیدی ئەرستۆ و بەر لەویش دیدی ئەفلاتوون بۆ دادپەروەری، دیدێکە تەواو جیاوازە لەو دیدەی ئەمڕۆ بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگەکانی دونیا بۆ دادپەروەرییان هەیە. دادپەروەری لە یۆنانی کۆندا لەسەر ڕوانین و مامەڵەکرنی یەکسانیی مرۆڤەکان دروست نەبووە، شتێک بە ناوی "یەکسانی"یەوە بەو مانایەی ئەمڕۆ ئێمە لێی تێدەگەین، بوونی نەبووە. بەرگریی ئەرستۆ لە بوونی کۆیلە و لە سیستمی کۆیلایەتی، بابەتێکی بەناوبانگی ناو فیکری ئەم فەیلەسووفەیە و هەرکەسێک خۆی بە مەسەلەی ڕوانین بۆ مرۆڤەوە لە فیکری بەر لە دونیای مۆدێرندا سەرقاڵ کردبێت، ڕاستیی ئەم بەرگرییەی ئەرستۆ لە کۆیلایەتی دەزانێت. بەر لەوەی بێمە سەر باسکردنی چۆنێتیی بەرگریکردنی

ئەرستۆ لە کۆیلایەتی و جیاکردنەوەی شێوازە جیاوازەکانی کۆیلایەتی لای ئەم فەیلەسووفە یۆنانییە، بە پێویستی دەزانم وەک سەرەتا هەندێک لەو ڕوانینانە شی بکەمەوە، کە ئەم فەیلەسووفە و هاوشارییەکەی تری، مەبەستم ئەفلاتوونە، بۆ مەسەلەی عەدالەت، واتە دادپەروەری هەیانبووە. چونکە تەنها لەسەر بنەمای تێگەیشتن لە مەسەلەی دادپەروەرییە کە دەتوانین لە ڕوانینی ئەم دوو فەیلەسووفە کلاسیکییە بۆ نایەکسانیی نێوان مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا تێبگەین.

ئەفلاتوون و ئەرستۆ باوەڕیان وایە خراپترین نەخۆشییەک تووشی دەسەڵات ببێت، نەخۆشیی دوورکەوتنەوە لە دادپەروەری و بەهەرەمەکی بەکارهێنانی دەسەڵاتە. لای ئەمان و لای زۆرینەی هەرەزۆری فیکری کۆمەڵایەتی و سیاسیی دوای ئەوانیش، بەتایبەتی لە دونیای ڕۆمانییە کۆنەکان و لە دونیای ئیسلامدا، مەسەلەی دادپەروەری بابەتی سەرەکیی ناو فیکری سیاسی و فیکری ئەخلاقی و لە زۆر سەریشەوە ناو فیکری دینییشە. بەڵام دادپەروەری، واتە عەدالەت، لە دونیای کلاسیکیدا بەگشتی و لای ئەمان بەتایبەتیی، مانای چییە؟ فەلسەفەی سیاسی و ئەخلاقی لە یۆنانی کۆندا لەسەر دۆزینەوەی باشترین مۆدێلی حوکمڕانی و چۆنێتیی دروستکردنی باشترین حوکمڕان کار دەکات، دۆزینەوە و بونیادنانی "شاری پڕچاکەکاری-المدینة الفازیلة،" سەرەتا و کۆتاییی ئەم ڕوانینە یۆنانییەیە بۆ سیاسەت و بۆ ئەخلاق. یەکێک لە گرنگترینی ئەو ڕوانینانەی لای ئەفلاتوون و ئەرستۆ ئامادەیە، دروستکردنی جیاکارییە لەنێوان مرۆڤەکاندا، بۆ نموونە ئەگەر مارکس مرۆڤەکان لە ڕێگەی چینەکانەوە

لە یەکتری جیا بکاتەوە، واتە لە ڕێگەی خاوەنداریێتییەوە، ئەوا یۆنانییە کۆنەکان لە ڕێگەی جیاکردنەوەی ڕۆحی مرۆڤەکانەوە لە یەکتری، ئەم جیاکارییە ئەنجام ئەدەن. لای ئەوان، ڕۆحی مرۆڤ لە سێ ڕەگەزی سەرەکی پێک دێت و لای هەرکەسێکیش، ڕاستتر بدوێین، لای هەر توێژێکی کۆمەڵایەتی، ڕەگەزێک لەو ڕەگەزانە باڵادەستە. بۆیە پرسیاری دادپەروەری، کە خۆی لە جەوهەردا پرسیارێکی سیاسییە، دەبێتە پابەستەی دابەشکردنێکی سایکۆلۆژییانەی ڕۆحیی مرۆڤەکان. لای ئەفلاتوون، ڕۆح سێ ڕەگەزی سەرەکیی تێدایە، کە بریتین لە: یەکەم، نەوس و حەز و ئارەزووە جەستەییەکان. دووهەم: ئازایەتی. سێهەم: عەقڵ. هەریەکێکیش لەم ڕەگەزانە، جۆرە کاراکتەر و کەسایەتییەک دروست دەکات، جیاواز لەوی تریان. بۆ نموونە **عەقڵ** سەرکردە سیاسی و حوکمڕانەکان دروست دەکات، **ئازایەتی** پاسەوانان و جەنگاوەران، **نەوس و حەز و ئارەزووش**، کۆیلە و ئیشکەرەکان. ئەگەرچی ئەو منداڵانەی لەدایک دەبن دەتوانن لە بەشێکیانەوە بگوازنەوە بۆ ئەوی تریان، بۆ نموونە لە ئیشکەرانەوە بۆ پاسەوانان و حوکمڕانان، بەڵام ئەمە زیاتر ڕووداوێکی ڕێکەوت و دەگمەنە. ئەوەی یاسایە و سەروەرە، ئەوەیە هەریەکێک لەو سێ چینە، حوکمڕانان و پاسەوانان و کۆیلە و ئیشکەران، بەردەوام لەناو ئەو چینانەدا دەمێننەوە کە تیایدا لەدایک بوون. خاڵی بنەڕەتییش لە دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی دادپەروەردا، جیاکردنەوەی ئەو سێ هێزەیە لە یەکتری و دروستکردنی سیستمێکی تایبەتی پەروەردە و

فێرکردنی جیاوازە بۆ هەریەکێک لەو سێ هێزە.[1] ئەفلاتوون بەتایبەتی گرنگی بەو بەشەی کۆمەڵگە ئەدات کە خاوەنعەقڵن، ئەم خاوەندارێتییە عەقڵییە وا لەم کەسانە دەکات. بتوانن ببنە هەڵگری مەعریفە و زانیاریی ڕاستەقینە و لەسەر بنەمای ئەمانەش حوکمڕانی بکەن. لە دیدی ئەفلاتووندا، دروستبوونی ئەم توێژە زۆر پێویستە بۆ ئەوەی بکرێت بە شێوەیەکی دادپەروەرانە حوکمڕانی بکرێت.[2]

یەکێک لە بنەڕەتیترین و سەرەکیترین ئاکارەکانی شار و حوکمڕانیی چاکەکار: بریتییە لە دادپەروەری. ناکرێت قسە لە شاری چاکەکار بکەین گەر دادپەروەریی کۆڵەکە هەرە سەرەکییەکەی نەبێت. بەڵام ئایا دادپەروەری ناو شارە ئایدیالییە چاکەکارەکەی ئەفلاتوون و ئەرستۆ چییە و چۆنە؟ لای ئەفلاتوون و ئەرستۆ و لەدوای ئەوانیشەوە لای بەشی هەرە زۆری بیریاران و خوێندەوارانی دونیای کۆن، دادپەروەری مانای ڕێزگرتن و پەیڕەویکردنی نۆرمە سروشتییەکانە، ئەوەی بەعەرەبی پێی دەڵێن "النوامیس." پەیڕەویکردنی ئەو شێمانە سروشتییانەیە کە بە شێوەیەکی بابەتی لە مرۆڤ و کۆمەڵگە و جیهاندا بوونیان هەیە. ئەم پێدراوە سروشتییانە لە ئاستی پۆلێنکردنی مرۆڤەکان و جیاکردنەوەیان لە یەکتری، مانای مامەڵەکردنی مرۆڤەکانە بەپێی ئەو "سروشت" و "جەوهەر"ە تایبەتەی کە گوایە هەریەکێکیان هەڵگریەتی. لەم ڕوانینەدا هەر مرۆڤێک و "سروشت"ێکی تایبەتی

---

١_بڕوانە: Curtis, Micael (2008). The great political theories. New York, HarperPerennial. p 26-27.

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٧.

هەیە، "سروشتی" ئەم مرۆڤ لە "سروشتی" ئەو مرۆڤی تر جیاوازە، دادپەروەری مانای ڕێزگرتنی ئەو سروشتە جیاوازانە و جوولانەوە و مامەڵەکردنی مرۆڤەکانە لەسەر بنەمای "سروشت" و "جەوهەر"ە تایبەتەکەی خۆیان. لێرەوە "شاری چاکەکار" و "حوکمڕانیی چاکەکار" ئەو شار و حوکمڕانەیە کە بەپێی سروشتی جیاوازیی کەسەکان ئەرکەکان و بەرپرسیارێتییەکان دابەش دەکەن؛ سروشتی هەرکەسێک چۆنە، بەو جۆرە مامەڵەی دەکەن. بەلام کاتێک دەپرسین ئایا سروشتی مرۆڤەکان چۆنن؟ وەلامی ئەرستۆ و ئەفلاتوون ئەوەیە، هەندێک کەس بە "سروشت" کۆیلەن و هەندێک کەسی تر بە سروشت "سەروەر" و کەسانی تریش بە "سروشت" پاسەوان و ئازان. ئەمەش مانای ئەوەیە، هەندێک کەس بە ئاکار و سروشت و جەوهەر کۆیلەن، وەک کۆیلە لەدایک دەبن و وەک کۆیلەش بەناو ژیاندا تێدەپەڕن و وەک کۆیلەش دەمرن. دادپەروەری ئەوەیە، ئەو کەسە وەک کۆیلە مامەڵە بکەیت، چونکە ئەم مامەڵەیە لەگەڵ ئاکار و سروشتی ئەو کەسەدا دەگونجێت. شاری چاکەکار ئەو شارەیە کە ئەرکێک بە کۆیلەکان دەبەخشێت، کە لەگەڵ سروشتی کۆیلەبوونەکانیاندا دەگونجێت. ناکرێت ئەرکێک بە کۆیلە ببەخشرێت، کە پێویستە بە کەسە ئازاد و سەروەرەکان ببەخشرێت، کەسێک کە کۆیلە بوو، ناتوانێت بۆ نموونە، بیر بکاتەوە، بۆیە ناکرێت و تەواو نادادپەروەرانەیە کارێکی پێ بسپێردرێت کە بیرکردنەوە تیایدا ئەرکی سەرەکی بێت. ئەم گونجاندنی ئەرکە لەگەڵ "سروشت"ی گریمانکراوی مرۆڤەکاندا، بەشێکە لە شێوازی دابەشکردنی کار لە یۆنانی

کۆندا. لەوێدا ڕوانینێک ئامادەیە، پێی وایە لە بنەڕەتەوە هەرکەسە بۆ جۆرێکی تایبەت لە ئیشکردن دروست کراوە، کۆیلە بۆ جۆرە کارێک و پاسەوان بۆ جۆرە کارێک و دەسەڵاتدار بۆ جۆرە کارێکی تر. مرۆڤیش نابێت زیاد لە کارێک بکات و ناشبێت بەدوای کارێکدا بگەڕێت لەگەڵ "سروشت"ی ئەودا نەگونجێت. بۆ نموونە کوڕی جووتیارێک هەر بە جووتیاری دەمێنێتەوە و کوڕی سیاسەتمەدارێکیش هەر بە سیاسەتمەداری، چونکە جووتیاربوون لەگەڵ "سروشت"ی کوڕە جووتیارەکەدا و "سیاسەت"یش لەگەڵ سروشتی کوڕە سیاسییەکەدا دەگونجێت. دادپەروەری مانای ڕێزگرتنی سروشت و شێمانەی شتەکانە بەو شێوەیەی هەرکەسە ئەو شتەی پێ بسپێردرێت کە لەگەڵ سروشت و جەوهەری ئەودا دەگونجێت. ئەفلاتوون لە کتێبی "کۆمار"دا بەدرێژی لەسەر ئەم تێزە تایبەتەی دادپەروەری دەوەستێت و ڕەهەندە جیاوازەکانی شی دەکاتەوە. یەکێک لە تێزە سەرەکییەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە، کە مرۆڤ بوونەوەرێکە و ناتوانێت بەتەنها بژی، بۆیە دروستکردنی شار و دەوڵەت، بەشێکە لە "پێکەوەبوونی مرۆڤانە"ی کەسەکان بە یەکترییەوە، ئەوەشی پێویستە، سروشتی ئەم پێکەوەبوونە ئاراستە بکات، دادپەروەرییە. وەک وتمان، دادپەروەری مانای مامەڵەکردنی یەکسانیی کەسەکان نییە لەگەڵ یەکدا، بەڵکو مانای ئەوەیە، هەرکەسێک لەو شار و دەوڵەتەدا ئەو ئەرکە وەر بگرێت کە لەگەڵ سروشت و جەوهەری ئەودا دەگونجێت. کۆیلەکان ئەو کارانە بکەن کە لەگەڵ سروشتی کۆیلەبوونیاندا دەگونجێت و سەروەرەکانیش لەگەڵ "سروشت"ی سەروەربوونیاندا.

نادادپەروەری و فەوزا ئەو کاتە دروست دەبێت کە کەسەکان ڕێزی "سروشت" و "جەوهەرە" نەگۆڕەکەی خۆیان نەگرن، واتە کۆیلە بە کۆیلەبوونی خۆی و سەروەر بە سەروەربوونی خۆی و پاسەوان بە پاسەوانبوونی خۆی ڕازی نەبێت. لای ئەفلاتوون، هەموو کەسێک سروشت بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی تایبەت دروستی دەکات، کۆیلە بۆ ئیشکردن و ناکۆیلە بۆ کارەکانی تر و ڕێزنەگرتنی سروشتیش مانای لادان لە دادپەروەری و دروستبوونی پشێوی.[1] بەم مانایە، دادپەروەری پەیوەندیی بە بیرۆکەی یەکسانییەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە ڕێزگرتنی کارەکانی سروشتەوە هەیە، ڕێزنەگرتنی کارەکانی سروشتیش، مانای نەمانی دادپەروەری و دروستبوونی جەور و ستەمە. لەم ڕوانینەدا، ئەوەی پێویستە ئەوەیە، کۆیلە ڕێز لە کۆیلەبوونی خۆی بگرێت و بەپێی سروشتی کۆیلانەی خۆی بجووڵێتەوە، خواست و داخوازی و چاوەڕوانییەکانیشی لە سنووری ئەو کۆیلەبوونەدا سنووردار بکات، هاوکات سەروەر و ناکۆیلەکانیش پێویستە هەم ڕێزی کۆیلەنەبوونی خۆیان و هەم ڕێزی کۆیلەبوونی ئەو کەسان بگرن کە وەک کۆیلە لەدایک دەبن. دادپەروەری بەم مانایە، مانای دانانی هەرشتێک لە "شوێنی سروشتی" و ڕاستەقینەی خۆیدا، کۆیلەکان لە شوێنی کۆیلەبوونی خۆیاندا و سەروەرەکانیش لە شوێنی سروشتی و ڕاستەقینەی خۆیاندا. ئەگەر دادپەروەری مانای پەیڕەویکردنی ئەو "یاسا"یە بێت، واتە ڕێزگرتنی سروشتی

---

١_بڕوانە: افلاتون (١٩٧٤). الجمهوریە. ترجمە فواد زکریا، القاهرە. الهیئە المسریە العامە للکتاب. بەتایبەتی لاپەڕەکانی ٣٣٨ تا ٣٤٠.

مرۆڤـەکان بێت، ئـەوا زوڵـم و سـتەمگەری مانـای ڕێزنەگرتنـی ئـەو دۆخەیـە. وەک، لەنـاو ئـەم ڕوانینـەدا بـۆ دادپـەروەری، هەرچییـەک ئامـادە بێـت، بیرۆکـەی یەکسـانبوونی مرۆڤـەکان لەگەڵ یەکدا ئامادە نییە. نـەک هـەر ئەمـە، هەمـوو وێناکردنێکی یەکسـانانەی نێـوان مرۆڤـەکان، مانـای دوورکەوتنەوەیەکـی ڕیشـەیی و بەرفراوانــە لــە دادپــەروەری.

## ئەرستۆ و کۆیلایەتی

ئەرسـتۆ پێـی وایـە گوناهـی یەکەمـی دەسـەڵات ئەوەیـە نادادپـەروەر بێـت، ئەوەیـە هارمۆنیـەت و کۆگیریـی ناوەکـی لەدەسـت بـدات، نەتوانێـت بەپێـی سروشـتی شـتەکان کۆمەڵگـە ڕێک بخات. بەڵام دادپەروەری لای ئەم فەیلەسووفە کلاسیکییە مانـای چییـە؟ بێگومـان مانـای ئـەوە نییـە کەسـەکان وەک یـەک و بەیەکسـانی مامەڵـە بکرێـن. لای ئەرسـتۆ، یەکەمیـن یەکـەی سـەرەکیی نـاو کۆمەڵگـە "مەجالی تایبـەت"ە، کـە مەجالی ژیانـی خێزان و ژیانـی نـاو ماڵە. لـەم ڕووبـەرە کۆمەڵایەتییـەدا، کۆیلـە و خاوەنکۆیلـە، پیـاو و ژن، بـاوک و دایـک و منداڵان ئامـادەن. لە دیدی ئەرستۆدا، ئەمانـە هیچیـان لەگـەڵ یەکتـردا یەکسـان نیـن، بـاوک لـە پلـەی بـاڵادا، دوای ئـەوان دایـک و منداڵـەکان و ئینجـا کۆیلـەکان. لـە پەیوەندیـدا بـە کۆیلـەوە، ئەرسـتۆ بەئاشـکرایی ئـەو بۆچوونـە ڕەفـز دەکات، کـە پێـی وایـە باڵادەسـتیی ئاغـا یـان سـەروەر بەسـەر کۆیلـەدا، باڵادەسـتییەکی ناسروشـتییە و پەیوەندیـی بـە هێـز و دەسـەڵاتەوە هەیـە، واتـە ئـەو بۆچوونـە

ڕەفز دەکات، کە پێی وایە باڵادەستیی خاوەنکۆیلە بەسەر کۆیلەکەدا دیاردەیەکی سروشتی نییە.[1] ئەرستۆ کۆیلە وەک ماڵ و موڵکی خاوەنکۆیلەکە وێنا دەکات، بەڵام ئەو جۆرە لە موڵکییەتێک، کە زیندووە و وەک شتومەکەکانی تر بێگیان نییە. کۆیلە لای ئەرستۆ ئامرازە، ئامرازێکی زیندووی خاوەنکۆیلەکەیە. هەم کۆیلەکان و هەم خزمەتکاران بەشێکن لە موڵک و ماڵی خاوەنکۆیلەکە، ئەمانە ئامرازی ئیشکردن و بەرهەمهێنانن، وەک چۆن خاوەنکۆیلە خاوەنی ئاژەڵەکانیەتی، ئاواش خاوەنی کۆیلەکانیەتی.[2] بەڵام پێچەوانەی ئەمە ڕاست نییە، واتە ئەوە ڕاستە کە خاوەنکۆیلە خاوەنی کۆیلەکانیەتی، بەڵام کۆیلەکان خاوەنی خاوەنەکەی خۆیان نین. خاوەنکۆیلە کەسایەتییەکی کامڵە، بوونێکی سەربەخۆیە، بەڵام کۆیلە کەسایەتییەکی ناتەواوە، بەش و پارچەیەکە نەک شتێکی کامڵ، وەک بەشیش خاوەنی خۆی نییە و گشتێکی تر هەیە لە دەرەوەی ئەودا کە خاوەنی ئەوە، ئەو گشتەش ئاغاکەیەتی.[3] بەکورتی، ئەرستۆ ئەگەرچی دژ بە دەسەڵاتی هەڕەمەکی و گۆرەکارە، بەڵام خاوەنکۆیلەکان دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە بتوانن کۆیلەکان بەو شێوەیە بەکار بهێنن کە دەیانەوێت، چونکە ئەم بەکارهێنانە شتێکی سروشتییە، کۆیلەکان خۆیان پێیان خۆشە، خۆیان سوپاست دەکەن بۆ ئەوەی بەو شێوە سروشتییە مامەڵەیان بکەیت، چونکە ئەو مامەڵەیە مامەڵەیەکە لەگەڵ "جەوهەر"ی ئەواندا دەگونجێت.

---

١_بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم خاڵە، بڕوانە: Curtis, Micael (2008). p67.

٢ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٧.

٣ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٨.

لای ئەرستۆ، کۆیلەکان هەر لە بنەڕەتەوە و بە شێوەیەکی سروشتی هیچ مافێکیان نییە، نەک هەر ئەمە، بەڵکو خودی مافپەروەری، واتە عەدالەت، لەوەدایە کە کۆیلە وەک کۆیلە مامەڵە بکرێت نەک وەک شتێکی تر، چونکە کۆیلەکان خودا یان سروشت لە بنەڕەتەوە وەک کۆیلە دروستی کردوون. ئەرستۆ باوەڕی وایە، هەندێک کەس کە لەدایک دەبن، بۆ ئەوە لەدایک دەبن کۆیلە بن و حوکمڕانی بکرێن، هەندێکی تر بۆ ئەوە لەدایک دەبن، کە سەروەر و حوکمڕان بن. هاوکات خاوەنکۆیلە، کە لای ئەرستۆ مرۆڤێکی ئازادە، دەسەڵاتی ڕەهای بەسەر کۆیلەکەیدا هەیە، کە مرۆڤێکی نائازادە. وەک چۆن لەناو مرۆڤ خۆیدا ڕۆح حوکمڕانیی جەستە دەکات، عەقڵ حوکمڕانیی نەوس و حەز و ئارەزووی جەستەیی دەکات، ئاواش خاوەنکۆیلە حوکمڕانیی کۆیلە دەکات.[1]

ئەرستۆ دوو شێواز لە کۆیلایەتی لە یەکتری جیا دەکاتەوە. یەکەمیان کۆیلایەتیی سروشتییە، ئەوی تریان کۆیلایەتیی ناسروشتییە.

کۆیلایەتیی سروشتی ئەو جۆرەیە لە کۆیلایەتی، کە تیایدا مرۆڤ وەک کۆیلە لەدایک دەبێت، سروشتی مرۆڤەکە سروشتێکی کۆیلانەیە. ئەم جۆرە کەسانە خودا یان سروشت بە کۆیلایەتی دروستی کردوون، بۆیە جگە لە کۆیلەبوون، ناتوانن هیچ شتێکی تر بن، کەسانێکن وا دروست بوون کە لاشەیان بەهێز و گەورە بێت و بتوانن ئەو کارە جەستەییە زەحمەتانە ئەنجام بدەن کە بۆ ژیان پێویستن. سەروەر و خاوەنکۆیلەکانیش بە شێوەیەک دروست کراون، بتوانن بیر

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٨.

بکەنەوە و کاروبارە جیاوازەکانی ژیانی مەدەنی بەڕێوە ببەن.[1] کۆیلەکان کەسانێکن، "خاوەنی عەقڵێکی سەربەخۆ نین،"[2] ئەوانەی عەقڵیان سەربەخۆیە خاوەنکۆیلە سەروەرەکانن، کە خەریکی بەڕێوەبردنی ژیانی گشتین. هەرچی کۆیلەی ناسروشتییە ئەمانە ئەو کەسانەن کە بەکۆیلایەتی لەدایک نەبوون، بەڵام دواتر بۆ هۆیەکی دیاریکراو کراون بە کۆیلە، ئەمانە سروشتی کۆیلەیان نییە. ئەمانە یاسایەک یان ڕێککەوتنێک کردوونی بە کۆیلە، لەوانەش یاسای جەنگ، کە کەسی براوە لە جەنگدا دەکات بە خاوەنی دیلەکان.[3]

لای ئەرستۆ، ئەوەی مرۆڤ لە گیانلەبەرەکانی تر جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی خاوەنعەقڵە، بەڵام کۆیلە ئەو کەسەیە کە عەقڵی نییە، یان تەنها ئەوەندە عەقڵی هەیە کە بتوانێت کاردانەوەی هەبێت بەرامبەر بە کەسێکی خاوەنعەقڵ، بتوانێت لەوە تێبگات کە عەقڵ بوونی هەیە، لای خۆی نا، بەڵام لای کەسانی لە خۆی بەرزتر. بە مانایەکی تر، کۆیلە کەسێکە خۆی خاوەنی عەقڵێکی سەربەخۆ نییە، بەڵام دەتوانێت لە ئەمر و نەهییە عەقڵانییەکانی خاوەنەکەی تێبگات. ئەرستۆ تەنها کۆیلەکانی ناو کۆمەڵگەکەی خۆی بە کۆیلەی سروشتی نەزانیوە، بەڵکو پێشی وا بووە هەموو ئەوانەی تر کە یۆنانی نەبوون، کۆیلەی سروشتین.[4] بەلای

---

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٩.

٢ _بۆ ڕوانینەکانی ئەرستۆ دەربارەی کۆیلایەتی، بڕوانە:
Malcolm Heath (2008). Aristotle on Natural Slavery. Phronesis 53, 243-270

3_ Curtis, Micael (2008). p 70

٤ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٤٥.

ئەرستۆوە، هەموو ئەوانەی یۆنانی نەبوون، وەکو کۆیلەکان خاوەنی عەقڵێکی سەربەخۆ و بیرکردنەوەیەکی عەقلانیی سەربەخۆ نین، بەڵکو تەنها هەست بە دونیا دەکەن و دەتوانن لە ڕێگەی هەستەکانیانەوە پەیوەندی بە شتەکانەوە بکەن، لەمەشدا میللەتە نایۆنانییەکان وەک سەرجەمی ئەو ئاژەڵانە وان کە مرۆڤ نین.[1]

ئەم ڕوانینە ئەرستۆییە بۆ کۆیلە، وەک دیاردەیەکی سروشتی و ئەم بەستنەوەی کۆیلەبوون بە نەبوونی توانای عەقڵییەوە بۆ ماوەیەکی درێژ بەناو مێژووی مرۆڤایەتیدا بڵاو دەبێتەوە و سنووری چەندەها سەدە دەبڕێت. تەنانەت لەو سەردەمانەشدا کە کۆیلایەتی بەفەرمی هەڵدەوەشێندرێتەوە و کاری پێ ناکرێت، وەک لە سەدەی نۆزدەهەمدا، هێشتا کەسانێک هەن کە بە هەمان لۆژیکی ئەرستۆ مرۆڤەکان و میللەتەکان دابەش دەکەن. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا، لە ساڵی ١٨٥٩دا، ڕۆژنامەی نیو یۆرک دەیلی تریبیونی ئەمەریکی ڕاپۆرتێک لەسەر کۆبوونەوەیەک لە یەکێک لە شارەکانی ئەمەریکادا بڵاو دەکاتەوە، کە تیایدا باس لە مەسەلەی کۆیلایەتی کراوە و لە کۆبوونەوەکەدا بەرگری لە بوونی کۆیلایەتی کراوە. پارێزەرێکی ئەمەریکی لەناو ئەو کۆبوونەوەیەدا ئەم قسانەی سەبارەت بە کۆیلایەتی کردووە، کە کۆپییەکی بۆچوونەکانی ئەرستۆیە لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمدا: "کۆیلەبوونی ڕەشپێستان شتێکە سروشت سەپاندوویەتی، کۆیلەی ڕەش کەسێکە خاوەنی لەشێکی بەهێزە و توانای ئەوەی هەیە

---

[1] ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٤٥.

کار بکات. بەڵام هەمان سروشت، کە ئەوی وەک کەسێکی بەهێز دروست کردووە، عەقڵی لێ سەندۆتەوە، عەقڵیش پێویستە بۆ ئەوەی کەسێک بتوانێت حوکمڕان بێت، هەروەها سروشت ئیرادەشی لە کۆیلە سەندۆتەوە، ئیرادەش پێویستە بۆ کەسێک بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی بە ویستی خۆی کار بکات(چەپڵەلێدان). سروشت چونکە ئیرادەی ئەوەی بە کەسی کۆیلە نەداوە کە سەربەخۆ کار بکات، بۆیە خاوەنێک یان سەروەرێکی بۆ دروست کردووە کە بەزۆر ئیشی پێ بکات. ئەمەش بۆ ئەوەیە، ئەو ڕەشپێستە کۆیلەیە بگۆڕێت بە خزمەتکارێکی سوودبەخش و وا بکات ئەو کۆیلەیە بتوانێت بە شێوەیەکی سوودبەخش بژی، هەم بۆ خۆی و هەم بۆ ئەو ئاغایەی خاوەنیەتی. من پێ لەسەر ئەو خاڵە دادەگرم، کە ئەوە نادادپەروەری نییە ڕەشپێستێک لە هەمان ئەو دۆخەدا بهێڵیتەوە کە سروشت بۆ ئەوی داناوە، دۆخێک کە ئەو کۆیلەیە تیایدا پێویستی بە سەروەر یان ئاغایەک هەیە کە بەڕێوەی ببات و ئاراستەی بکات...“[1] وەک دەبینین، ئەمە دووبارەکردنەوەیەکی وشە بە وشەی هەمان دید و ڕوانینی ئەرستۆیە بۆ مەسەلەی کۆیلایەتی، دەیان سەدە دوای مردنی ئەرستۆ.

وەک وتم، ئەرستۆ جیاکارییەک دەکات لەنێوان دوو جۆر مرۆڤدا، ئەو کەسەی کە دەتوانێت تێبفکرێت و پێشبینی بکات

---

١_ بڕوانە: Millett, Paul (2007). Aristotle and slavery in Athens. Greece & Rome, Vol. 54, No. 2, © The Classical Association, .2007. P. 180

و دووربین بێت، لەگەڵ ئەو کەسەدا کە دەتوانێت تەنها کار بکات. یەکەمیان سەر بەوانەیە کە دەبێت حوکمڕان و سەروەر بن و دووهەمیان ئەوانەن کە کۆیلەن. یەکەمیان بە سروشت سەروەرن و دووهەمیان بە سروشت کۆیلەن.[1] بەڵام ئەگەر مرۆڤ هەژار بوو و کۆیلەی نەبوو، ئەوکات لەباتی کۆیلە، دەبێت گای هەبێت، گا بۆ هەژار، وەک کۆیلە وایە بۆ دەوڵەمەند.[2] لەسەر هەمان هێڵ، ئەرستۆ پێی وایە کۆیلە نەک تەنها خاوەنی عەقڵ و بیرکردنەوەیەکی سەربەخۆ نییە، بەڵکو پێشی وایە کەسێکە ناتوانێت چاکەکار بێت، واتە ناتوانێت خاوەنفەزیلەت بێت، کۆیلە دەبێت فێر بکرێت چاکەکار بێت و ئەمەش ئەو کارەیە کە خاوەنکۆیلەکە ئەنجامی ئەدات.[3] بەکورتی، ئەو وێنە گشتییانەی لە سەردەمی ئەرستۆدا بۆ کۆیلە لەئارادا بوون، پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت، کە کۆیلە کەسێکە بە سروشت تەمبەڵ، بەخیل، شەهوانی و هەوەسباز، ناپاک، نەفسنزم و ترسنۆک و گەمژە.[4] ئەرستۆ پێی وایە مرۆڤە ئازادەکان بۆ ئەوەی بتوانن ژیانێکی باش لەناو شار و دەوڵەتدا دروست بکەن، پێویستیان. بەوەیە سەرەتا کاروباری ناو ماڵەکەی خۆیان ڕێک بخەن. بۆ ئەم مەبەستەش، دەبێت هەم ئامرازی بێگیان و هەم ئامرازی زیندوویان هەبێت بۆ ئەنجامدانی کارەکان. ئامرازە بێگیانەکان سەرجەمی ئەو شتانەن وەک سۆپا و قاپوقاچاخ و لیفە و دۆشەک و هتد... ئامرازە گیاندار

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٨٠.
٢ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٨١.
٣ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٨٢
٤ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٨٣

و زیندووەکانیش کۆیلەکانن. ئەرستۆ کۆیلە وەک ئامرازێکی گیاندار پێناسە دەکات، کە دەتوانێت ئامرازە بێگیانەکان بەکار بهێنێت.[1] کۆیلە ئامرازە و خاوەنەکەشی بەموتڵەقی خاوەنی ئەوە، کۆیلە بەسروشتی مەیلی ئەوەی تێدایە کە کەسێکی تر خاوەنی بێت، نەک خۆی خاوەنی خۆی بێت. شێوازی ئەو ئیشانەش کە کۆیلە دەتوانێت بیانکات، تەنها کاری جەستەیی و فیزیایین، نەک کاری فیکری و هونەری و سیاسی و هتد... ئەوەشی ئەوپەڕی دادپەروەرییە، ئەوەیە کە مرۆڤەکان بەپێی سروشت و جەوهەری خۆیان مامەڵە بکرێن، کۆیلە وەک کۆیلە و خاوەنکۆیلە وەک مرۆڤێکی ئازاد و عەقڵانی و سەروەر. ئەم ڕوانینە بەناو بەشی هەرەزۆری دونیای دوای ئەرستۆ و سەدەکانی دواتری مێژووی مرۆڤایەتیدا تێدەپەڕێت. تەنها لە سەدەی هەژدەهەمدا وێناکردنێکی نوێ بۆ مرۆڤ لەدایک دەبێت، تەواو پێچەوانەی ئەم دیدە یۆنانییە ئەرستۆییە، لەم ڕوانینە تازەیەدا مرۆڤ بوونەوەرێکە بە سروشت ئازاد و خاوەنمافە و لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەدا یەکسانە. دادپەروەرییش مانای مامەڵەکردنی مرۆڤە لەسەر بنەمای ئەم وێنە تازەیە. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بەدرێژی لەسەر ئەم گۆڕانکارییە دەوەستین. بەڵام بەر لەوەی بگوازینەوە بۆ سەر ئەو باسانە، با کەمەکێک لەسەر دیاردەی هۆمۆساکەر ڕاوەستین، کە شێوازێکی تری مرۆڤبوونی بێمافە، جیا لە کۆیلە کە لە هەندێک ڕووەوە دۆخە ئینسانی و یاسایی و ڕەمزییەکەی زۆر لە خوار کۆیلەوەیە.

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٨٣

## هۆمۆساکەر: مرۆڤی بێماف و بێنرخ

هۆمۆساکەر لە سەردەمی ڕۆمانییەکاندا بەو کەسانە وتراوە کە کۆمەڵگە نەفرەتی لێ کردوون و هەموو ماف و بەها و نرخێکی لێ سەندوونەتەوە، هەرکەسێکیش ویستبێتی بیانکوژێت، لەسەر کوشتنیان تووشی هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەک نەبووە. هۆمۆساکەر هێمایە بۆ جۆرێک لە بێمافی و بێنرخیی پەرگیر و بەرفراوان. یەکێک لەو کتێبە گرنگانەی لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا نووسراوە، کتێبی "هۆمۆساکەر: *دەسەڵاتی خاوەن سەروەری و ژیانی ڕووت*"ی فەیلەسووفی ئیتالی: جیۆرجی ئاگامبنە.[1] تێزی سەرەکیی ئەم کتێبە ئەوەیە، کە مرۆڤی هاوچەرخ، مرۆڤی ناو دونیای مۆدێرن، مرۆڤێکی خاوەنماف و ئازاد نییە، بەڵکو لە مرۆڤی ناو کەمپە گەورەکانی کۆکردنەوەی تاوانباران و بیماران دەچێت، کە تیایدا دەسەڵات دەتوانێت هەموو ئەو شتانە ئەنجام بدات کە دەخوازێت ئەنجامی بدات. لای ئاگامبن، کەسایەتیی هۆمۆساکەر ئەو بابەتەیە کە دەتوانێت هاریکاریمان بکات بۆ ئەوەی بتوانین دۆخی ڕاستەقینەی مرۆڤ لە دونیای هاوچەرخدا ببینین و باس بکەین، بۆ ئەوەی لە ماناکانی ژیان لەناو کۆمەڵگەی مۆدێرندا و لە شوێن و جێی ژیانی مرۆڤ لەناو سیاسەتی ئەمڕۆدا تێبگەین.

1_ Agamben, Giorgio, Homo sacer: De soevereine macht en het naakte leven. Boom/Parrèsia, Amsterdam (2002) 1995.

دیدی ئاگامبن لەم کتێبەدا بۆ ژیان، لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا دیدێکی تەواو ڕەشبینە، بە بۆچوونی ئاگامبن، مرۆڤ لە دونیای ئەمڕۆدا دەکرێت بەئاسانی بکوژرێت، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک تاوانبار بکرێت بەو کوشتنە. ئاگامبن کە باس لە دونیای ئەمڕۆ دەکات، باس لە ئاسیا و ئەفەریقا و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ناکات، بەڵکو باس لەو وڵاتانە دەکات کە سیستمە سیاسییەکانیان دیموکراسی و سیستمە یاساییەکانیان "دەوڵەتی یاسا"یە، ئاگامبن باس لە ژیانی مرۆڤ لە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکاندا دەکات. دەکرێت ئەم کتێبەی ئاگامبن بەئاسانی لەپاڵ ڕۆمانەکانی کافکا و لەپاڵ ڕۆمانی "١٩٨٤"ی جۆرج ئۆرویڵدا دابنێین، وەک ئەوان، ئەمیش هەڵگری دیدێکی تەواو ڕەشبینە بەرامبەر بە دونیای ئەمڕۆ. تێزی سەرەکیی کتێبەکەی ئاگامبن ئەمەیە: کەمپی کۆکردنەوەی جوولەکەکان، یان کەمپ بەگشتی، نامرۆڤانەترین ڕووبەر و دۆخێکی ژیانە، کە مرۆڤ بەدرێژاییی مێژووی خۆی ئەزموونی کردبێت. ئەم کەمپانە چوارچێوەیەکی یاسایی تایبەتیان هەیە، مرۆڤەکان لەوە دەخەن مرۆڤی خاوەنماف بن. بە بۆچوونی ئاگامبن، ئەم چوارچێوە یاساییانە کە مرۆڤ بێماف دەکەن، هەمان ئەو چوارچێوە سیاسییانەن کە ئەمڕۆ کۆمەڵگە مۆدێرنەکان لەناویاندا دەژین. لە دیدی ئاگامبندا، ئەوەی ئەمڕۆ چوارچێوە سەرەکییەکانی ژیانی کۆمەڵگە مۆدێرنەکان دەستنیشان دەکات "پەیمانی کۆمەڵایەتی" نییە، کە لەسەر بیرۆکەی ماف دروست بووە، بەڵکو ئەو چوارچێوە یاساییانەیە کە حوکمی کەمپە گەورەکانی کوشتن و وێرانکردنی مرۆڤ دەکەن. هۆمۆساکەر باس لە یاسا، باس لە سیاسەت، باس

لە جێنەکردنەوەی مرۆڤ، بەتایبەتی باس لە ژیان و مرۆڤ لە دونیای هاوچەرخدا.[١]

یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی کتێبەکە هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە "ئەوشفیتز،" ئەوشفیتز کەمپێکی گەورەی کۆکردنەوەی جوولەکەکان بوو لە پۆڵەندا، کە ژمارەیەکی گەورەی جوولەکەی تیادا کوژرا و یەکێک لە ئامرازەکانی کوشتن لەو کەمپەدا بەکارهێنانی غازی ژەهراویی بوو. وەک نووسەری هۆڵەندی: ئانکە سنوک دەڵێت، ئەوشفیتز بە زیاد لە شێوازێک لێک دراوەتەوە و باس کراوە، لەوانەش وێناکردنی ئەوشفیتز وەک نهێنیی لایەنە خراپەکار و شەیتانییەکانی مرۆڤ، وەک کۆتاییهێنان بە باوەڕبوون بە خودا و بە مرۆڤ، وەک کۆتاییی مۆدێرنە و کۆتاییی باوەڕبوون بە عەقڵی مرۆڤ و مەسەلەی پێشکەوتن. بەڵام لێکدانەوەی ئاگامبن بۆ ئەوشفیتز لەمانە جیاوازە، بەلای ئاگامبنەوە، ئەوەی لە کەمپەکانی ئەوشفیتزدا ڕوو ئەدات، تەنها لادان و پێشێلکردنی یاسا نییە، خراپەکاری نییە بە مانا یاساییەکەی، بەڵکو هەلومەرجێکی نائینسانییە، کە لە هەموو مێژوودا لە خراپیدا وێنەی نییە، هەلومەرجێکی نائینسانیی بێوێنەیە کە گۆڕاوە بە واقیع و بە بەشێکی سەرەکیی ژیان لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا. ئاگامبن دەڵێت، لەباتی ئەوەی پێناسەی ئەم کەمپانە لە ڕێگەی ئەو ڕووداوانەوە بکەین کە لەناو کەمپەکاندا ڕوویان داوە، پێویستە ئەم پرسیارە لە خۆمان بکەین: کامپ چییە؟ ئەو بوونیادە یاسایی و سیاسییە کامەیە کە ئەم ڕووداوانە توانییان لە

---

١ _بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە، بڕوانە ئەم تێزی دکتۆرایە بە زمانی هۆڵەندی: بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

چوارچێوەیاندا ڕوو بدەن؟ ئەمەش بەلای ئاگامبنەوە مانای ئەوەی کە "کەمپ" لای ئەو ڕووداوێکی مێژوویی تێپەڕ یان ڕووداوێکی "دەگمەن" و "شاز" نییە، بەڵکو وەکو ماتریکسێکی شاراوە، وەک نۆمۆس، یان یاسا و بەهای ئەو ڕووبەرە سیاسییە ئامادەیە، کە ئێمە هێشتا لەناویدا دەژین.[1] لای ئاگامبن، ئەوشفیتز، یان کەمپی کۆکردنەوە و کوشتنی جوولەکەکان، کۆتایی مۆدێرنە نییە، بەڵکو بەرجەستەکردن و نیشاندانێکی تەواوی ئەو بونیادە سیاسییەیە کە مۆدێرنە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی. کەمپەکان ڕووبەرێکی سیاسیی شاراوەن، کە بەردەوام دەر دەکەونەوە و دەیانبینین، جارێک لە کەمپی پەناهەندەکاندا، جارێک لە زیندانەکاندا، جارێک لە خەستەخانەکاندا، هتد... ئەو وێناکردنەش کە ئاگامبن بۆ مرۆڤی مۆدێرنی ناو ئەو بونیادە سیاسییانە هەیەتی، وێناکردنی مرۆڤە وەک هۆمۆساکەری ناو دونیای کۆن. بەکورتی، یەکەی سەرەکیی شیکردنەوەی دونیای مۆدێرن لای ئاگامبن، "کەمپ" و "هۆمۆساکەر"ە. ئەم دیدەی ئاگامبن بۆ دونیای مۆدێرن، زۆر جار وەک "موبالەغەیەکی مەلحەمی" ناو دەبرێت، epische overdrijvingen.[2] بەلام هێشتا قابیلی سوودلێوەرگرتنە بۆ بینینی بڕێک لە کێشە سیاسی و یاسایی و ئینسانییەکانی ناو دونیای ئەمڕۆ. هۆمۆساکەر ئاماژە بۆ جۆرێک لە وێناکردنی مرۆڤ و بۆ هەلومەرجێکی تەواو نائینسانی دەکات، کە لە دونیای ئەمڕۆدا ئامادەن. مرۆڤگەلێک، کە هیچ ماف و نرخێکیان نییە.

---

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨

٢ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨

مەبەستی من لە گەڕانەوە بۆ کەسایەتیی هۆمۆساکەر، کەمتر باسکردنی تێزەکەی ئاگامبنە و زیاتر دەمەوێت هێما بۆ بوونی جۆرێک لە بێمافیی ڕەها بکەم لە دونیای کۆندا هەبووە و چەمکی "هۆمۆساکەر" ئەو دۆخە بەوردی بەرجەستە دەکات. ئاگامبن چەمکی هۆمۆساکەر وەک چەمکێکی مێژوویی مامەڵە ناکات، واتە ئەو وا ناڕوانێتە کەسی هۆمۆساکەر وەک ئەوەی بەشێک بێت لە مێژوویەکی دێرین، بەڵکو وەک پارادایمێک مامەڵەی ئەم چەمکە دەکات، کە نهێنییەکانی ژیانی مرۆڤمان لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا نیشان ئەدات. ئاگامبن لەناو چەمکی هۆماساکەردا کۆمەڵێک دیاردە کۆ دەکاتەوە، کە دەیەوێت بە هۆیانەوە لە بونیادی دونیای ئەمڕۆ و چوارچێوە مێژووییەکانی ئەو دونیایە تێبگات. بەکورتی، مەبەستی ئاگامبن دروستکردنی پارادایمێکە بۆ قسەکردن لەسەر ژیانی مرۆڤ لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا، دروستکردنی مۆدێلێکی فیکرییە بۆ لێکدانەوە و تێگەیشتن لەوەی لەمڕۆدا ڕوو دەدات. چەمکە سەرەکییەکانی تری ناو ئەم پارادایمە، بریتین لە چەمکەکانی "ژیانی ڕووت،" "دۆخی ناکاو،" "ژیانێکی قابیلی کوشتن،" "سەروەری" و "کەمپ." ئەوەی من دەمەوێت لێرەدا سەرنجی خوێنەری بەلادا ڕابکێشم، فیکری ئاگامبن و ئەو پارادایمە نییە کە بۆ تێگەیشتن لە دونیای مۆدێرن بەکاری دەهێنێت، چونکە پێم وایە ئەم تێزە موبالەغەیەکی هێجگار گەورەی تێدایە، کاتێک ژیان لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا وەک ژیان لەناو کەمپەکانی کوشتندا وێنا دەکات. ئەوەی من دەمەوێت ئاماژەی بۆ بکەم، بوونی جۆرێکە لە ژیان و جۆرێک لە مرۆڤ لە کۆمەڵگە

دێرینەکاندا، کە هیچ مافێکیان نەبووە و هیچ یاسا و نۆرم و بەهایەک نەیتوانیوە ژیانیان بپارێزێت، مرۆڤێک کە نەک تەنها هیچ جۆرە یەکسانییەکی لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا نەبووە، بەڵکو هیچ یاسایەکیش نەیتوانیوە لە کوشتن بیپارێزێت.

ئاگامبن لە لاپەڕەی ٨١ی کتێبەکەیدا، هۆمۆساکەر لە دونیای ڕۆمانییە کۆنەکاندا بەم شێوەیە پێناسە دەکات: "هۆمۆساکەر ئەو کەسەیە کە لەلایەن خەڵک یان کۆمەڵگەوە بە ئەنجامدانی تاوانێک تاوانبار کراوە، ئەم کەسە ناتوانرێت بکرێت بە قوربانی، بەڵام هەرکەسێکیش بیکوژێت لەسەر ئەو کوشتنە هیچ لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت."[1] ئاگامبن لێرەدا ئاماژە بۆ جۆرێک لە مرۆڤ دەکات، کە کۆمەڵگە وەک تاوانبار وێنای دەکات و هەرکەسێکیش بیکوژێت، تووشی هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەک نابێت. ئەم کەسە کە بە هۆمۆساکەر ناو براوە، هەموو مافێکی دۆڕاندووە و تەنها خاوەنی "ژیانێکی ڕووت"ە، ژیانێک بەبێ هیچ نرخ و بەهایەک، ژیانێکی بێمانا و گلاو، سووک، ژیانێک بکرێت بەئاسانی وێران بکرێت و لەناو ببرێت. ئەم جۆرە مرۆڤە ئەوانە بوون لەلایەن کۆمەڵگەوە بەنەفرەت کراون، ڕاستە ژیانیان لەناو کۆمەڵگەدایە، بەڵام خۆیان بەتەواوی کراونەتە دەرەوەی کۆمەڵگەوە، ئەمانە لەناو کۆمەڵگەدان، بەڵام بەبێ ئەوەی بەشێک بن لە کۆمەڵگە، ئامادەن لەپاڵ ئەوانی تر و لە بەردەمی دەزگاکاندا، بەڵام بەبێ ئەوەی بەشێک بن لە یاساکان و نۆرمەکانی ناو ئەو کۆمەڵگەیە، یان بەبێ ئەوەی بەشێک بن لە دەزگاکان و خواستەکان و بەڵێنەکانی ئەو کۆمەڵگەیە. ئەمانە جۆرە مرۆڤێکن، بە

---

١_بڕوانە: Agamben, Giorgio, Homo sacer. ل٨١

شێوەیەک بەنەفرەت کراون نە یاساکانی خودا و نە یاساکانی مرۆڤ ناتوانێت بیانپارێزێت و ژیانیان لە "ژیانێکی ڕووت"ەوە بۆ ژیانێکی کۆمەڵایەتی بگوازێتەوە.[1] هۆمۆساکەر دەکرێت بکوژرێت، هەرکەسێک بیەوێت دەتوانێت بیانکوژێت، بەڵام مەرج نییە ئەم توانایە بە کردەوە پیادە بکرێت، واتە مەرج نییە بکوژرێت. ئەوەی لە ژیانی ئەم جۆرە مرۆڤەدا مەرجە، کوشتن نییە، بەڵکو بێنرخکردنێکی تەواوی ژیانی ئەو کەسەیە، بە جۆرێک، بوون و نەبوونی وەک یەک بێت. نە ژیانی مانای هەبێت، نە مردنی، بە مانایەک لە ماناکان، ئەو زیندوویەکی مردوو بێت.[2] هۆمۆساکەر هەڵگری "ژیانێکی ڕووت"ە، کە هیچ شتێک نایپارێزێت، نە یاسا و نە ماف و نە ئەخلاق، هەمیشە لە بەردەم هەڕەشەی مردندایە. مرۆڤی هۆمۆساکەر کەسێکە چیتر ژیانێک لەناو جەستەیدا ئامادە نییە کە نرخ و مانای هەبێت، بۆیە خۆشی دەبێتە کەسێکی بێنرخ و بێمانا و دەکرێت کێ بیەوێت بیکوژێت و لەناوی ببات.

تێزەکەی ئاگامبن ئەوە نییە کە لە دونیای مۆدێرندا و لەناو چوارچێوەکانی دەوڵەتی یاسای وڵاتانی خۆرئاوادا هێشتا نموونەی هۆمۆساکەر ئامادەیە، بەڵکو ئەوەیە هەموو سیستەمەکە لەسەر دروستکردنی هۆمۆساکەر کار دەکات. زیندانی ئەبوغرێب، گوانتانامۆ بێ، کەمپی پەناهەندەکان، تەنانەت دۆخی پیران و پەککەوتەکان لەناو خەستەخانەکان و شوێنەکانی کۆکردنەوەیاندا، هەموویان هێما بۆ ئەم

---

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٩٢.

2_ Snoek, Anke (2006). Wat rest de mens? over Agambens naakte leven van de homo sacer. Univeriteit voor Humanistie. P. 60.

دۆخە مۆدێرنەی مرۆڤی هۆمۆساکەر دەکەن. مەبەستی من لە گەڕانەوە بۆ چەمکی هۆمۆساکەر، ئاماژەکردنە بۆ جۆرێکی ڕادیکاڵ و پەڕگیر لە بێمافی، کە توانا و ئەگەری کوشتنی بێلێپرسینەوە دەبەخشێت بەوانەی بیانەوێت کەسە بێمافەکان بکوژن. ئەم بێمافییە لە زۆر ڕووەوە لە دۆخی کۆیلایەتی خراپترە. کوشتنی کۆیلە مافێک نییە هەرکەسێک بیەوێت بتوانێت پیادەی بکات، لانی کەم خاوەنکۆیلەکە لێی دەپرسێتەوە. بەڵام لە دۆخی هۆمۆساکەردا کەسێک نەک تەنها دەکەوێتە دەرەوەی کۆمەڵگە و پەیوەندییەکان و یاساکان و بەهاکانەوە، بەڵکو ژیانیشی دەبێتە ژیانێکی بێنرخ و بێمانا و هەرکەسێک بیەوێت دەتوانێت کۆتایی پێ بهێنێت.

هۆمۆساکەر لە سەردەمی ڕۆمانییەکاندا نەک تەنها مافی یەکسانیان لەگەڵ کەسانی تری ناو کۆمەڵگەدا نییە، بەڵکو مافی بەرگریکردنیشیان لە خۆیان و لە لەشی خۆیان نییە، مۆرڤگەلێکن پێگە مرۆییەکەیان لە خوار پێگەی کۆیلەکانەوەیە.

## مافی خودایی

مەسەلەی بوونی ماف لە مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا بەتوندی گرێ دراوە بە مەسەلەی حوکمڕانییەوە، لە مێژوودا ماف بەر لەوەی بە مرۆڤ و کۆمەڵگەوە گرێ درابێت، بە حوکمڕانان و دەسەڵاتدارانەوە گرێ دراوە. ڕەنگە یەکەمین دیالۆگ و گفتوگۆیەک سەبارەت بە مافیش لە مێژوودا ڕووی دابێت، ئەو دیالۆگانە بێت کە پەیوەستن بە مافی

پادشـاکانەوە. پرسـیارە سـەرەکییەکانی نـاو فیکـری سیاسـی و ئەخلاقیـی دونیـای کـۆن، پرسـیارن دەربـارەی دەسـەلاتی پادشـاکان نـەک دەربـارەی دەسـەلاتی کۆمەڵگـە: ئایـا پادشـا بـە نـاوی کێـوە حوکمڕانـە؟ نوێنەرایەتیـی چـی و کـێ دەکات؟ بنەماکانـی ڕەوایەتیـی دەسـەلاتی پادشـا لـە چیدایـە؟ ئـەم پرسـیارانە پرسـیاری نـاو فیکـر و فەلسـەفە و بیرکردنـەوەی سیاسـیی دونیـای کۆنـن. یەکێـک لـە وەلامـە هـەرە سـەرەکی و بالادەسـتەکان تـا سـەدەی حەڤدەهەمیـش، ئـەو وەلامەیـە کـە لەژێـر نـاوی "مافـی خودایـی"دا ناوبانگـی دەر کـردووە. بەپێـی ئـەم ڕوانینـە، پادشـا پێویسـتە دەسـەلاتی ڕەهـای هەبێـت و سەروەرییەکەشـی سـەروەرییەکی ڕەها بێت. ئەمەش لە دونیای کۆنـدا یـەک مانـای هەبـووە، پادشـا لـە سـەرووی یاساکانەوەیە. دەسـەلاتی پادشـا دەسـەلاتێکە خـودا پێـی بەخشـیوە و خـودی پادشـا خۆشـی تەنهـا لـە بـەردەم خـودا و ویـژدان و عەقڵـی خۆیـدا بەرپرسـیارە. لـەم ڕوانینـەدا پادشـا بـە نـاوی خـوداوە یـان بـە نـاوی دینـی خـوداوە حوکمڕانـی دەکات و کـەس مافـی ئەوەی نییـە ڕەخنـە لـەو دەسـەلاتە بگرێـت، چ جـای ئـەوەی مافی ئەوەی هەبێت ئەو دەسـەلاتەی لـێ بسـێنێتەوە. ڕەنگە باشـترین نموونەیـەک کـە جەوهـەری ئـەم پادشـایەتییە نیشـان بـدات، ئـەم قسـانە بێـت کـە جێمسـی یەکـەم لـە بـەردەم پادشـای بەریتانیـادا لـە سـاڵی ١٦٠٩دا دەیانـکات: "دەوڵەتـی پادشـایەتی بالاتریـن دەسـەلاتە لەسـەر زەوی: چونکـە پادشـاکان تەنهـا ئەفسـەرەکانی خوداوەنـد نیـن لەسـەر زەوی، کـە لەسـەر تەختەکـەی خـودا خۆی دانیشـتوون، بەڵکـو تەنانـەت خوداوەنـد خۆشـی پادشـاکان

بە خودا ناو دەبات."[1] ئەم یەکسانکردنەی پادشا بە خودا، یان بە نوێنەر و جێنشینی خودا، یان بە نوێنەری دینی خودا، بەشێکە لە کەلەپوورێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی گەورە، کە لە زۆربەی بەشە جیاوازەکانی دونیای بەر لەدایکبوونی دونیای مۆدێرندا ئامادەیە. دونیایەکی عەقڵی و سیستمێک لە گوتار ژێرخانی ئەم ڕوانینە دەستنیشان دەکەن، کە بەشێکی بنەڕەتیی دونیای بەر لەدایکبوونی مۆدێرنەیە، لە بەشە جیاواز و لێکدوورەکانی جیهاندا.

ئەم دەسەڵاتدارێتییە لەپاڵ مافی خوداییدا نەک تەنها ڕەها بووە، بەڵکو هەمیشەییش بووە و بە مردنی پادشاکان گواستراوەتەوە بۆ نەوەکانیان. ئەم گواستنەوەیە لە باوکەوە بۆ کوڕ و لە نەوەیەک لە دەسەڵاتداری پیرەوە بۆ نەوەیەکی گەنج، بەڵام لەناو هەمان خێزان و بنەماڵەی سیاسیدا. ئەم گواستنەوە بەرتەسکەی دەسەڵات لەناو یەک خێزاندا ئەو هەستە دروست دەکات کە ئەم دەسەڵاتە "دەسەڵاتێکی بێزەمەنە" یان "دەرەکات"ە، تێپەڕینی کات دەموچاوەکان دەگۆڕێت، بەڵام دەستکاریی یاساکان و شەرعیەت و بونیادەکانی دەسەڵات ناکات. کات لێرەدا کاتێکی بازنەییی داخراوە و شتێک بە ناوی "پێشکەوتن" و "گۆڕانکاریی"ەک، کە دووبارەبوونەوە نەبێت، بوونی نییە. ئاکارێکی تری دەسەڵات لەپاڵ "دەرەکات"بووندا بریتییە لە ڕەهابوون، ڕەهابوون بە مانای پیادەکردنی دەسەڵاتێک کە بێلەمپەر بێت

---

١_ بڕوانە: Burgess, Glenn (1992).The Divine Right of Kings Reconsidered. The English Historical Review, Vol. 107, No. 425 (Oct., 1992), p837.

و بە هیچ مەرجێکەوە گرێ نەدرابێت، بوون و بەردەوامبوونی ئەو دەسەڵاتدارێتییە خۆی سەرچاوەی ڕەوایەتییەکەی خۆشی بێت. تێکەڵبوونی ئەم دوو ئاکارە بە یەکتری، واتە تێکەڵبوونی ئاکاری "دەرەکات"ی و "ڕەهایی" بە یەکتری، ئاکارێکی تر بەم دەسەڵاتە دەبەخشێت، کە ئاکاری پیرۆزبوونە. دەسەڵاتی خودایی دەسەڵاتێکی موقەدەسە و قابیلی هیچ جۆرە لێپرسینەوە و ڕەخنەکردنێک نییە و ئەو ڕیزبەستن و هیرارکیەتەش کە دروستی دەکات، دیسانەوە ئاکارێکی موقەدەسی هەیە. لەپاڵ ئەم مۆدێلەدا لە دەسەڵات مرۆڤەکانیش بۆ دوو شێوە دابەش دەکرێن، مرۆڤە پیرۆزەکان و مرۆڤە ئاساییی و ناپیرۆز و ڕۆژانەییەکان. ئەم بەپیرۆزکردنەی دەسەڵاتدار و دەسەڵات ئەو بنەمایەیە کە ماف بە پادشا دەبەخشێت بتوانێت ئەمر بەسەر هەمووان‌دا بکات، بەڵام ئەو ئەمری لە هیچ کەسێکەوە بەسەردا نەکرێت. پادشا لێرەدا تەنانەت لە سەرووی ئەو یاسایانەشەوەیە کە خۆی دەریان دەکات، چونکە یاساکان بۆ دانانی سنوورە بۆ ئەوانی تر، نەک بۆ کەسی پادشا خۆی کە سەروەرییەکی خوداییە. یاسا لێرەدا ئیمتیازێکە لە ئیرادەی پادشاوە لەدایک دەبێت، دەستوور یان دەزگا و بازنە جیاوازەکانی ناو دەسەڵات، گەر هەبن، هەموویان بەشێکن لە حەزی پادشا بۆ دروستبوونی ئەو شتانە، نەک ئەوەی ویست یان حەز یان خواستی کۆمەڵگە بیانسەپێنێت. لە تیۆری مافی خوداییدا شتێک بە ناوی "کۆمەڵگە"وە لە ئارادا نییە، ئەوەی هەیە پادشایەکی پیرۆزە بەرامبەر بە حەشامەتێکی ناپیرۆز، خوداش مافی ئەوەی بە پادشا بەخشیوە ئەم حەشامەتە حوکمڕانی بکات. ئەم جۆرە دەسەڵاتە داوای

گوێڕایەڵییەکی تەواو و بێمەرج لە هەموو ئەوانە دەکات کە دەکەونە ناو سنوورەکانیەوە. هەندێک جار تاقە شتێک توانیبێتی سنوورێک بۆ دەسەلاتی پادشاکان دابنێت، "یاسا سروشتییەکان" و "یاسا خوداییەکان" بووە، بەلام کێشەکە لەوەدا بووە، پادشا خۆی توانیویەتی پێناسە و دەستنیشانی ئەوە بکات، ئەم یاسا سروشتی و خوداییانە چین و کامانەن و ئەمر و نەهییەکانیان چۆنن.[1] هەموو بەگژاچوونەوە و یاخیبوونێکیش لە پادشا، وەک گوناهکردن بەرامبەر بە خودا وێنا کراوە.[2]

وەک وتم، ئەم ڕوانینە بۆ دەسەلات لە قۆناغی بەر لە مۆدێرنەدا لە زۆربەی مێژووی مرۆڤایەتیدا ئامادە بووە. لە دونیای ئیسلامیشدا مەسەلەی حوکمڕانیکردن لەم هێڵە گشتی و سەرەکییە تێنەپەڕیوە، ڕاستە شتێک هەبووە ناوی شەریعەت بووە و چاوەڕوانی ئەوە کراوە سوڵتان یان پادشا یان خەلیفە ئەو شەریعەتە پیادە بکات، بەلام چۆنێتیی لێکدانەوە و تەفسیرکردنی ئەو شەریعەتە و چۆنێتیی پیادەکردن و پیادەنەکردنی پابەستی ویست و ئیرادەی سوڵتان بووە. تەکنیکی سەرەکیی بەخشینی ڕەوایەتی بە سوڵتان لە دونیای ئیسلامدا تەکنیکی "بەیعە" بووە، بەیعەش ئەوەندەی شانۆیەکی سیاسی بووە، ئەوەندە هەڵبژاردن و ڕادەربڕینێکی ڕاستەقینەی کۆمەڵگە دەربارەی سوڵتان یان خەلیفە نەبووە. وەک ئیبن خەلدون نیشانی ئەدات، بەیعە بە هیچ مانایەک هەڵبژاردن نییە، بەڵکو "بەڵێندانە بە گوێڕایەڵیی تەواو،" بە

---

١_ Curtis, Micael (2008). ل٢٠١-٢٠٢

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٠٢.

عەرەبی، "عهد علی الطاعه."[1] بەڵێندان بە وەلا و دڵسۆزی و گوێڕایەڵی و تەسلیمبوونی ڕەها بە سوڵتان. ئەگەرچی تیۆری مافی خودایی لە دونیای ئیسلامدا لاواز یان نەبووە، بەلام پیادەکردنی دەسەلات لەم دونیایەشدا بە هەمان ئاقاری تیۆری دەسەلاتی خوداییدا تێپەڕیوە. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بەدرێژی لەسەر چەمکی "بەیعە"ی ئیسلامی و پەیوەندیی ئەم چەمکە بە مەسەلەی "پەیمانی کۆمەلایەتی"یەوە دەوەستین.

لەم ڕوانینەدا بۆ دەسەلات، مەسەلەی سەروەری شتێکە پەیوەندیی بە کەسی پادشاوە هەیە، سەروەری لەناو کەسایەتی یان لەناو لەشی پادشا خۆیدا ئامادە و بەرجەستەیە، سیستەمە سیاسییەکە خۆشی وەک سیستمێکی بێخەوش وێنا کراوە، کە قابیلی ڕەخنەکردن و دەستکاریکردن نییە. ئەم تیۆرەیە بە پلەی یەکەم تیۆرەی "واجب" یان "ئەرک"ە نەک ماف، ئەرکی گوێڕایەڵیی کۆمەڵگە و مرۆڤەکان لە پادشا و ئەرکی گوێڕایەڵیی پادشاش لە خودا.[2] ئەم ڕوانینە بۆ دەسەلاتداریتیی سیاسی و مافەکانی پادشا ماوەیەکی درێژ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بەردەوام بووە و بەشێکیش بووە لە کۆمەڵگەیەک، کە کۆمەڵگەیەکی هیرارکیی پڕ جیاوازی و نایەکسانی و بێمافی بووە. لەگەڵ تازەبوونەوەی دونیا و تازەبوونەوەی ڕوانینەکانی مرۆڤدا بۆ خۆی و بۆ سیستمی حوکمڕانی، کۆمەڵێک گۆڕانکاریی گرنگ دێتە کایەوە، کە تیایدا مەسەلەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف دێتە کایەوە. لێرەدا کە دەستەواژەی مرۆڤ بەکار دەهێنم،

---

١ _بڕوانە: عبدالله حمودی (٢٠٠٠). الشیخ والمرید. دار توبقال، ص٧٢.

٢ _(Burgess, Glenn (1992 ل٨٢٩.

مەبەستم مرۆڤێکی تایبەت، یان مرۆڤێکی سەر بەم چین یان توێژ یان گروپی کۆمەڵایەتی و دینی و ئەتنی و فەرهەنگی نییە، بەڵکو مەبەستم مرۆڤە بە مانا گشتی و ئەبستراکتەی. لەدایکبوونی ئەم شێوازە لە مرۆڤی گەردوونیی ئەبستراکت و گشتی و لەدایکبوونی کۆمەڵێک ماف کە بەم مرۆڤە گشتییەوە گرێ دراوە، دوا دەکەوێت بۆ سەدەی هەژدەهەم. لەو سەردەمەدا وێنەیەک بۆ مرۆڤ لەدایک دەبێت، تەواو جیاواز لە وێنە کۆنەکان و پادشا و دەسەڵاتدارانیش هێدی هێدی لە پلە خودایی و پیرۆزەکانی خۆیان دەهێندرێنە خوارەوە و ئەوانیش دەکرێنەوە بە مرۆڤ. تیزی "مافی سروشتی"ی مرۆڤەکان ڕۆڵێکی گرنگ لەم گواستنەوە گەورەیەدا دەبینێت.

## مافی سروشتی

بە شێوەیەکی گشتیی "مافی سروشتی" ئەو مافە گشتییانەن کە سروشت بە مرۆڤی وەک مرۆڤ بەخشیوە، ئەمانە کۆمەڵێک مافن مرۆڤ هەیەتی بەبێ گوێدانە پاشخانی کولتوریی دینی و ئەتنی و نەتەوەی و چینایەتییەکانیەوە، هەروەها پابەستیش نین بە بوونی ئەم یان ئەو سیستەمی داوەری و یاسایی تایبەتەوە، یان بوونی ئەم یان ئەو سیستەمی سیاسییەوە. مافی سروشتی ئەو مافەیە کە پابەستە بە بوونی ئینسانەوە وەک ئینسان، مافێکە بە ئینسان بە مانا ئەبستراکت و گشتی و گەردوونییەکەی دەدرێت، پەیوەستە بە "جەوهەر"ی گریمانکراوی ئینسانەوە وەک ئینسان. لەم ڕوانینەدا مرۆڤ

مـادام مرۆڤـە، ئیتـر گرنـگ نییـە منداڵـی چ دیـن و فەرهەنـگ و نەتـەوە و چیـن و توێـژ و ئەتنیەتێکـە، خاوەنـی کۆمەڵێـک مافـی سروشـتی و بنەڕەتییـە کـە ناکرێـت لێـی بسـێنرێتەوە و پێشـێل بکرێـن. هەندێـک سـەرەتای بچووکـی ئـەم شـێوازە لـە بیرکردنـەوە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی ڕواقییەکانـی نـاو یۆنـان stoics، بـەڵام تەنهـا لـە سـەردەمی ڕیفۆرمـی پرۆتێسـتانیزم و بەتایبەتـی لـە سـەردەمی ڕۆشـنگەریدا دەبێـت بـە ڕوانینـی باڵادەسـت. بەرگریکردنـی پرۆتێسـتانییەکان لـە "ئازادیـی ویژدان،" کە لای ئەوان یەکسـانە بە ئازادیی دین، هەنگاوێکی گرنگە لە چەسپاندنی ئەم تیۆرەیـەدا لە قۆناغی ڕۆشـنگەریدا. ئـەو مافـە سروشـتییانەش کـە هەمـوو مرۆڤێـک وەک مـرۆڤ هەیەتـی، بریتیـن لـە مافـی ژیـان و مافـی ئـازادی و مافـی هەبوونـی موڵکیـەت. دواتریـش تۆمـاس جێفرسـۆنی ئەمەریکـی مافێکـی تـری بـۆ زیـاد دەکات کە مافـی "گەڕان و بەدەسـتهێنانی بەختەوەری"یـە. کـە وا بـوو، بەپێـی ئـەم تێـزە تازەیـە، مـرۆڤ بوونەوەرێکـە مافـی ئـەوەی هەیـە بـژی و کـەس بـۆی نییـە بیکوژێت یـان لەنـاوی ببات، هەروەهـا مافی ئـەوەی هەیـە ئازاد بێـت و ئـەوەی بـە ڕاسـتی دەزانێـت بتوانێـت بینووسـێت و بیڵێت و پیـادەی بـکات، هەروەهـا مافـی ئـەوەی هەیـە موڵـک و ماڵـی هەبێـت و کـەس بـۆی نەبێـت لێـی زەوت بـکات، ئەمـە جگـە لـە مافـی ئـەوەی کـە بتوانێـت بـەدوای بەختـەوەریی خۆیـدا بگەڕێـت و وەدەسـتی بهێنێـت.

لـە سـەردەمی ڕۆشـنگەریدا ئـەم مافانـە دەبـن بـە کۆمەڵێـک مافـی سـەرەتایی و بنەڕەتـی، کـە هیـچ کـەس و لایەنێـک، بەتایبەتـی هیـچ حکومەتێـک، نەتوانێـت دەسـتیان بـۆ ببـات و

پێشێلیان بکات. وەک دەبینین چەمکی "سروشت" لە "مافی سروشتی"دا چەمکێکی هێجگار گرنگە، چونکە بوونی ئەم مافانە بۆ مرۆڤ دەخاتە بەر لە دروستبوونی کۆمەڵگەوە، گرێدانەوەی ئەم مافانە بە سروشتەوە مانای ئەوەیە ئەم مافانە لە هیچ کۆمەڵگەیەکدا ناکرێت پێشێل بکرێن، چونکە ئەو مافانە مافێک نین کۆمەڵگە بیبەخشێت، یان دین یان حکومەت یان چین و توێژێکی دیاریکراو یان سیستمێکی سیاسیی دیاریکراو، یان فەرهەنگ و ڕەگەز و جێندەر و تەمەنێکی تایبەت، بەڵام کۆمەڵێک مافن، سروشت دەیانبەخشێت، پەیوەندیی بە مرۆڤەوە هەیە وەک "بوونەوەرێکی سروشتی" نەک بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی.[1] لەم ڕوانینەدا سروشتیش پێدراوێکی سەربەخۆ و سەرەتاییە و دەکەوێتە پێش هەموو ئەو شتانەوە کە مرۆڤ دواتر دروستیان دەکات، لە دروستکردنی کۆمەڵگەوە بۆ دروستکردنی دەوڵەت و لەوانیشەوە بۆ دروستکردنی دین و فەرهەنگ. بەڵام هەندێک نووسەر "مافی سروشتی"یان بە خوداوە گرێ داوە و پێیان وایە خودا کە مرۆڤی دروست کردووە بە کۆمەڵێک مافەوە دروستی کردووە، بۆیە هیچ کۆمەڵگەیەک و هیچ کولتوور و فەرهەنگ و حکومەتێک بۆی نییە ئەو مافانەی لێ بسێنێتەوە. لە هەموو ئەم دۆخانەدا ئەم مافانە مافی گەردوونین و مرۆڤ خاوەنیانە، گرنگ نییە لە چ شوێن و جێیەکی ئەم دونیایەدا دەژی و دەمرێت. بەم مانایە "مافە سروشتییەکان"

---

١ ـ بۆ گرنگیدان بە تیۆرەی "مافی سروشتی" لە فیکری سیاسی و فەلسەفیی سەدەی بیستەمدا بڕوانە:
Nozick, Robert (1974). Anarchy, State and Utopia. New York: Basic Books.

مافی بەر لە دروستبوونی سیاسەتن و ئەرکیشیان ئەوەیە کە نەهێڵن سیاسەت وێران یان پشتگوێ یان پێشێلیان بکات.[1] با لێرەدا کەمەکێک لەسەر ڕوانینی دوو کەس لە تیۆریستە گەورەکانی لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن بوەستین و بزانین بە چ شێوەیەک چەمکی "مافی سروشتی" بەکار دەهێنن، مەبەستم لەوانە تۆماس هۆبز و جۆن لۆکە.

هۆبز لە کتێبی *Leviathan*دا وێنەیەک بۆ مرۆڤی ناو سروشت یان "مرۆڤی سروشتی" پێشنیار دەکات کە خاوەنی مافە. هۆبز باوەڕی وایە هەموو مرۆڤێک لە دۆخی سروشتیدا، کە دۆخی بەر لە دروستبوونی کۆمەڵگەیە، خاوەنی هەندێک "ماف"ی سروشتییە، لەوانەش مافی پاراستن و مانەوەی خۆی، مافی بەدەستهێنان و پاراستنی سوود و قازانجی تایبەت.[2] لە تیۆرەی مافی سروشتیی هۆبزیدا وێناکردنێک بۆ مرۆڤی سروشتی یان مرۆڤی ناو سروشت یان "جەوهەر"ی مرۆڤ هەیە، وەک بوونەوەرێکی تاک و تەنها و سەربەخۆ، مرۆڤ لەم دۆخەدا بوونەوەرێکی ئازاد و سەربەخۆیە و مافی ئەوەی هەیە بەدوای سوود و قازانج و مەنفعەتی تایبەتی خۆیدا بگەڕێ و هەموو شتێکیش ئەنجام بدات بۆ ئەوەی ژیانی خۆی بپارێزێت و بەزیندوویی بمێنێتەوە. مرۆڤ لەم دۆخە سروشتییە هۆبزییەدا هیچ ئەرک و بەرپرسیارێتییەکی بەرامبەر بە مرۆڤەکانی تر لەسەر شان نییە، ئەوەی هەیەتی بیرکردنەوەیە لە خۆی و هەوڵدانە بۆ پارێزگاریکردن لە خۆی

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢_بڕوانە: لاپەڕە ١٠٩.. Hobbes, Thomas (1958). Leviathan Indianapolis Bobbsmerill

و لە سوود و قازانجەکانی. بەڵام چونکە هەموو مرۆڤێک لەو دۆخەدا ئەو مافە سروشتییانەی خۆپاراستنی هەیە و کەس لە بەردەم کەسدا و لە بەردەم هیچ یاسا و ئەخلاقێکدا بەرپرسیار نییە، بۆیە ئەو دۆخەی لە سروشتدا دروست دەبێت، دەبێتە دۆخی جەنگی گشت دژ بە گشت.[1] ئەو خاڵەی لەم دیدە هۆبزییەدا گرنگە، ڕاستی و دروستیی تێزەکەی نییە، بەڵکو ئەو وێناکردنە نوێیەی مرۆڤە وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف، کە لای هۆبز ناوی مافی سروشتییان لێ نراوە. بەڵام وەک وتم، ئەم مافە سروشتییانە لای هۆبز سەرچاوەی جەنگێکی بەردەوام و بێبڕانەوەی مرۆڤە لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا. بۆ دەرچوون لەم دۆخە ترسناکە، تاکەکەسەکان هەم کۆمەڵگە و هەم دەوڵەت دروست دەکەن. لە دیدی هۆبزدا، "کۆمەڵگە" دیاردە یان پێدراوێکی سروشتی نییە، بەڵکو دیاردەیەکی دروستکراوە و بەرهەمی ڕێککەوتنی مرۆڤەکانە لەنێوان خۆیاندا. هۆبز ئەم ڕێککەوتنە ناو دەنێت "پەیمانی کۆمەڵایەتی،" بیرۆکەی سەرەکیی "پەیمانی کۆمەڵایەتی،" ئەوەیە کە مرۆڤەکان خۆیان دونیای خۆیان دروست دەکەن، نەک ئەوەی خودایەک بۆیان دروست بکات، یان خودایەک بۆی دروست کردبن، بۆیە شتێک بە ناوی "مافی خودایی"یەوە لەو دونیایەدا بوونی نامێنێت. بەم مانایە، تێزی مافی سروشتی لای هۆبز و وێناکردنی دۆخی سروشتی وەک دۆخێک بە هەندێک مافەوە بۆ هەموو مرۆڤێک کۆتایی بە تێزی مافی خودایی دەهێنێت. لە تێزی مافی خوداییدا، ئەوانەی ئامادەن خودا و پادشا و حەشامەتن، بەڵام لە

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٠٦-١٠٧.

تێزی "ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتیدا" ئەوەی ئامادەیە کۆمەڵگە و دەسەڵاتدارانن بەبێ خودا. لەم تێزەیدا چەمکی "کۆمەڵگە" دەبێتە یەکێک لە چەمکە سەرەکییەکانی ناو تێزە سیاسییە نوێکان تا ئەو شوێنەی لە سەدەکانی دواتردا کۆمەڵگە خۆی دەبێت بە بکەری سەرەکیی ناو ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی. ئەم گۆڕانە گرنگە لای هۆبز سەرەتایەکی نوێیە لە مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیی مرۆڤدا، چونکە وەک وتم، لە سەرێکەوە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف وێنا دەکات، لە سەرێکی دیکەوە ئەو دونیایەش کە تیایدا دەژی، وەک دونیایەک کە خۆی دروستی دەکات و هەر خۆشی بەڕێوەی دەبات، نەک خودایەک یان کەسێک بە ناوی خوداوە دروستی بکات و بەڕێوەی ببات.

لای جۆن لۆک هەمان ڕوانین بۆ مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا ئامادەیە و تیایدا مرۆڤ وەک کەسێکی خاوەنماف لەئارادایە، بەڵام بە جیاوازییەکی گەورەوە. دۆخی سروشتی لای لۆک، بە پێچەوانەی هۆبزەوە، دۆخی جەنگی بەردەوامی مرۆڤەکان نییە لەگەڵ یەکدا، چونکە لۆک باوەڕی وایە مرۆڤ بە "جەوهەر" یان لە "دۆخی سروشتی"دا بوونەوەرێکی ئازاد و سەربەخۆ و عەقڵانی و یەکسانە، جگە لەوە لە دۆخی سروشتیدا چەندان شێوازی هاریکاری و کاری پێکەوەیی و بەڵێندان ئامادەیە کە بەسەر یەکەوە وا دەکەن مرۆڤەکان بتوانن تەنانەت لە غیابی دەوڵەت و حکومەتدا ژیانی خۆیان بپارێزن. ئەمە وا لە لۆک دەکات باوەڕی وا بێت جەنگ لە دۆخی سروشتیدا "جەوهەر"ی پەیوەندییەکانی مرۆڤ بە مرۆڤەوە

دەستنیشـان نـەکات.[1] ئەگـەر لای هۆبـز مرۆڤـەکان ناچـار بـن واز لـە مافـی ئازادبوون و یەکسـانبوونی خۆیان لەگـەڵ یەکدا بهێنن بۆ ئـەوەی دەسـەڵاتێکی ڕەها کۆتایی بـە جەنگ بهێنێت و ئاساییشیان بۆ دەستەبەر بکات، ئەوا لای لۆک، مرۆڤـەکان لـە دۆخـی دروسـتکردنی دەوڵـەت یـان دەسـەڵاتێکی مەدەنیـدا نـەک دەسـتبەرداری مافەکانـی خۆیـان نابـن، بەڵکـو وا دەکـەن ئەرکی سـەرەکیی دەوڵەتیش ئـەو بێت، سـەرجەمی ئـەو مافانـە بپارێزێـت. لـۆک تـا ئـەو شـوێنە دەڕوات کـە بڵێـت مـرۆڤ لـە دۆخـی سروشـتیدا تەنها مافیـان نییە، بەڵکو بەرپرسیارێتیشیان هەیە و ئەرکی ئەخلاقییان بەرامبـەر بە یەکتری لەسـەر شـانە. ئـەم ئـەرک و بەرپرسـیارێتییانەش بریتیـن لـە ڕێزگرتنـی مافـی کەسـەکانی تـر و لـە زانینـی سـنووری کارکردنـی ویسـت و خواسـتە تایبەتەکانـی خۆیـان. لـۆک لەپـاڵ "مافـی سروشـتی"دا قسـە لـە "یاسـای سروشـتی"ش دەکات و دەیەوێت ئـەو ڕوانینـە سـەروەر بـکات کـە لـە دۆخـی سروشـتیدا تەنهـا غەریـزە و تەمـاح و ویسـتی مرۆڤـەکان بەرقـەرار نییـە، بەڵکـو کۆمەڵێـک یاسـای ئەخلاقییش هەیـە کـە ئـەو پەیوەندییانـە ڕێـک دەخـات. بـە مانایەکـی دیکـە، "یاسـای سروشـتی" لای لـۆک، کۆمەڵێـک داواکاری و ئەرکـی ئەخلاقییـە کـە مـرۆڤ بـە سروشـتی خـۆی و لـە "جەوهـەری" خۆیـدا پابەسـتیانە. ئـەم یاسـا سروشـتییانە کۆمەڵێـک یاسـای ئەخلاقیـن و توانـای ئەوەیـان هەیـە ژیانـی تاکەکەسـەکان بپارێـزن، بۆیـە لـۆک پێـی وایـە دۆخـی سروشـتی دۆخـی جەنگـی گشـت دژ بـە گشـت نییـە، چونکـە پەیڕەویکردنـی

---

[1] بڕوانـە: Locke, John (1980). Second Treaties of Government. Indianapolis, IN: Hackett Publishing.

ئەو یاسا سروشتییانە مانای ڕێگرتنە لە دروستبوونی جەنگ. بەکورتی، لای لۆک مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا نەک تەنها یەکسانن لەگەڵ یەکدا و ئازادیشن، بەڵکو ئەرک و واجبیشیان بەرامبەر بە یەکتری هەیە، سەرچاوەی ئەم ئەرک و واجبانە ئەو یاسا سروشتییانەن کە باسمان کردن.

بەکورتی، لە سەردەمی هۆبزەوە، بەتایبەتی لەپاڵ جۆن لۆکدا وێنەیەک بۆ مرۆڤ دروست دەبێت، کە وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و یەکسان، وەک کەسێکی خاوەنی کۆمەڵێک ماف، کە کەس بۆی نەبێت و نەتوانێت لێیان لا بدات، نمایش دەکرێت. بەڵام ئەم وێناکردنە نوێیەی مرۆڤ لە ئاستی تیۆری و فیکردا بەشێک نییە لەو واقیعە مێژووییەی کە هۆبز و لۆک تیایدا دەژین، نەک هەر ئەمە، بەڵکو خودی هۆبز و لۆک خۆشیان لە ژیانی تایبەتییاندا بەپێی ئەم وێناکردنە تازەیە بۆ مرۆڤ، ناجووڵێنەوە. ڕێک لەو سەردەمەدا کە ئەم دوو نووسەرە باس لە "مافی سروشتی" و "یاسای سروشتی" دەکەن و وێنەیەکی نوێ بۆ مرۆڤ دروست دەکەن وەک بوونەوەرێکی یەکسان و خاوەنماف، ڕێک لەو کاتەدا بازرگانیکردن بە کۆیلەوە لەوپەڕی گەشەکردنیدایە و ئەو وڵاتانەشی ڕاستەوخۆ بەشدارن لەم بازرگانییەدا، وڵاتەکانی ئەم دوو نووسەرەیە. وەک شارەزایەکی بواری بازرگانیی کۆیلەکان دەنووسێت: "لەمەش خراپتر، هەریەکێک لەم نووسەرانە پەیوەندیی شەخسییان لەگەڵ ئەو کۆمپانیایانەدا هەبووە کە بازرگانییان بە کۆیلەوە کردووە."[١] دیسانەوە لەمەش خراپتر ئەوەیە

١_ بڕوانە: Deborah, Aumgold (2010) Slavery discourse before the

کە هۆبز خۆی پشکی تایبەتی لەو کۆمپانیایەدا هەبووە کە بۆرمای داگیر کردوە و لۆکیش لە کۆتاییی سەدەی حەڤدەهەمدا نەک تەنها بەشی هەبوو لە کۆمپانیایەکدا کە بازرگانیی بە کۆیلەوە کردووە، بەڵکو بەشداریش بووە لە نووسینی دەستووری کارۆلینای خوارەودا کە تیایدا بەرگری لە کۆیلایەتیی کراوە.[1]

ئەم دووڕووییە فەلسەفییە لای ئەم دوو نووسەرە گرنگەی دونیای مۆدێرن چەند بێمانا و فرسەتپەرستانەش بێت، کە وایە، بەڵام ڕێ لەوە ناگرن کە بزانین کۆمەڵێک گۆڕانکاریی نوێ و سەرەکی لە بیرکردنەوە لە مرۆڤ و لە ماف و لە دەوڵەتداریدا بەڕێوەیە. ئەوەی شوێنی تێڕامانە لای ئەم دوو نووسەرە و لای هەموو ئەوانەی بەرگری لە تێزی "مافی سروشتی" دەکەن، بەکارهێنانێکی نوێی چەمکی "سروشت"ە بە مەبەستی دروستکردنی وێنەیەکی نوێ بۆ مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و وەک کەسێک یەکسان لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا، ئەمەش شەپازلەیەکی گەورەیە لە ڕوخساری ئەو ڕوانینە یۆنانی و ئەرستۆییە کە پێی وایە هەندێک مرۆڤ بە سروشت کۆیلەن و سروشت بۆ کۆیلایەتی دروستی کردوون. ئەگەر ئەرستۆ سروشتی بەکار هێنابێت بۆ بەخشینی ڕەوایەتی بە کۆیلایەتی و نایەکسانکردنی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا، ئەوا لە تیۆرەی "مافی سروشتی"دا سروشت بەکار دێت بۆ سەلماندنی پێچەوانەی

Restoration: The Barbary coast, Justinian's Digest, and Hobbes's political theory, History of European Ideas,36:4,, p. 412.

[1]_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤١٢.

ئەو دیدە ئەرستۆییيە، بۆ سەلماندنی ئەوەی مرۆڤەكان یەک جەوهەریان هەیە و لە ڕووی سروشتییەوە هەموویان هەم یەكسانن لەگەڵ یەكدا و هەم خاوەنمافن. كەسیش بۆی نییە ئەو مافانە لە مرۆڤ زەوت بكات. خاڵێكی گرنگ كە پێویستە لێرەدا جەختی لێ بكەین، ئەوەیە ئەم وێنە تازەیە بۆ مرۆڤ وێنەیەكی گەردوونی و یونڤێرساڵییە، واتە نەبەستراوەتەوە بە ئەندامبوونی مرۆڤەوە لەم یان لەو چین و توێژ و گروپی كۆمەڵایەتیدا. مرۆڤ كورت نەكراوەتەوە بۆ وێنە لۆكاڵی و كولتوورییەكانی، بۆ ئەندامبوون لەم یان ئەو گروپ، هەبوونی ئەم یان ئەو دین و ئینتیما بۆ فلان یان فیسار ئەتنیەت هتد... خاڵێكی گرنگی تر كە لەم وێنە تازەیەی مرۆڤەوە سەر هەڵئەدات، دروستبوونی وێنەیەكی نوێیە بۆ شێواز و جۆر و مۆدێلی حوكمڕانی خۆشی، حوكمڕانییەک گەرچی لای هۆبز دەسەڵاتدارێكی ڕەهایە و كۆمەڵگە وەک جەستەیەكی گوێڕایەڵ و بێدەنگ مامەڵە دەكات، بەڵام لە فیكری دوای هۆبزدا دەگۆڕێت بۆ دەسەڵاتدارێتییەک كە ڕەوایەتیی خۆی لە خودا یان لە پێگەی دینی و كۆمەڵایەتیی كەسی دەسەڵاتدارەوە ناهێنێت، هەروەها لەوەشەوە نا كە ئەمن و ئاساییش بەرقەرار دەكات، بەڵكو ڕەوایەتی لە "پەیمانێكی كۆمەڵایەتی"یەوە پەیدا دەبێت كە كۆمەڵگە بنەماكەیەتی. لای هۆبز خۆشی "پەیمانی كۆمەڵایەتی" سەرچاوەی ڕەوایەتیی ئەم دەسەڵاتدارێتییە نوێیەیە، بەڵام ئەم پەیمانە لای هۆبز پەیمانی وازهێنانە لە ئازادی و یەكسانی لەپێناوی دەستەبەركردنی ئاساییشدا. ئەوەی تەنانەت لای هۆبز خۆشی گرنگ و سەرەكییە مەسەلەی لەدایكبوونی چەمكی "پەیمان" یان "كۆنتراكت"

خۆیەتی، چەمکی "پەیمان" یان "ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی" وا دەکات دەسەڵاتداریتی ببێت بە دیاردەیەکی سەرزەمینی و مێژوویی، دەیبەستێتەوە بە ویست و بڕیاری ئەوانەوە کە حوکمڕانی دەکرێن نەک بە ویستی شتێکەوە لە دەرەوەی مێژوو و دەرەوەی کۆمەڵگەدا، هەروەها سنوورێکی زەمەنی بۆ درێژیی تەمەنی دەسەڵاتدار دادەنێت، کە زەمەنی مانەوە و پارێزگاریکردنە لەو "پەیمانە کۆمەڵایەتییە." هاوکات ئەم پەیمانە ئەو ڕووبەرانەش دەستنیشان دەکات کە دەسەڵات دەتوانێت دەستیان تێ وەر بدات و ئەوانەشی کە بۆی نییە بچێتە ناویانەوە. بەزاندنی دەسەڵاتدار بۆ سنوورەکانی دەسەڵاتەکەی، ئەو دەسەڵاتداریتییە دەکاتە دەسەڵاتداریتییەکی ناڕەوا و ڕەوایەتیی سیاسیی لێ دەسێنێتەوە. ئەوەی لێرەدا تووشی گۆڕان دەبێت تەنها وێنە سوننەتییە نائازاد و نایەکسانەکەی مرۆڤ نییە، بەڵکو ئەو شێوازانەشە لە حوکمڕانی کە لەسەر ئەم وێنەیە بەندە.

## بەیعەی ئیسلامی و پەیمانی کۆمەڵایەتی

لە لاپەڕەکانی پێشوودا زۆر بەکورتی باسم لە چەمکی بەیعە کرد، ئێستا با هەندێک سەرنجی خێرا لەسەر فیکری سیاسی لە دونیای ئیسلامدا دەر ببڕین و لە خۆمان بپرسین ئایا بەڕاست چەمکی بەیعە و چەمکی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" یەک چەمکن، یان دوو چەمکی تەواو جیاوازن و هێما بۆ دوو وێناکردنی جیاوازی مرۆڤ و کۆمەڵگە و دەوڵەت دەکەن.

ئەوەی شارەزایانی بواری مێژووی فیکری سیاسی لە ئیسلامدا لەسەری ڕێکن، ئەوەیە کە بیرۆکەی "ڕێککەوتن" یان "کۆنتراکت" لەنێوان دەسەڵاتدار و کۆمەڵگەدا لە فیکری سیاسیی ئیسلامیدا بوونی نییە، خەلافەت، کە بە بەرزترین شێوازی حوکمڕانیی ناو ئەزموونی ئیسلام دادەنرێت، لەسەر بنەمای کۆنتراکت کاری نەکردووە و دانانی خەلیفە بەشێک نەبووە لە کۆنتراکتێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی لەنێوان کۆمەڵگە و خەلیفەدا. وەک هەموو دەسەڵاتدارێتییەکی دیکە، خاڵی سەرەکی لە مەسەلەی خەلافەتدا مەسەلەی شەرعییەتی خەلیفەیە. ئایا ئەم شەرعیەتە لە کوێ و لە چییەوە دێت و کێن ئەوانەی ئەم شەرعیەتە بە خەلیفە دەبەخشن؟ بەبێ چوونە ناو وردەکارییە مێژووییەکانەوە، دەکرێت بڵێین مەسەلەی هەرە سەرەکی لە بەخشینی شەرعییەتەدا بە خەلیفە، مەسەلەی "بەیعە"یە. چەمکی "بەیعە" نزیکترین چەمکێکی ئیسلامییە کە بتوانێت لە چەمکی "ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی" نزیک ببێتەوە، پرسیارەکە ئەوەیە ئایا چەمکی "بەیعە" و چەمکی "کۆنتراکت" یان "ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی" یەکن، یاخود دوو چەمکی جیاوازن و لەپشتی هەریەکێکیانەوە وێنەیەکەی جیاواز بۆ "دەسەڵاتدار" و "کۆمەڵگە" و "تاکەکەس" هەیە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە زەحمەت نییە، چونکە ئەدەبیاتێکی زۆر هەیە نیشانمان ئەدات کە چەمکی "بەیعە"ی ئیسلامی و چەمکی "ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی" دوو چەمکی تەواو جیاوازن و دوو وێنەی تەواو جیاوازیشیان بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگە و حوکمڕانیکردن لەپشتەوەیە.[1]

---

١_بۆ نموونە بڕوانە: حیاه عمامو (٢٠١٤). السلطه و هاجس الشرعیه

بەیعە مانای دەربڕینی وەلا و داننان بە شەرعییەتی دەسەڵاتی کەسێکدا کە خەریکە و دەیەوێت ببێت بە دەسەڵاتدار. بەیعەدان بە خەلیفە، بۆ نموونە، مانای داننانی ئاشکرا بەو کەسەدا کە دەبێت بە خەلیفە و دەربڕینی وەلای سیاسی و دینی بەرامبەری وەک خەلیفەی موسڵمانان. لە بنەڕەتدا بەیعە بەشێکە لە کەلەپووریکی جاهیلی کە بەر لە ئیسلام بوونی هەبووە و بە هۆیەوە خێڵە عەرەبەکان سەرۆکی خێڵەکانیان هەڵبژاردووە و کردوویانن بە سەرکردەی خۆیان. لە بەیعەی قۆناغی جاهیلیەتدا هەموو یان بڕێک لە ئەندامە نێرەکانی خێڵێک کۆ دەبنەوە بۆ ئەوەی دان بە هەڵبژاردنی ئەو کەسەدا بنێن کە دەیەوێت و خەریکە ببێت بە سەرۆکی خێڵەکە. لە سەردەمی ئیسلامدا ئەم مانا جاهیلییەی چەمکی بەیعە تێکەڵ دەبێت بە مەسەلەی داننان بە کەسێکدا کە دەبێتە جێگرەوەی پێغەمبەر و وەک سەرۆکی موسڵمانان دەستبەکار دەبێت. لەم بەیعەیەدا موسڵمانان دان بە ڕەوایەتیی دەسەڵاتی ئەو سەرۆکەدا وەک خەلیفە دەنێن و بەڵێن دەدەن گوێڕایەڵیی فەرمایشەکانی بن، گوێڕایەڵیی بە مانای ئیتاعەتکردن.[1] بێگومان ئەم بەیعەبەخشینە کردەیەک

---

فیصدر الاسلام. تونس، دار التنویر. هەروەها بڕوانە: ابراهیم القادری بوتشیش (٢٠١٤)خطاب العداله فی کتب الاداب السلطانیه. بیروت، . المرکزالعربی للابحاث و دراسه السیاسات.

١_بڕوانە: Tyan, E... "Bay'a." Encyclopaedia of Islam, Second Edition. Edited by: P. Bearman, Th. Bianquis, C.E. Bosworth, E. van Donzel, W.P. Heinrichs. Brill Online, 2015. Reference. Universiteit Amsterdam. 02 October 2015 <http://referenceworks.brillonline.com/entries/encyclopaedia-of-islam-2/baya-COM_0107> First appeared online: 2012

نییە هەموو موسڵمانەکان تیایدا بەشدار بن، چونکە ئافرەت و کۆیلە و ئەوانەی پێیان دەوترێت "عامە"ی خەڵک، زۆربەی جار بەشێک نەبوون لە کردەی بەیعەبەخشین. ئەوانەشی پێویست بووە بەیعە بدەن و ئامادە نەبوون ئەنجامی بدەن، چەندەها کێشەی گەورەیان تووش بووە کە کوشتن یەکێک لە بژاردەکان بووە، وەک کوشتنی ئیمامی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالب، لەلایەن یەزیدی کوڕی مەعاویەوە لە شەڕەکەی کەربەلادا، دوای ئەوەی حوسەین ئامادە نەبوو بەیعە بدات بە دەسەڵاتی یەزید.

چەمکی بەیعە لە مێژووی ئیسلامدا قورساییەکی دینیی گەورەی هەیە و ئاماژەش بۆ دەسەڵاتێک دەکات کە دین بەشێکی سەرەکی و بنەڕەتییەتی و ڕەوایەتیی دینی بەشێکی گەورەی ڕەوایەتییەکەیەتی. بەیعە لە بنەڕەتدا ئیمزاکردنی نامەی گوێڕایەڵیکردنە بۆ خەلیفە، چونکە ئەوە ئەرکی خەلیفەیە کە بەرگری لە دین بکات و بیپارێزێت و بڵاوی بکاتەوە، وەک چۆن ئەرکی ئەوە یاسا و شەریعەتە دینییەکە پیادە بکات. هەروەها لە بەیعەدا گوێڕایەڵی و ئیتاعەتی سیاسی بەشێکە لە گوێڕایەڵی و ئیتاعەتی دینی و خەلیفە خۆشی زیاتر نازناوێکی دینییە تا دونیایی. هەموو ئەمانە لە چەمکی "پەیمانی کۆمەڵایەتی"دا ئامادە نین و ئەم پەیمانە هەڵگری ئەم پاشخان و شەحنە دینییە گەورەیە نییە.[1] پەیوەندیی نێوان بەیعە و گوێڕایەڵی بە مانای ئیتاعەتکردن پەیوەندییەکی پتەو و ڕاستەوخۆیە. ئیبن خەلدون لەم بارەیەوە دەنووسێت:

---

١_بۆزیاتر شیکردنەوەی ئەم خاڵە، بڕوانە: فرید لمرینی (٢٠٠٦). صراع الحداثە و التقلید. المغرب: دفاتر وجهە النظر ل ١٥٠-١٥٤.

"بەیعە بەڵێندانە بە ئیتاعەتکردن، ئەوەی بەیعە ئەدات مەسەلەی بڕیاردان لە کاروبارەکانی خۆی و لە کاروباری موسڵماناندا تەسلیم بە ئەمیرەکەی ئەکات و لەم ڕووەوە هیچ ناکۆکی و ململانێیەک لەگەڵ ئەو ئەمیرەدا ناکات. هەموو ئەو ئەمرانەش کە ئەمیر بەو کەسەی دەکات، ئەو جێبەجێیان دەکات."[1] وەک ئاشکرایە، بەیعە لێرەدا کۆنتراکت نییە، بەڵکو بەڵێندانە، بەڵێندانە بە گوێڕایەڵی و لانەدان لە ئەمر و نەهییەکانی دەسەڵاتدار، کە لە ئەزموونی دونیای ئیسلامدا یان خەلیفەیە یان ئیمام، یان سوڵتانە یان ئەمیری موئمینین. ئەم شێوازە لە دەستنیشانکردنی پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتدار و خەڵک لە سەردەمی پێغەمبەر خۆیدا زیاد لە جارێک لە مەکە و مەدینەدا پیادە کراوە. وەک ماوەردییش دواتر دەنووسێت، ئەوانەی دەتوانن لە بەیعەدا بەشدار بن، هەموو خەڵک نین، بەڵکو ئەوانەن کە بە "ئەهلی عەقد و حەل،" واتە نوخبەی خوێندەواری کۆمەڵگە، ناسراون، ئەمە جگە لەوەی بەیعە دەشێت بە کەسێکی دەستنیشانکراو بێت، بۆ نموونە ئەو کەسەی لە ئێستادا سەرۆک یان ئەمیر یان سوڵتان و خەلیفەیە، دەتوانێت داوا بکات دوای خۆی بەیعە بە کەسێک بدرێت کە ئەو بەر لە مردنی دەستنیشانی دەکات.[2] یەکەمین کەس کە ئەم جۆرە دەستنیشانکراوە لە بەیعەی هێنایە کایەوە، ئەبوبەکری سدیق بوو، ئەم خەلیفەیە بەر لە مردنی داوای کرد بەیعە بە عومەری کوڕی خەتاب

---

١_بڕوانە: حیاە عمامو (٢٠١٤). السلطە و هاجس الشرعیە فیصدر الاسلام. تونس، دار التنویر. ل٤٢.

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤٤.

بدرێت و دوای مردنیشی موسڵمانەکان ئەو کارەیان کرد. وەک زۆربەی نووسەران لەسەری کۆکن، بەیعە لە مێژووی کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا لەوە کەوتووە کە ئامرازێک بێت بۆ هەڵبژاردن یان تەنانەت بەڵێندانێکی ڕاستەقینە، چونکە زۆربەی جار کارەکەی تەنها ئەوە بووە شەرعییەت بە دەسەڵاتێک ببەخشێت کە دروست بووە و دەسەڵاتی لە دەستدا بووە، واتە بەیعەکە جگە لە داننان بە واقیعدا بەو شێوەیەی کە هەیە، شتێکی دیکە نەبووە. بەم مانایە، بەیعە لە ڕووی کردەییەوە سەرچاوەی دروستکردنی دەسەڵاتێکی شەرعی نەبووە، بەڵکو ئامرازی بەخشینی شەرعییەت بووە بە دەسەڵاتێک، کە دروست بووە بەبێ ئەوەی پرسیاری ئەوە بکرێت ئایا ئەو دەسەڵاتە چۆن دروست بووە. بەکورتی، بەیعە ئامرازی ئەوە بووە بە عەرەبی پێی دەڵێن "اقرار الواقع." بەڵام سەرەڕای ئەم ڕاستییە، ئەوەی لە دونیای ئیسلامدا شوێنی گومانلێکردن نییە، ئەوەیە کە جێهێشتنی دەسەڵات لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، واتە تەوریسکردنی دەسەڵات، بەتەنها بەس نەبووە بۆ ئەوەی ئەو دەسەڵاتە ببێتە خاوەنی شەرعیەت، بەیعە بەشێکی گرنگی بەدەستهێنانی ڕەوایەتی بووە، ئەگەرچی لە ڕووی عەمەلی و کردەییەوە بەیعە تەواو بەتاڵ کراوەتەوە لە توانای بەشداریکردنێکی ڕاستەقینە لە بەخشین یان نەبەخشینی شەرعییەت بە دەسەڵات. بەیعە ئەگەرچی کورت کراوەتەوە بۆ دیاردەیەکی شکڵی و بەتاڵ، بەڵام هەمیشە بوونی بە پێویست زانراوە بۆ بەخشینی ڕەوایەتی بەدەسەڵات.[1] قورئان خۆشی باس لە گرنگیی بەیعە

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤٧.

دەکات و بەیعەدان بە خەلیفە وەک بەیعەدان بە خوداوەند دەناسێنێت: "ان الذین یبایعونک انما یبایعون الله ید الله فوق ایدیهم" و ئەوەشی لە بەیعە پەشیمان ببێتەوە، وەک ئەوە وایە لە دینەکەی پەشیمان بووبێتەوە.[1]

جگە لە هەموو ئەمانە ئەو دەسەلاتانەی لە دونیای ئیسلامدا بەیعە ڕەوایەتیی پێ بەخشیوە، دەسەلاتێک نەبوون سنوورەکانیان دەستنیشان کرابێت، نیشان درابێت دەتوانن تا کوێ بڕۆن و چ سنوورێک هەیە نەتوانن بیبەزێنن، هەروەها بە هیچ شێوەیەک باس لە ماوەی مانەوەی ئەو دەسەلاتانە نەکراوە و دەستنیشان نەکراوە ئایا دەسەلاتدار بۆی هەیە چەند ساڵ لە دەسەلاتدا بمێنێتەوە، کەی و چۆن دەتوانێت لا ببرێت یان واز بهێنێت. لەم ڕووەوە فەیلەسووفی مەغریبی: محمەد عابد الجابری باس لە بوونی "بۆشاییەکی دەستووری" لە دونیای ئیسلامدا دەکات و پێی وایە هەموو کێشەی دەسەلات لە مێژووی ئیسلامدا کورت کراوەتەوە بۆ کێشەی چۆنێتیی دەستنیشانکردنی تاکەکەسێک بە خەلیفە. لە ڕووی تیۆرییەوە دەسەلات لە مێژووی ئیسلامدا دەکرێت تەنها لە یەک دۆخدا لا ببرێت، ئەویش ئەو کاتەی نەتوانێت ئەمن و ئاسایش بەرقەرار بکات، یان "فیتنە" و شەڕوشۆڕشی ناوەکی سەروەر بێت و کەس لە موڵک و ماڵی خۆی دڵنیا نەبێت. بە مانایەکی دیکە، ئەوەی لە ڕووی تیۆرییەوە ڕەوایەتی لە دەسەلات دەسێنێتەوە، پابەستبوونی دەسەلات نییە بە تەمەنێکی دیاریکراو و بە ڕێزگرتن و دەستنەبردن بۆ هەندێک مافی تایبەت، یان تەنانەت پیادەنەکردنی خواستە

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٥٠.

دینییەکان، بەڵکو ئەوەیە کە دەسەڵات لە بەرقەرارکردنی ئەمن و ئاساییشدا سەر نەکەوێت و دۆخی "فیتنە" بەرقەرار بێت. بەکورتی، ئیشی دەسەڵاتدار لە ئەدەبیاتی سیاسیی ئیسلامیدا بە پلەی یەکەم بریتیی بووە لەوەی فوقەهاکان ناوی "خۆپاراستن لە هۆکارەکانی بەرپابوونی فیتنە،" "درء اسباب الفتنە"ی لێ دەنێن. جگە لەمە، دەسەڵاتی خەلیفە لە ئیسلامدا هەر زوو بە دەسەڵاتی خوداوە گرێ دەدرێت و پێگەی خەلیفە وەک پێگەیەکی خودایی وێنا دەکرێت. مێژووی وێناکردنی خەلیفە وەک نوێنەری خودا لەسەر زەوی، دەگەڕێتەوە بۆ سێهەمین خەلیفەی ئیسلام، عوسمانی کوڕی عەفان. کاتێک برێک لە موسڵمانەکان کۆ دەبنەوە و داوای لێ دەکەن واز لە خەلیفایەتی بهێنێت، وەڵامی عوسمان ئەوەیە کە خەلیفایەتی کراسێکە خودا کردوویەتیە بەری ئەو، کراسێکیش خودا کردبێتیە بەری، بۆ هیچ کەسێکی داناکەنێت. عوسمان لێرەدا بەئاشکرا پەیوەندییەکی ماددی و ڕاستەخۆ لەنێوان خودا و خەلیفەدا دروست دەکات و باس لەوە دەکات، ئەوەی ئەوی کردووە بە خەلیفە خودایە نەک خەڵک و کۆمەڵگە. دواتر لە سەردەمی ئەمەوییەکان و بەتایبەتی لە سەردەمی عەباسییەکاندا سوڵتان یان خەلیفە، وەک "سێبەری خودا لەسەر زەوی" وێنا دەکرێت و لەنێوان بەیعەداندا بە سوڵتان و بەیعەداندا بە خودا فاسیلەیەک ناهێڵدرێتەوە، بەیعە لەوە دەر دەکرێت میکانیزمێکی سیاسیی سەرزەمینی بێت و وەک ئەرک و واجبێکی دینی وێنا دەکرێت. ئەم ڕوانینە بۆ بەیعە وا دەکات بەڵێندان بە گوێڕایەڵی بۆ سوڵتان، لەپاڵ ترس لە بەرپابوونی فیتنە، ببێت بە ئەرکێکی دینی

و وەک بەشێک لە دین خۆی سەیر بکرێت. بەمەش بەیعە لە مەجالی سیاسی دەر بکرێت و بگوازرێتەوە بۆ مەجالی دینی. لە دوادەرەنجامیشدا بکرێت بە یەکێک لە ئامرازە سەرەکییەکانی دروستبوون و بەردەوامبوونی ستەمگەریی دینی و سیاسی لە مێژووی کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا. جگە لەمەش، مەسەلەی حوکمڕانی و ڕەوایەتی وا نیشان ئەدرێت، وەک ئەوەی بەتەنها مەسەلەی تاکەکەسێک بێت، مەسەلەی گەیشتنە دەسەڵاتی خەلیفەیەک یان ئەمیرێک یان ئیمامێک یان سوڵتانێک بەتەنها، نەک مەسەلەی حوکمڕانی وەک کێشەیەکی گەورەتر و فراوانتر. واتە ئەوەی بیری لێ کراوەتەوە، تەنها "کەسایەتی"ی دەسەڵاتدارەکەیە: کێ بۆ ئەم پێگەیە گونجاوە و دەبێ ئەو کەسە هەڵگری چ جۆرە توانا و کەسایەتییەک بێت؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە سەرەتا و کۆتاییی ئەم شێوازەیە لە بیرکردنەوە، کە سەبارەت بە مەسەلەی حوکمڕانی لەئارادا بووە. ئەدەبیاتێکی گەورە هەیە باس لەوە دەکات کە کەسایەتیی دەسەڵاتدار پێویستە زانا بێت، دادپەروەر بێت، هەستەکانی باش کار بکەن، نابینا یاخود دێوانە یان نەخۆش نەبێت، ئەمە جگە لەوەی کە پێویستە نەسەبێکی باشیشی هەبێت. لای هەندێک نووسەری ئەم بوارە، نەسەبی ئەو کەسە پێویستە بچێتەوە سەر قورەیش، وەک لای ئەل ماوەردی، بەڵام هەندێکی تریان پێیان وا بووە مەرج نییە سەر بە قورەیش بێت، بەڵام دەبێت سەر بە خێڵ و تیرە و عەسەبیەتێکی بەهێز بێت، وەک لای ئیبن خەلدون.[1]

---

١_بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم خاڵە، بڕوانە: محمد الخرات. التاعه فی تاریخ الفکر الاسلامی. مومنون بلا حدود. ل٨

بەکورتی، چەمکی بەیعە لە ئیسلامدا ڕەهەندێکی دینیی بەهێزی هەیە کە لە چەمکی "کۆنتراکتی کۆمەڵایەتی" جیای دەکاتەوە. ئەم ڕەهەندە دینییە هەندێکی دەگەڕێتەوە بۆ بڕێک لە وتەکانی پێغەمبەر خۆی و بڕێکیشی بۆ هەندێک ئایەت کە لە قورئان خۆیدا هاتووە و هەندێکیشی بۆ چۆنێتیی هەڵسوکەوتی هەندێک لە خەلیفەکان، وەک خەلیفەی سێهەم، عوسمانی کوڕی عەفان. یەکێک لەو وتانەی پێغەمبەر کە باس لە بەیعە دەکات وەک واجبێکی دینی، ئەم وتەیەیە: "هەرکەسێک بمرێت و بەیعەی بە ئیمامێکی موسڵمان نەدابێت، مردنەکەی مردنێکی جاهیلییە." ئەمەش ئاکارێکی دینی و موقەدەس هەم بە چەمکەکە دەبەخشێت و هەم بەو دەسەڵاتەش کە بەیعە ڕەوایەتیی پێ دەبەخشێت.[1] چەمکی "بەیعە" چەمکێکە لە فەزایەکی دینیدا ئامادەیە و دەژی و بەشێکە لە هۆشیاریی فیقهی، لە کاتێکدا چەمکی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" چەمکێکی سیاسییە و ئاماژە بۆ لەدایکبوونی کایەی سیاسی دەکات وەک کایەیەکی سەربەخۆ لە کایەی دین و ئەخلاق. ڕاستە لە ئیسلامدا بڕێک لە دەسەڵاتی یاسادانان، تەشریع، لە دەسەڵاتی سوڵتان و پادشاکاندا نەبووە و لەژێر دەستی دەسەڵاتی "زانا" یان "پیاوانی دین"دا بووە، ئەوەی بە عەرەبی پێی دەڵێن عولەما، بەڵام مێژووی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان نیشانمان ئەدەن کە بەشی هەرەزۆری هەڵسوکەوتی زانا دینییەکان گوێڕایەڵییەکی تەواوە لە سوڵتان و پادشاکان. پیاوانی دین، بەدەگمەن نەبێت، ململانێیان لەگەڵ سوڵتانەکاندا نەکردووە و لەسەر پیادەکردن یان نەکردنی دین بەگژ سوڵتاندا

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤٩.

نەچوونەتەوە. هەندێک دۆخی کەم و دەگمەنی لێ دەر چێت، ڕۆڵی پیاوانی دین، ڕۆڵی "فەتواچی" بووە بۆ سوڵتان، ئەو فەتوایانەیان دەر کردووە کە سوڵتانەکان پێویستیان پێی بووە. هەمان شت لە پەیوەندیدا بەوەوە کە لە ئیسلامدا ناوی "اهل الحل و العقد"ی لێ نراوە، ئەمانەش زۆربەی کات بەشێک بوون لەو ئۆردوە تایبەتەی بەدەوری پادشادا کۆ بوونەتەوە و لە باشترین حاڵەتەدا "نەسیحەت"ی سوڵتانیان کردووە بە ئەنجامدان یان نەدانی کارێکی دیاریکراو، بەڵام "نەسیحەت"ەکە خۆی هیچ هێزێکی یاسایی تایبەتی نەبووە و پەیڕەوکردن و نەکردنیشی لەلایەن سوڵتانەوە، ویستی سوڵتان خۆی دەستنیشانی کردووە. سوڵتان و خەلیفەکان خۆشیان کەسانێک بوون تەواو جیاواز لە مرۆڤە ئاساییەکان، ئەوان لە جنسێکی تر و لە جەوهەرێکی تر دروست کراون، جیاواز و بەرزتر لە جەوهەری خەڵکی ئاسایی. ما وەردی بۆ سەلماندنی ئەم حاڵە دەنووسێت: "خودا پێگەی ئینسانی لە پێگەی هەموو بوونەوەرەکانی دیکە بەرزتر ڕاگرتووە، دوای ئەوە پێگەی پادشایانی لە پێگەی هەموو مرۆڤەکانی تر بەرزتر ڕاگرتووە، خودا خۆشی سیفەتی پادشابوونی بەم کەسانە بەخشیوە، بەم مانایەش، پادشایان خەلیفەی خودان لەسەر زەوی. هەروەها لێکچوونێک لەنێوان خودا و مرۆڤدا هەیە، ئەگەر خودا یەک و بێشەریک بێت، پێویستە سوڵتانیش یەک و بێشەریک بێت."[1] ئەوەی لەم تێکستەی ما وەردیدا بەئاشکرا دیارە، ئەوەیە کە مرۆڤەکان نەک لەگەڵ یەکدا

---

١_بڕوانە: حسن حماد (٢٠١٥). اشكاليات الدين و الدولە فى الاجتماع الاسلامى. مؤمنون بلا حدود. موسسە دراسات و الابحاث.

یەکسـان نیـن، بەڵکـو هەندێکیـان خـودا هەڵیـان دەبژێرێـت بـۆ ئـەوەی حوکمـڕان بـن و ئەوانـی تریـان پێویسـتە گوێڕایەڵێکـی بێمـاف بـن. بـەڵام ئەمـە هەمـوو نایەکسـانییەکانی نـاو مێـژووی کۆمەڵگـە و حوکمڕانییـە ئیسـلامییەکانی ئـەم ناوچەیـە نییـە، نایەکسـانییەکی تـر هەیـە کـە لەوانـەی تـر سـەختگیرتر و پەرگیرتـرە، ئەو نایەکسـانییەش نایەکسـانیی نێوان ئەوانەیە کە لـە مێـژووی کۆمەڵگـە ئیسـلامییەکاندا بـە "عامـە"ی خەڵـک و ئەوانـەدا کـە "خاسـە"ی کۆمەڵگـە نـاو بـراون.

## "عامە" و "خاسە"

دوو چەمکی سەرەکیی تر کە لە دونیای ئیسلامدا دەستبەکار بووە بۆ دەستنیشانکردنی شوێن و جێ و پێگەی مرۆڤ لەناو ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیدا، چەمکەکانی "عامە" و "خاسە"ن. "عامە" کە بە کۆ "عەوامە" بە زۆرینەی کۆمەڵگە وتراوە، زۆرینەیەک کە گوایە نەخوێندەوار و نەزان و بێئاگا بوون لە دونیا، لە بەرامبەر "خاسە"دا، کە بەو بەشە بچووکەی کۆمەڵگە وتراوە کە گوایە خوێندەوار و لێزان و شارەزا بوون و ئاگایان لە فیکر و دین و هونەر و ئەدەبیات و کاروباری حوکمڕانی و دونیا هەبووە. بە زمانی ئەمڕۆ قسە بکەین "عامە" جەماوەرە و خەڵکی ئاساییی ناو کۆمەڵگەیە، لە کاتێکدا "خاسە" نوخبە و ئەشراف و ئەرستۆکراتییەکانی ناو کۆمەڵگەن. لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا ئەم جیاکارییە تەنها جیاکارییەکی سۆسیۆلۆژی نەبووە کە ئاماژە بۆ جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگە

ئیسلامییەکان بکات، بەڵکو جیاکارییەکی ئەپستمۆلۆژیش بووە و ئەوانەی وەک عامە وێنا کراون، بە گەمژە و نەزان و بێمێشک ناونووس کراون و نزیکبوونەوەیان لە هەر شتێکیش، کە پەیوەندیی بە بیرکردنەوە و نووسین و خوێندنەوەوە هەبێت، وەک مەترسی وێنا کراوە. دیدی باڵادەست لە مێژووی کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا ئەوەیە کە عەوام کەسانی بێعەقڵ و گەمژە و هیچنەزان و هەرچیوپەرچی و بەربەرین. بۆیە دەبێت ئەو سنوورانە تەواو دیار و بەرچاو بن کە عەوام لە خەواس یان "زۆرینەی کۆمەڵگە" کە گەمژە و نەزانن لە "نوخبە"ی کۆمەڵگە جیا دەکاتەوە، کە زانا و خوێندەوار و شارەزان. کەسێکی وەک ئیبن موقەفەع لە سەردەمی عەباسییەکاندا هەموو مرۆڤایەتی بەسەر ئەم دوو بەرەیەدا دابەش دەکات و پێی وایە عەوام ئەخلاقیان نییە و بێعەقڵن و شوێنی باوەڕ نین، بەڵام خاسە یان نوخبە، خاوەنی ئەخلاقیاتێکی بەرز و باوەڕپێکراون، عەوام خاوەنی کەسایەتی و تاکایەتی نین، بەڵام خاسە خاوەنی هەموو ئەو شتانەن. ئیبن موقەفەع هەندێک جار دەستەواژەی "ڕوعاع" واتە "گاگەل" بەکار دەهێنێت بۆ باسکردنی ئەم "عامە"یە، لە کاتێکدا "خاسە" وەک ئەو کەسانە وێنا دەکرێن کە خاوەن خود و کەسایەتی و تایبەتمەندیی خۆیانن و کەسیان لەوی تریان ناچێت. لای ئیبن موقەفەع، عامە ئەو کەسانەن کە بۆیان نەبووە پادشاکان و ئەمیرەکان و پیاوانی سەرەوەی کۆمەڵگە ببینن، بەڵام "خاسە" ئەو کەسانە بوون کە هێشتوویانە بچنە کۆشکی پادشا و سوڵتان و دەسەڵاتدارەکانەوە و "خاسەی خاسە"کانیش ئەوانە بوون کە توانیویانە لە کۆڕ و کۆبوونەوە و مەجلیسی

خەلیفە و سوڵتانەکاندا دابنیشن.[1] بە شێوەیەکی گشتی، "خاسە" ئەوانەن کە دۆست و هاوڕێ و دەستە و دائیرەی دەسەڵاتدارانن و دەتوانن نەسیحەتی سوڵتان و خەلیفە بکەن و بۆچوونی خۆیان لەسەر ڕووداوەکان بڵێن. بەڵام "عەوام" ئەوانەن کە پێویستە بەردەوام ماڵی و بێدەنگ بکرێن و بهێنرێنە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتدارانەوە، ئەوانەن کە وەک ئاژەڵی دڕندە وان و پێویستە "خاسە" ئەو دڕندەیی و هەڵچوون و ناعەقڵانیەتەی ئەمانە هەڵگرین، کۆنترۆڵ بکەن و بیهێننە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. لای زۆربەی خوێندەوار و نووسەر و فەیلەسووفەکانی ناو ئیسلام ئەم جیاکارییە لەنێوان "خاسە" و "عامە"دا جیاکارییەکی هێجگار گرنگە و بەشێکە لە شێوازی ڕێکخستنی کۆمەڵگە و جیهان و بوونی مرۆڤ لەسەر زەوی. "خاسە" و "عامە" لە هیچ ڕوویەکەوە لەگەڵ یەکدا یەکسان نین و هەریەکەیان سەر بە هەسارەیەکی فەرهەنگی و مەعریفی و کۆمەڵایەتیی جیاوازە، ئەوەی "خاسە" لەنێوان خۆیاندا دەینووسن و باسی دەکەن، نابێت بگاتە دەمی "عەوام" و فیکر و نووسین و بیرکردنەوە کە بەشێکە لە ژیانی "خاسە"ی کۆمەڵگە پێویستە بەدوور ڕابگیرێت لە "عەوامی خەڵک،" کە هەموویان بێمێشک و بێعەقڵ و گەمژە و ترسناکن. نەک هەر ئەمە، بەڵکو شێوازی بەختەوەریی "عەوام" و شێوازی بەختەوەریی "خاسە"ش تەواو لێک جیاوازن و "بەختەوەریی تیۆری و مەعریفی" شتێکە لە دونیای خاسەدا بوونی هەیە، لە کاتێکدا بەختەوەریی جەستەیی و فیزیایی و نەوسنی بەختەوەریی "عەوام"ەکانە. فارابیی فەیلەسووف تا ئەو شوێنە دەڕوات کە بڵێت بەهەشت تەنها بۆ ئەو کەسە تایبەتانەیە کە

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دەتوانن چێژی ڕۆحییان هەبێت و پێویستیان بە جەستە نەمابێت بۆ ئەوەی بتوانن چێژ ببینن. لای فارابی، مرۆڤ دوای مردن تەنها ڕۆحەکەی بەبێ جەستە زیندوو دەبێتەوە، بۆیە ئەوانەی کە ناتوانن چێژی ڕۆحییان هەبێت و تەنها چێژی جەستەیی دەناسن، یانی ئەوانەی کە ڕۆحیان گەشەی نەکردووە و بەجێ ماوە، ئەوانە ناتوانن بچنە بەهەشت، چونکە لە بەهەشتدا تەنها چێژی ڕۆحی هەیە نەک چێژی جەستەیی. بەم ڕوانینە، فارابی سەرجەمی ئەوانەی "عەوام"ن و تەنها توانای ئەزموونکردنی چێژی جەستەییان هەیە، لە بەهەشت دەر دەکات. دواتر ئیبن سینا ئەم دیدەی فارابی دەستکاری دەکات و باس لەوە دەکات لە بەهەشتدا شوێنیش بۆ "جەستە" هەیە و ئەوانەی ژیانێکی ئەخلاقییانەی ڕاست ژیابن، بەڵام ڕۆحێکی گەشەکردوویان نییە، دەتوانن بچنە بەهەشت و لە بەهەشت هەندێک چێژی جەستەیی تاقی بکەنەوە. مادام ئەوانە ناتوانن چێژی ڕۆحی ئەزموون بکەن، لە بەهەشت چێژی جەستەیی هەیە دەتوانن ئەزموونی بکەن.[1] وەک دەبینین، لێرەشدا جیاوازییەکی گەورە و فرەلایەن لەنێوان مرۆڤەکاندا دەکرێت و پێ لەسەر نایەکسانیی نێوان مرۆڤەکان دادەگیرێت، ئەوەی لێرەدا مایەی سەرنجە، ئەوەیە خودی ئەم جیاوازی و نایەکسانییەی نێوان مرۆڤەکان بۆ دوای مردنیش درێژ دەکرێتەوە و دەبێت بە بەشێک لە جوگرافیای بەهەشت خۆشی.

---

١_بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم خاڵە، بڕوانە: Rahman, Fazlur (2002). *Islam*. The University Chicago Press, Chicago. بەتایبەتی لاپەڕە١١٩.

کۆمەڵگە ئیسلامییەکان لە ڕووی سۆسیۆلۆژییەوە لە چوار بەش پێک هاتبوون: یەکەم، عەرەبە هێرشبەرە موسڵمانە سەرەتاییەکان. دووهەم، ئەو گروپە ئەتنیانەی تازە بووبوون بە موسڵمان. سێهەم، ناموسڵمانەکان و چوارەم، کۆیلەکان.[1] کۆیلەکانی لێ دەر چێت، لەناو هەریەکێک لەو سێ بەشەی تردا پلە و پایەی کۆمەڵایەتیی جیاواز هەبوون و دابەشکردنی هەریەکێک لەو بەشانە بۆ "عامە" و "خاسە" دابەشکردنێکی سەرەکی و بنەڕەتی بووە. لە سەردەمی حوکمڕانیی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا پۆلێنکردن لەناو کۆیلەکانیشدا دەست پێ دەکات و عوسمانییەکان جیاوازییەکی گەورە لەنێوان کۆیلە سپییەکان و کۆیلە ڕەشەکاندا دەکەن، ئەم خاڵە دواتر دێمەوە سەری.

## کۆیلە لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا

کۆیلایەتی بەشێکی دانەبڕاوە لە مێژووی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان و هەر چوار مەزهەبەکەی ناو ئیسلامیش کۆیلایەتییان حەلاڵ کردووە، هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی

---

١_بڕوانە: Beg, M.A.J... "al-Khāṣṣa wa 'l-'Āmma." Encyclopaedia of Islam, Second Edition. Edited by: P. Bearman, Th. Bianquis, C.E. Bosworth, E. van Donzel, W.P. Heinrichs. Brill Online, 2015. Reference. Universiteit Amsterdam. 02 October 2015 <http://referenceworks.brillonline.com/entries/encyclopaedia-of-islam-2/al-khassa-wa-l-amma-SIM_4228> First appeared online: 2012

بەشێک نەبووە لە ئەمر و نەهییەکانی نە ئیسلام و نە مەسیحیەت و نە ئایینی جوولەکە، لە هەموو ئەم ئایینانەدا کۆیلەبوون دیاردەیەکی قبوولکراو و سروشتی یان نیمچەسروشتی بووە. بەڵام هاوکات ئازادکردنی کۆیلە لە قورئاندا وەک کارێکی ئەخلاقیی چاکەکار و وەک خێرێکی گەورە ناو براوە. جگە لەمە، قورئان داوای ئەوە دەکات ئەو کۆیلانەی کە ناکرێت ئازاد بکرێن، پێویستە بە شێوەیەکی باش و چاکەکارانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، قورئان ئەم شێوازە مامەڵەیە بە "احسان" ناو دەبات، هەروەها ئەو ئافرەتانەی کۆیلەن، هیچ کەسێک بۆی نییە لەگەڵیاندا ڕاببوێرێت، خاوەنەکانیان نەبێت.[1] بەم مانایە قورئان کۆیلایەتیی یاساغ نەکردووە و وەک دیاردەیەکی نەشیاو و نەگونجاوە وێنای نەکردووە، یان لانی کەم کۆیلەکردنی مرۆڤی حەرام نەکردووە، قورئان خواردنی گۆشتی بەرازی حەرام کردووە، بەڵام کردنی مرۆڤی بە کۆیلە، حەرام نەکردووە.

لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا، کۆیلە بە مانای عەبد، تاقە ناوێک نەبووە کە پێگە و نرخی جیاوازی مرۆڤەکانی لە یەکتری جیا کردۆتەوە، لەپاڵ کۆیلەدا "جارییە" و "کەنیزەک" و "غیلمان" و "وەسیف" و "وەسیفە" و "خادم"یش هەبوون،

---

1_Brunschvig, R... "'Abd." Encyclopaedia of Islam, Second Edition. Edited by: P. Bearman, Th. Bianquis, C.E. Bosworth, E. van Donzel, W.P. Heinrichs. Brill Online, 2015. Reference. Universiteit Amsterdam. 20 October 2015 <http://referenceworks.brillonline.com/entries/encyclopaedia-of-islam-2/abd-COM_0003>

کە هەموویان هەریەکە بە شێوەیەک، لە جۆرێک لە جۆرەکانی کۆیلایەتییەوە ئاڵاون.[1] ئەمانە هەموویان "خاوەن" و "مەولا" یان "مالیک"یان هەبووە و کەسیان بوونەوەری ئازاد نەبوون. ڕاستە پێغەمبەر و هەندێک لە سەحابەکان کۆیلەیان کڕیوە و ئازاد کردووە، ئەوەش ڕاستە ئیسلام بۆتە هۆکاری ڕزگاربوونی زۆر کۆیلە لە کۆیلایەتی، بەلام لە دونیای موسڵمانەکاندا هەمیشە ڕووبەرێک بۆ کۆیلە و کۆیلەکاری هەر هەبووە، ڕاستە کەسێک کە موسڵمان بوو ناشێت بکرێت بە کۆیلە، بەلام ناموسڵمان دەکرێت کۆیلە بکرێت و منداڵی کۆیلەکانیش وەک کۆیلە لەدایک دەبن و دیلە ناموسڵمانەکانی جەنگیش وەک کۆیلە مامەڵە کراون. دەڵێم سەرەڕای دانانی هەندێک سنوور بۆ بچووککردنەوە و بەرتەسککردنەوەی دیاردەی کۆیلایەتی، بەلام ئیسلام نەیتوانیوە کۆیلایەتی حەرام بکات و وەک یەکێک لە دیاردە سەرەکییەکانی ناو کۆمەڵگە ئیسلامییەکان کۆتایی پێ بهێنێت. دیاردەی کۆیلایەتی لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم ئامادە بووە و بەتایبەتی لەدوای جەنگی جیهانیی دووهەمەوە کۆتایی پێ هاتووە. لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمدا کەسێکی وەک ڕەفاعە ڕافع تەهتاوی ٪١٧ی سەرمایەکەی خۆی تەرخان کردووە بۆ ئازادکردنی کۆیلەکانی.[2] دیاردەی کۆیلەبوون لە مێژووی ئیسلامدا دیاردەیەکی ئاڵۆزە و لێرەدا کاتی ئەوەمان نییە بکەوینە دوای دەرکەوتە جیاوازەکانی،

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢_بڕوانە: محمد العمارە .(...) التهتاوی...

بەڵام یەکێک لە پێدراوە گومانهەڵنەگرەکانی مێژووی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان، بەتایبەتی مێژووی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ئەوەیە کە دیاردەی کۆیلایەتی بەشێکی گرنگی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەو کۆمەڵگەیانە بووە. "مەملوکەکان" خۆیان دیاردەیەکی سیاسیی گرنگی ناو ئەم مێژووەن، مەملوک مانای ئەو شتەی کە موڵکی کەسێکە، خۆی خاوەنی خۆی نییە، بەڵکو کەسێکی تر خاوەنی ئەوە. مەملوکەکان بەشێک بوون لەو خەڵکە زۆرەی لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا ئامادە بوون و بەشێک بوون لە دیاردەی کۆیلایەتی لەو کۆمەڵگانەدا. دواتر وشەکە بۆ ئەوانە بەکار هاتووە، کە پێشتر کۆیلە بوون و دواتر ڕزگار کراون.[1] لە سەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبییەوە مەملوکەکان دەبن بە هێزێکی گرنگی ناو کۆمەڵگە ئیسلامییەکان و لە هەندێک شوێندا دەسەڵات دەگرنە دەست، بۆ نموونە لە میسردا تا پەیدابوونی عوسمانییەکان دەسەڵاتیان هەبووە. عوسمانییەکان خۆشیان زیاد لە شێوازێک لە کۆیلە و کۆیلەبوونیان هەبووە، بەر لە هەموو شتێک، عوسمانییەکان جیاوازییەکی گەورەیان لەنێوان کۆیلە سپیپێستەکاندا کە لە قەوقاز و جۆرجیاوە هاتوون، لەگەڵ کۆیلە ڕەشپێستەکاندا کردووە، کە لە شوێنە جیاوازەکانی ئەفەریقاوە هێنراون.

---

١_بڕوانە: Brunschvig, R... "'Abd." Encyclopaedia of Islam, Second Edition. Edited by: P. Bearman, Th. Bianquis, C.E. Bosworth, E. van Donzel, W.P. Heinrichs. Brill Online, 2015. Reference. Universiteit Amsterdam. 20 October 2015 <http://referenceworks.brillonline.com/entries/encyclopaedia-of-islam-2/abd-COM_0003>

کۆیلە سپیپێستەکان پێیان وتراوە "کولە" و ئەمانە لەناو شارەکاندا و زۆر جار لەناو کۆشکی پادشا و سوڵتانەکاندا ژیاون و توانیویانە تا ئاستی بوون بە ئەمیر و پادشا گەشە بکەن، نموونە هەرەدیارەکەی ئەم جۆرە لە کۆیلەی سپیپێست خەیرەدینی تونسییە، کە لە ساتێک لە ساتەکاندا دەبێت بە سەدری ئەعزەم. بەڵام کۆیلە ڕەشپێستەکان، کە زۆرینەی کۆیلەکان بوون، لە ئەفەریقاوە هێنراون و لە بواری کشتوکاڵ و ئیشی جەستەیی قورسدا کاریان پێ کراوە.[1]

بەکورتی، هیچ دینێک لە دینەکان نە سەرچاوەی مافەکانی مرۆڤە، نە هەڵگری ڕوانینێکە تیایدا مرۆڤەکان هەموویان بە یەکتری یەکسان بن، نە حوکمڕانەکانیش وەک مرۆڤی یەکسان لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا وێنا دەکات. دینەکان جیاکاریی گەورە و نایەکسان لەنێوان مرۆڤەکاندا دەکەن، لانی کەم لەنێوان ئیماندار و بێئیماندا کە بە هیچ جۆرێک بە یەکتری یەکسان نین. جگە لەمە، لە پەیوەندیدا بە مافەوە، ئەوەی لە دینەکاندا پێی لەسەر دادەگیرێت مافەکانی مرۆڤ نییە، بەڵکو ئەو شتەیە کە ناوی "مافەکانی خودا"ی لێ دەنێن. مرۆڤ لێرەدا کەمتر ماف و زیاتر "واجبی شەرعی"ی لەسەرە، مرۆڤ خودا بۆ پەرستن و جێبەجێکردنی واجبە شەرعییەکان دروستی کردووە، نەک بۆ ئەوەی مافی هەبێت بەو جۆرە بژی و بیر بکاتەوە کە خۆی دەیەوێت. لە فیقهی

---

[1]_بڕوانە: Ehud R. Toledano (1998). Slavery and Abolition in the Ottoman Middle East. Seattle and London: University of Washington Press. p 113.

ئیسلامیدا مرۆڤەکان بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ یەکتریدا یەکسان نین، بەر لە هەموو شتێک، بەرزترنرخاندنی پیاو بەرامبەر بە ژن، بەرزترنرخاندنی موسڵمان بەرامبەر ناموسڵمان و سێهەمیش بەرزترنرخاندنی کەسی ئازاد بەرامبەر بە کەسی کۆیلە.[1] هەموو ئەم داوەریکردنە فیقهییانە ناکۆکن بە یەکەمین سەرەتاگە و پرنسیپی ناو بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ، کە پێی وایە مرۆڤەکان هەموویان لەگەڵ یەکتردا یەکسانن. "علیمی کەلام"ی ئیسلامیش زانستێک نییە قسە لەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگە بکات، بەڵکو زانستی ناسینی خودا و ناسینی ئاکار و سیفەتەکانی خودایە. زانستی فیقهـ زانستی داواکاری و تەکلیفە شەرعییەکانە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خودا. سۆفیزم و تەسەوف، زانست یان مەعریفەی گەیشتن بە خودا و فەنابوونە لەناو ئەو پەروەردگارە گەورەیەدا، تەنانەت فەلسەفەی ئیسلامییش فەلسەفەیەکە کێشە سەرەکی و بنەڕەتییەکەی کێشەی سازانی عەقڵە لەگەڵ حیکمەتەکانی خوداوەنددا. لە هەموو ئەم دۆخانەدا مرۆڤ یان بەتەواوی غائیبە، وەک لە علیمی کەلامدا، یان بە شێوەیەکی پەراوێزی ئامادەیە، وەک لە فەلسەفەدا. ئەمەش شتێک نییە جیاواز لە شێوازەکانی تری فیکر لە دونیای بەر لە لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن لە بەشەکانی تری دونیادا، چونکە وەک فوکۆ دەڵێت، "ئینسان" داهێنراوێکی نوێیە و تەمەنی دروستبوونی وەک بابەتی فیکر و مەعریفە و زانست دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی

---

١_بڕوانە: محمد الشرفي (٢٠٠٨). سوء التفاهم التاريخي. ڕابطە العلمانيين العرب. ل ١٠٥

هەژدەهەم. تەنها لەگەڵ لەدایکبوونی زانستە مۆدێرنەکاندا مرۆڤ وەک بابەتی مەعریفە لەدایک دەبێت.[1]

## لەدایکبوونی بیرۆکەی مرۆڤی یەکسان

ئەوەی تا ئێستا باسمان کرد، ئەو وێناکردنانە بوو بۆ مرۆڤ کە وەک بوونەوەری نایەکسان بە یەکتری لەئارادا بوو، بەڵام وەک پێشتریش باسمان کرد، ئەم وێناکردنە لە سەدەی هەژدەهەمدا بەتەواوی گۆڕانی بەسەردا دێت و وێنەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و وەک کەسێک یەکسان لەگەڵ مرۆڤەکانی دەوروبەریدا لەدایک دەبێت. ئەم وێنەیە بەتوندی بە وردەکارییەکانی ئەو دونیایەوە گرێ دراوە، کە لەگەڵ هاتنەکایەی مۆدێرنەدا دێتە کایەوە و یەکێک لە دەرکەوتە سەرەکییەکانی مۆدێرنە لەم ڕووەوە لەدایکبوونی چەمکی "هاووڵاتی"، چەمکێک وەک پێشتر نیشانمان دا، بەشێک نییە لە مێژووی هیچ یەکێک لە کۆمەڵگەکانی دونیا و هیچ یەکێک لە دینەکان و شێوازەکانی تری بیرکردنەوەی نادینییش. بیرۆکەی سەرەکیی "هاووڵاتیبوون"ی مۆدێرن، بیرۆکەی یەکسانبوونی مرۆڤەکانە لەبەردەم یاسا و لە بەرامبەر یەکتریدا، هاوشان بە ئامادەگیی کۆمەڵێک ماف، کە هیی هەموو ئەوانەیە وەک هاووڵاتی دەبینرێن و مامەڵە دەکرێن. وێنەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و یەکسان لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا

---

١_بڕوانە: میشیل فوکو (١٩٨٩-١٩٩٠). الکلمات والأشیاء. ترجمە نخبە من المترجمین. بیروت، مرکز الانماء القومی.

لەناو دونیای مۆدێرندا بەتوندی بە چەمکی هاووڵاتیبوونەوە گرێ دراوە. من لە بەشەکانی پێشتری ئەم نووسینەدا باسم لە لەدایکبوونی بیرۆکەی "مافی سروشتی" و بیرۆکەی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" کرد، لێرەدا باس لە چەمکی سێهەم دەکەم، کە ڕۆڵێکی گەورە لە دروستبوونی وێنەی مرۆڤدا وەک بوونەوەری یەکسان دەبینێت، کە چەمکی هاووڵاتییە.

لە فیکری سیاسی و کۆمەڵایەتیی مۆدێرندا هاووڵاتی کەسێکە هەم خاوەنی مافە، هەم خاوەنی خۆیەتی و هەم ئازادیشە، هەم لەناو دەوڵەتێکدا ئامادەیە کە لەسەر بنەمای "ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی" دروست بووە و کار دەکات. لە مێژووی مۆدێرندا چەمکی هاووڵاتیبوون لە پەیوەندیدا بە دەوڵەتەوە بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ بە چەمکی "نەتەوە"ی مۆدێرنەوە گرێ دراوە، نەتەوە ئەو چوارچێوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەمزییە سەرەکییەیە کە تیایدا چەمکی هاووڵاتی و هاووڵاتیبوون لەدایک دەبێت. لە "ڕووی پرنسیپەوە" لەناو ئەم یەکە سیاسییە نوێیەدا، واتە لەناو نەتەوەدا، هیچ جۆرە جیاکاری و هەڵاوێردنێک لەسەر بنەمای سروشت و ڕەگەز و چین و توێژی کۆمەڵایەتیدا لەنێوان ئەوانەدا ناکرێت کە دەبن بە بەشێک لەم نەتەوەیە. هەموو کەسێک بە هەمان بڕ و بە هەمان ڕادە ئەندامی ئەو نەتەوەیەیە، کەس لە کەس ئەڵمانیتر و ئەمەریکیتر و کوردتر و فەرەنسیتر نییە. دەڵێم لە ڕووی پرنسیپەوە، نەک لە ڕووی واقیعی و مێژووییەوە، جیاوازیی لەنێوان مرۆڤەکاندا ناکرێت، چونکە لە دونیای مۆدێرن و لە چوارچێوەکانی دەوڵەتی نەتەوەدا چەندان شێوازی هەڵاوێردن و جیاکاری لە ئارادایە، کە تا ئەمڕۆش هەن و بەردەوامن.

ئـەوەی لێـرەدا ڕوو دەدات، دروسـتبوونی "یەکسـانی"ی ڕاسـتەقینە نییـە لەنـاو مێـژوودا، بەڵکـو دروسـتبوونی لانـی کەمـی یەکسـانییە، یـان دروسـتبوونی "وێنەیەکـی یەکسـانییە" کـە هەمـووان لـە ڕووی تیۆرییـەوە قبووڵیانـە. لەدایکبوونـی ئـەم وێناکردنـە، لەدایکبوونێکـی گرنگـە و هەنگاوێکـی بنەڕەتییـە بـە ئاراسـتەی دۆزینـەوەی پێوەرێـک بـۆ پێوانـی بـڕ و ڕادەی یەکسـانی و نایەکسـانی لـە کۆمەڵگـەدا. پێناسـەکردنی مـرۆڤ لـە ڕێگـەی مافەکانیـەوە، نـەک لـە ڕێگـەی ئینتیمـای دینـی و کۆمەڵایەتـی و ئەتنییـەوە، لەنـاو چوارچێـوە گشـتییەکانی دروسـتبوونی دەوڵەتـی نەتەوەییـدا، ئـەو هەنـگاوە گرنگەیـە کـە وێنـە سـەرەکییەکانی مرۆڤ وەک مرۆڤی خاوەنماف و یەکسـان لـە دونیـای مۆدێرنـدا مەیسـەر دەکات. دەوڵەتـی نەتـەوەش یەکەیەکـی سیاسـیی نوێـی نـاو دونیـای مۆدێرنـە و یەکێکـە لـە ئەکتـەرە سـەرەکییەکانی تازەکردنـەوەی ئـەو دونیایـەش.

## دەوڵەتی مۆدێرن و نەتەوە

لە سـەردەمی ماکیاڤێلییەوە (١٤٦٩-١٥٢٧)، واتە لە سـەرەتاکانی سەدەی شانزەهەمەوە، دەوڵەت وردە وردە وەک ئەو چوارچێوە گرنگە بیری لێ دەکرێتـەوە، کە سـەرجەمی ژیانـی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و فەرهەنگیی کۆمەڵگە ڕێک دەخـات. واتـە دەوڵـەت دەبێتـە چوارچێوەی سـەرەکیی ڕێکخسـتنی سـەرجەمی مەسـەلە جیاوازەکانـی پێکەوەبوونـی کۆمەڵایەتـی لەنـاو ڕووبەرێکـی سیاسـیی گشـتیدا. لـەم ڕوانینە تازەیەدا، دەوڵـەت دەبێتە هەڵگری

کۆمەڵێک یاسا بۆ حوکمڕانی و ڕێکخستنی کۆمەڵگە، کە هیچیان کەمتر نییە لەو یاسایانەی جووڵەی وەرزەکان ڕێک دەخەن.[1] بە مانایەکی دیکە، دەوڵەت لێرەدا وەک دیاردەیەکی سروشتی وێنا دەکرێت و یاساکانی بە یاساکانی سروشت بەراورد دەکرێت. بەڵام ئەم "سروشت"ە تازەیە ئەو "سروشت"ە نییە کە ئەرستۆ باسی دەکات، وردتر بدوێین، ئەم سروشتە چیتر ئەو سروشتە ئەرستۆییە نییە کە تیایدا هەندێک بە کۆیلایەتی و بۆ کۆیلایەتی لەدایک دەبن و هەندێک بۆ حوکمڕانی و بەسەروەربوون. لەم ڕوانینە تازەیەدا، بۆ دەوڵەت دەستەبەرکردنی "یەکێتیی سیاسی" مەرجی سەرەکیی ژیانی کۆمەڵایەتییە، دەوڵەت یاسادانەری ئەم "یەکێتییە سیاسی"یەیە کە ئاکارێکی سروشتیی پێ دەبەخشرێت و بە بنەمای هەموو ئارامی و ئاسایشێک دادەنرێت. هەر خودی ئەم یەکێتییە سیاسییەش دەستنیشانی ئەوە دەکات چ سیاسەتێک ڕاستە لە کۆمەڵگەدا پەیڕەو بکرێت و چیش خراپە وازی لێ بهێنرێت و نەکرێت. ئەم یەکێتییە سیاسییەش کە دەوڵەت دەیەوێت دروستی بکات، یەکێتییەکی زۆر فراوانتر و کراوەترە لەوەی ئەرستۆ بیری لێ دەکردەوە و زۆر فراوانتریشە لەوەی لە ڕووی کردەییەوە لە شارە یۆنانییە کۆنەکاندا پیادە دەکرا. بەڵام ئەو دەوڵەتە، کە هەم ماکیاڤیللی لە ئاستی تیۆریدا باسی دەکات و هەم ئەوەشی بە کردەوە لەو سەردەمەدا بوونی هەبووە و ئامادە بووە، هێشتا دەوڵەت نییە بە مانا مۆدێرنەکەی دەوڵەتی نەتەوە. ئەو یەکە سیاسییە گشتییە کە ماکیاڤیللی باسی دەکات نەتەوە نییە بە مانا مۆدێرنەکەی.

---

[1]_بڕوانە: تاریخ الافکار السیاسیه. معهد الانماء العربی. ل٥٢

نەتەوە هێشتا وەک یەکەی سەرەکیی کۆکردنەوەی کۆمەڵایەتیی کەس و گروپە جیاوازەکان لەدەوری پرۆژەیەکی سیاسیی دەستەجەمعی لەدایک نەبووە. دەوڵەتی سەردەمی ماکیاڤیللی هێشتا دەوڵەتێکی فیوداڵیی دەرەبەگایەتییە، تیایدا پادشا و لۆرد و دەسەڵاتە لۆکاڵییەکان، ئەمیرەکان و ئەرستۆکراتەکان، سێنتەری هێز و دەسەڵات و ئینتیمان. ئەو سەرزەمینەش کە ئەمانە حوکمڕانیی دەکەن، کۆمەڵێک ئیمارەت و میرنشینی بچووکە کە پادشاکان و ئەمیرەکان بە موڵکی شەخسیی خۆیانی دەزانن و وەک موڵکی شەخسیی خۆشیان مامەڵەی دەکەن. هێشتا شتێک بە مانای سەرزەمینێکی نەتەوەیی کە بوونی سەربەخۆ و یەکگرتووی هەبێت و هیی هەموو کۆمەڵگە بێت، لەدایک نەبووە. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە، لە سەردەمی ماکیاڤیللییەوە دەوڵەت تا دێت پێگەیەکی گەورەتر و گرنگتر لە ژیانی کۆمەڵگەکاندا وەر دەگرێت و پێبەپێی گۆڕانی ئەو کۆمەڵگەیانەش شێواز و ئەرک و دەزگا و کارەکانی گۆڕانی گەورەیان بەسەردا دێت. ئەم گەشەکردنەی دەوڵەت ئەو هەلە بە ماکیاڤیللی دەدات کە کایەی دەوڵەت و کایە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکان لە یەکتر جیا بکاتەوە و لەوێشەوە "کایەی سیاسەت" لە هەردوو "کایەی دین" و "کایەی ئەخلاق" داببڕێت و وەک کایەیەکی سەربەخۆ نمایشی بکات. لای ماکیاڤیللی، سیاسەت تەکنۆلۆژیای سەرەکیی حوکمڕانیکردنە، چالاکییەکە جیاواز لە چالاکییە ئینسانییەکانی تر و هەڵگری لۆژیکێکیشە تەواو جیاواز لە لۆژیکی چالاکییەکانی تر. لە سەردەمی ماکیاڤیللییەوە ئەنجامدانی هەڵە و کارەساتی سیاسی لەلایەن دەوڵەتەوە وەک گوناهێکی دینی یان ئەخلاقی وێنا ناکرێت،

بەڵکو وەک هەڵە و گوناهێکی سیاسی و سەربازی وێنا دەکرێت و پێویستیشە بەپێی لۆژیکی سیاسی مامەڵە لەگەڵ ئەم هەڵە و گوناهە سیاسییەدا بکرێت. لە پەیوەندیدا بە دینەوە، ماکیاڤیللی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ناکرێت یاسا ئەخلاقییەکانی دین ببن بە یاسا ئەخلاقییەکانی سیاسەت، لەکوێشدا یاسا ئەخلاقی و دینییەکان بوونە هۆی دروستبوونی کێشە و ململانێی سیاسیی گەورە و کارەساتی سیاسییان لێ کەوتەوە، لەوێدا دەبێت ئەو یاسا ئەخلاقی و دینییانە یەک بخرێن. ئەم ڕوانینە نوێیە بۆ کار و ئەرکی سیاسەت، ئەو ڕووبەرە مرۆییە تەواو گەورە دەکات کە دەوڵەت بە ڕووبەری کارکردنی خۆی دەزانێت، چیتر تەنها ئەندامی ئەم یان ئەو دین، ئەم یان ئەو مەزهەبی ئایینی وەک "ڕەعیەت"ی دەوڵەت مامەڵە ناکرێت، بەڵکو ئەم "ڕەعیەتبوونە" فراوانتر دەبێت بۆ بەشی هەرە زۆری ئەو "دانیشتووان"ەی دەکەوێتە ناو سنوورەکانی ئەو دەوڵەتەوە، بەبێ گوێدانە ئینتیمای دینییان. یەکێک لەو کارانەی دەوڵەتی مۆدێرن لە سەردەمی ماکیاڤیللییەوە وردە وردە پێی هەڵدەستێت، وازهێنانێکی لەسەرخۆی دابەشکردنی مرۆڤەکانە لە ڕێگەی دینەوە و کۆکردنەوەیانە بە هەموو جیاوازییەکانیانەوە لەژێر چەمکی "دانیشتووان"دا. لەم ڕوانینە نوێیەدا خودا تا ئەو شوێنە دەخرێتە ناو سیاسەتەوە و دەبێت بە بەشێک لە دەوڵەت، کە نەبێتە هۆی دروستبوونی جیاوازی و پارچەپارچەبوونی دۆخی سیاسی وڵات و کارەساتی سیاسی و کۆمەڵایەتیی لێ نەکەوێتەوە، واتە خودا نەبێتە هۆکاری لەتلەتبوونی سیاسی و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگە. ئەم بۆچوونە تازەیەی ماکیاڤیللی تەواو ناکۆک بوو بە بۆچوونی پیاوانی

دینیی سەردەمەکەی خۆی و دوای خۆشی، چونکە، بۆ نموونە تەنانەت کەسێکی وەک مارتن لوتەریش کە نوێنەرایەتیی ڕیفۆرمی دینیی دەکرد، لەسەر ئەو باوەڕە بوو، ئەگەر خودا لە بوارێکدا کرایە دەرەوە، بۆ نموونە لە سیاسەتدا، ئەودەم لە هەموو بوارەکانی تریشدا دەکرێتە دەرەوە. بۆیە دژایەتیی کردنەدەرەوەی خودای دەکرد لە سیاسەتکردندا.[1]

لای ماکیاڤیللی گرنگیی سیاسەت وەک چالاکییەکی نوێ لە سەرووی گرنگیی سەرجەمی چالاکیيە کۆمەڵایەتییەکانی ترەوەیە، بوونی حکومەت و حوکمڕانییەکی کارا و لێزان بنەمای ژیانێکی هێمن و دروستبوونی کۆمەڵگەیەکی ئامێزان و ژینگەیەکی مەدەنییە. لێرەبەدوا، بیرکردنەوە لە دەوڵەت بەگشتی و لە مەسەلەی حوکمڕانی بەتایبەتی، ئازادییەکی ڕێژەیی وەر دەگرێت کە دەرەنجامەکانی لە سەدەکانی دواتردا دەر دەکەوێت، لە پەیوەندیشیدا بە کۆمەڵگەوە هێدی هێدی سەرەتاکانی دەرکەوتنی چەمکی "دانیشتووان" دێتە کایەوە، کە سەرجەمی ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە سنووری دەوڵەتێکدا ئامادەن و دەوڵەت هەموویان بە بەشێک لە پێکهاتەی خۆی دەزانێت. ئەم گەشە ناوەکییە، وەک فۆکۆ دواتر باسی دەکات، لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا گەشەی تەواوەتی دەکات و "دانیشتووان" دەکاتە یەکێک لە چەمکە سەرەکییەکانی ناو سیاسەتی مۆدێرن.[2]

---

١_بڕوانە: کۆمەڵێک وانەی زانا و کۆمەڵناسی ئەڵمانی George L. Mosse لە زانکۆی واشنتۆن لە ساڵی ١٩٦٩دا. http://mosseprogram.wisc.edu/ audio_history119.htm

٢_بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە، بڕوانە: Bruce Curtis(2002). **Foucault on Governmentality and Population: The Impossible**

ئەم پێگە گرنگەی دەوڵەت لە ژیانی کۆمەڵگەدا بەدەستی دەهێنێت، دواتر لای هۆبز تێکەڵ دەبێت بە وێنەیەکی تایبەت بۆ ئینسان و بۆ دۆخی سروشتیی مرۆڤەکان، هەروەها بۆ گەشەدان بە فەلسەفەیەکی تایبەت سەبارەت بە ئارەزووەکانی مرۆڤ. ئەگەرچی لێرەدا ناچارم هەندێک لە بۆچوونەکانی هۆبز جارێکی دیکە دووبارە بکەمەوە، بەڵام دووبارەکردنەوەکە بە مەبەستی نیشاندانی ئەو دیدە تازەیەیە کە هۆبز لە پەیوەندیدا بە دەوڵەت و کۆمەڵگەوە لەدوای ماکیاڤێللییەوە بەرگریی لێ دەکات. هۆبز ڕای وا بوو کە مرۆڤ "ئامێرێکی سروشتی"یە و زنجیرەیەک هۆکاری ورد ئەم ئامێرە ئاراستە دەکات، لەپێش هەموانیشەوە ئارەزووەکان و تواناکانی مرۆڤ بۆ جووڵە و جێگۆڕکێ. لەم ڕوانینە هۆبزییەدا، مرۆڤ هەم بوونەوەرێکی خاوەنئارەزووە، هەم بوونەوەرێکی خاوەن هێز و تواناشە، بۆیە ئەم هێز و توانایە پەیوەندییەکی پتەو بە مەسەلەی دابینکردنی ئەو ئارەزووانەوە دروست دەکەن. مرۆڤ بە سروشتی خۆی، ئامێرێکە ئارەزوەکانی دەیجووڵێنێت و ئەو هێز و توانایەشی هەیەتی دەیخاتە گەڕ بۆ پیادەکردنی ئەو ئارەزووانە. ئەوەی لەم "دۆخە سروشتی"یەدا سنوور بۆ هەڵسوکەوت و کار و کردەوەکانی مرۆڤ دادەنێت، تەنها بڕ و ڕادەی هێز و توانا ماددییەکانی مرۆڤە، کەی مرۆڤ بەهێز بوو، هەموو شتێک دەکات بۆ پیادەکردنی ئارەزووەکانی و کەی لاوازیش بوو بەپێی گەورەیی و بچووکیی خاڵە لاوازەکانی

**Discovery.** *The Canadian Journal of Sociology / Cahiers canadiens de sociologie* Vol. 27, No. 4 (Autumn, 2002), pp. 505-533

هەڵسوکەوت دەکات. بەڵام مرۆڤ لای هۆبز لە هەمان کاتدا "ئامێرێکی هەستدار"یشە، هەستی ڕق و حەز و حەسودی و بەغیلی و ترس لە هەستە سەرەکییەکانیەتی و ئەمانەش بەسەر یەکەوە هەڵسوکەوتی مرۆڤ ئاراستە دەکەن، بەتایبەتی ترس لە مردن و ئازارچەشتن و دەردەسەریی زۆر. ئەم دۆخە وا دەکات دۆخی سروشتیی مرۆڤ لە یەک کاتدا هەم دۆخی ئارەزووی زۆر و هەم دۆخی ترسی زۆر بێت، هەموو ئەمەش لە دۆخی نەبوونی کۆمەڵێک یاسا و بەهادا، کە پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان ڕێک بخات، جگە لە پەیوەندیی هێز، وا دەکات مرۆڤ هەم لە دۆخی جەنگی بەردەوام و هەم لە دۆخی بەدبەختی و ترسێکی بەردەوامدا بژی. لە دۆخی سروشتیدا حەزی مرۆڤ لە ژیان و هەوڵدانی ئەو بۆ پیادەکردنی ئارەزووەکانی تێکەڵ دەبێت بە ترسێکی بەردەوام لەوی تری بەهێز و لە ئازار و لە مردن. حەز لە هێز و حەز لە ژیان، بەتایبەتی ژیانێک بەئارامی بەڕێوە بچێت، ئەو ناکۆکییە سەرەکییەیە کە مرۆڤەکان لەناوەوە ئاراستە دەکات. ئەم دۆخە مرۆڤەکان ناچار دەکات بیر لە شتێک بکەنەوە، بتوانێت لانی کەم ترسە بەردەوامەکەیان بڕەوێنێتەوە و چوارچێوەیەکی هاوبەش دروست بکەن بۆ مەیسەرکردنی لانی کەمی پێکەوەبوونێکی هێمنانە. لە دیدی هۆبزدا، دروستکردنی هێزێک کە بتوانێت سەرجەمی هێزەکانی تر بهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، ئەو ستراتیژەیە کە بە هۆیەوە مرۆڤ لە دۆخی سروشتییەوە بۆ دۆخی مەدەنی یان بۆ دۆخی سیاسی دەپەڕێتەوە، ئەم هێزە گەورە و گشتییەش کە دروست دەکرێت، دەوڵەتە. دەوڵەت لێرەدا وەک خودایەک یان وەک بوونەوەرێکی خورافیی گەورە و هەمەتوانا وێنا

دەکرێت، کە هیچ هێزێک ناتوانێت سنووورداری بکات جگە لە پێشمەرجی دابینکردنی ئاسایش بۆ کۆمەڵگە، یان پاراستنی ژیان و دواخستنی مردنی مرۆڤەکان، یان کورتکردنەوەی مردن تەنها بۆ مردنێکی سروشتی و سەندنەوەی ماف و توانای کوشتن لە مرۆڤەکان خۆیان. ئەم وێناکردنە بۆ ئینسان، بنەما سەرەکییەکەی کتێبی لڤیتان دەستنیشان دەکات، کە ساڵی ١٦٥١ نووسراوە.[١] ئەم دۆخە وا دەکات، دەوڵەت خاوەنی سەروەرییەک بێت گەورەتر لە هەموو سەروەرییەکانی تر، ئەم سەروەرییەش، واتە سەروەریی دەوڵەت، شتێکە ناکرێت دابەش ببێت و هیچ سنوورێکیش نییە دەوڵەت نەتوانێت بیبەزێنێت، گەر هات و ئەو بەزاندنانە لەپێناوی دابینکردنی ئەمن و ئاسایشدا بێت. تیۆرەی دەوڵەت لای هۆبز هێما بۆ ئەوە دەکات کە مرۆڤ تەنها بە ئەخلاق ناژی و ئەخلاق ناتوانێت مرۆڤ لە خراپەکاری و ئەنجامدانی توندوتیژی و پەلاماردانی دونیای دەوروبەری بپارێزێت. پەنابردن بۆ دەوڵەت وەک داوەرێک لەنێوان مرۆڤە جیاوازەکاندا، مانای نائومێدبوونە لە توانا ئەخلاقییەکانی مرۆڤ و لەوێشەوە نائومێدبوونە لە دین و کولتوور و فیکر لەوەی بتوانن بەتەنها ژیانێکی هێمن و دوور لە توندتیژی دروست بکەن. ئەوەی لەم دۆخە هۆبزییەدا نوێیە، سەرلەنوێپێداگرتنەوە نییە لەسەر ئەو دیدە ماکیاڤیللییە کە بواری سیاسی و بوارەکانی دیکە لە یەکتری جیا دەکاتەوە و کاری دەوڵەت وەک کارێکی سیاسی دەناسێنێت، بەڵکو ئەوەشە کە مرۆڤەکانی ناو "ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی" لای هۆبز چیتر یاسای ئاغا و کۆیلەیان بەسەردا

---

١_تاریخ الافکار السیاسیه. ل ٧٢-٧٣-٧٤.

پیادە نابێت و زۆرینەی ئەو مرۆڤانە دەچنە دۆخێکی نوێوە کە دۆخی بە"ڕەعیەت"بوونێکی یەکسان یان نیمچەیەکسانە لە بەردەمی ئەو بوونەوەرە تازەیەدا کە ناوی دەوڵەتە.

دۆخی سروشتی لای هۆبز لە زۆر سەرەوە یەکسانە بەو دۆخی "فیتنە"یەی فەلسەفەی سیاسی لە ئیسلامدا، بەتایبەتی لە ئیسلامی سوننەدا، بەرگریی لێ دەکات. ئەگەر لای هۆبز هەموو دەسەڵاتێکی ڕێکخراو لە دۆخی سروشتی باشتر بێت، ئەوا لای فوقەهاکانی ئیسلامیش هەموو دەسەڵاتێکی ڕێکخراو لە دۆخی فیتنە باشترە. هۆبز لەم ڕووەوە دەنووسێت "دەسەڵاتێکی خاوەنسەروەری کەمتر ئازاربەخشە تا دۆخی نەبوونی هیچ دەسەڵاتێک."[1] ئەمەش لە زۆر سەرەوە دووبارەکردنەوەیەکی تەواوی ئەو قسەیەی ئیبن تەیمییەیە کە دەڵێت "شەست ساڵ ستەمگەری لە ڕۆژێک فیتنە باشترە." ئەوەی جیاوازە لەپشتی ئەم وێناکردنەی هۆبزەوە بۆ دەوڵەت، وێنەیەکی کۆمەڵگە ئامادەیە جیاوازە لەو وێنەیەی لە دیدی فوقەها ئیسلامییەکاندا هەبوو. ئەم خاڵە لە لاپەڕەکانی پێشوودا بەدرێژی باس کرا.

گەشەکردنی ئەم دەوڵەتە تازەیە لە سەردەمی ماکیاڤیللییەوە بە دوو ئاراستەدا دەڕوات. لە سەرێکەوە لە "دەوڵەتی ئابسلوتیزم"ەوە بۆ "دەوڵەتێکی لیبراڵ" و دیموکراسیی خاوەندەستوور، لە سەرێکی دیکەوە لە "دەوڵەتی ئەمیر"ەوە بۆ "دەوڵەتی نەتەوە." ئەم گەشەیەش لەگەڵ خۆیدا وێنەی مرۆڤەکان وەک هاوولاتی و تاکەکەسی یەکسان لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. پرۆسەی مۆدێرنبوونەوەی کۆمەڵگەکان و پرۆسەی دەستکاریکردنێکی بەردەوامی شێوازەکانی دەوڵەت، هاوشانە

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧٦.

بە دروستبوونی ویناکردنی نوێ بۆ مرۆڤ تا لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم و لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا مرۆڤ لەناو ئەم پرۆسە جیاوازانەدا لە ڕەعیەتێکی سیاسییەوە دەگۆڕێت بۆ "هاووڵاتی" و لە ئەندامی ئەم یان ئەو تائیفەی دینی و ئەتنییەوە دەبێت بە ئەندامی نەتەوەیەکی مۆدێرن. بەکورتی، ئەوەی لەنێوان سەدەی شانزەهەم و کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا ڕوو دەدات، گۆڕانی "دەوڵەتی ئەمیر"ی ماکیاڤیللییە بۆ "دەوڵەتی نەتەوە"ی مۆدێرن و گۆڕانی "ڕەعیەت"ەکانی ئەم دەوڵەتانەیە بۆ "نەتەوە." پرسیاری سەرەکی لە دروستبوونی نەتەوەدا، پرسیاری ئەوەیە ئایا سنوورەکانی نەتەوە لەکوێدا کۆتاییان دێت؟ کێ دەتوانێت بەشێک لە نەتەوە بێت و کێ هاووڵاتیی ئەو دەوڵەتەیە کە نەتەوە دروستی دەکات؟ کێش دەکەوێتە دەرەوەی سنوورەکانی نەتەوەوە؟

## نەتەوە وەک چوارچێوەیەک بۆ مرۆڤی یەکسان

یەکەمین هەوڵی تیۆری بۆ پێناسەکردنی نەتەوە بۆ سەردەمی شۆڕشی فەرەنسی دەگەڕێتەوە، لەو سەردەمەدا نووسەرێک بەناوی ئیمانوێل جۆزێف سیەس Sieyes (١٧٤٨-١٨٣٦) بۆ یەکەم جار کتێبێک بڵاو دەکاتەوە کە لە مێژووی ناسیۆنالیزمدا بە یەکێک لەو کتێبە سەرەتاییانە دادەنرێت، کە باس لە دیاردەی نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوە دەکات. ناونیشانی کتێبەکە ئەمەیە: "ئایا عامەی خەڵک کێن؟"[1] لای

١_هەمان سەرچاوەی پێشو ل ١٣٧.

ئەم نووسەرە، "عامەی خەڵک" چیدی خەڵکی بەشی ژێرەوەی کۆمەڵگە و ئەو زۆرینە کۆمەڵایەتییە نین کە ئەرستۆکرات و فیوداڵەکان وەک گەمژە و ڕەعیەت و گاگەل مامەڵەیان بکەن، بەڵکو بەشێکن لە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی نوێ کە ناوی "نەتەوە"یە. نەتەوە لە دیدی ئەم نووسەرەدا، پێدراو یان دروستکراوێکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو یەکەیەکی تایبەتە بەر لە هەر کارێکی سیاسی و تەشریعی بوونی هەیە، نەتەوە دیاردەیەکی سروشتییە بەڵام هەڵگری کۆمەڵێک ماف و بەرپرسیارێتیی یەکسانە. نەتەوە لە کۆمەڵە تاکەکەسێکی ئازاد و یەکسان و سەربەخۆ و فرەڕەنگ و جیاواز پێک دێت، کە کۆمەڵێک پێداویستیی هاوبەش و سروشتیی پەیوەست بە مرۆڤبوونەوە و ئیرادەی پێکەوەژیانێکی هاوبەش بەیەکەوە کۆی کردوونەتەوە. ئەم نووسەرە پێی وایە، بەبێ بوونی ئەم ئیرادەیە و بەبێ وێناکردنی نەتەوە خۆشی وەک فیکرەیەک، تاکەکەسەکان ناتوانن خۆیان بپارێزن و لە بەردەم ئەو هێزە خراپەکارانەشدا خۆڕاگر بن کە دێنە ڕێیان. واتە نەتەوە دیاردەیەکی سروشتییە کە مرۆڤ و تاکەکەس پێویستیان پێیەتی بۆ ئەوەی بتوانن بەیەکەوە بژین و خۆیان لە مەترسییەکانی لەناوچوون بپارێزن. لەناو ئەم دیدەدا بۆ نەتەوە، هەموو تاکەکەسێک توانا و ئەگەری ئەوەی تێدایە کە ببێت بە هاووڵاتیی ئەو نەتەوەیە، بەڵام ئەوەی کەسێک بە کردەوە دەکات بە هاووڵاتیی ڕاستەقینە، کۆبوونەوەی ئیرادەی ئەو کەسەیە لەگەڵ ئیرادەی کەسەکانی تردا بۆ ئەوەی پێکەوە بتوانن دەسەڵاتێکی نەتەوەیی دروست بکەن. مەرجی کۆکردنەوەی ئیرادە تاکەکەسییەکان و ڕێکخستنیان لە یەک ئیرادەی گشتیدا ئەوەیە، سەرجەمی ئەو دەسکەوت و ئیمتیازانە

لا ببرێت کە بەشێک لە خەڵک لە ساتەوەختی لەدایکبوونەوە هەیانە و بەشێکی تریش لە هەمان ساتەوەختەوە نییانە. یەکسانبوونی هەمووان لە خاڵی سەرەتادا مەرجی بنەڕەتیی دروستبوونی نەتەوەیە. پاکژکردنەوەی کۆمەڵگەش لەوانەی نایانەوێت دەستبەرداری ئەو دەسکەوت و ئیمتیازاتە بۆماوانە ببن، مەرجی سەرەکیی یەکخستنی ئیرادەیە و یەکخستنی ئەم ئیرادەیەش مەرجی سەرەکیی دروستبوونی نەتەوەیە. ئیرادەی گشتی و یەکخراو تەنها ئیرادەی پێکەوەژیان نییە، بەڵکو ئیرادەی پێکەوەژیانێکی یەکسانە، ئیرادەی ئەوەیە کەس لە ڕۆژی لەدایکبوونیەوە لەوی تر زیاتر یان کەمتر نەبێت، شتێک بوونی نەبێت ناوی "سروشت"ی جیاوازیی ئەم یان ئەو تاکەکەس بێت لە یەکتر و لەسەر بنەمای ئەم "سروشت"ە گریمانکراوەش مافی زیاتر یان کەمتر بەم یان بەو تاکەکەس ببەخشرێت. سەرچاوەی ڕەوایەتیی ئەو دەسەڵاتەش کە کەسەکان وەک بوونەوەری یەکسان مامەڵە دەکات، خودی نەتەوە خۆیەتی، نەتەوە خۆشی کۆی ئەو خەڵکە جیاوازانەیە کە لەناو کۆمەڵگەدا بەیەکەوە دەژین. ئەو یەکە سیاسییەش کە پێویستە ئەم دەسەڵاتە نەتەوەییە ڕێک بخات و ئازادی و یەکسانیی نێوان هاوولاتییان و مافە سروشتییەکانیان بسەلمێنێت، دەوڵەتی نەتەوەیە. لەم ڕوانینەدا نەتەوە چیتر لەناو جەستەی ئەمیر و پادشاکاندا بەرجەستە نابێت، لەشی پادشا و لەشی نەتەوە یەک لەش نین و لەشی پادشا سیمبۆڵ و نوێنەری لەشی نەتەوە نییە، بە پێچەوانەوە، نەتەوە لەباتی ئەوەی لەناو لەشی پادشا و دەسەڵاتداراندا نیشتەجێ ببێت، لەناو چەندان دەزگا و دامەزراو و شێوازی نوێنەرایەتیکردنی نوێدا بەرجەستە دەبێت. دەوڵەت خۆشی چیتر

درێژکراوەی لەشی پادشا نییە و لەو لەشەوە نایەتە دەرەوە، بەڵکو بەرجەستەکەری لەشی نەتەوەیە و لە لەشی نەتەوەوە دێتە دەرەوە و نوێنەرایەتیی ئەو لەشەش دەکات.[1] ئەوەی لەم ڕوانینەدا تازەیەدا بۆ نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوە ئامادەیە، تێزی یەکسانبوونی ئەندامانی ئەم یەکە مۆدێرنەیە لەگەڵ یەکدا، بەبێ دروستبوونی ئەم چوارچێوە سیاسییە تازەیە، زەحمەت بوو بیر لەو وێنە تازەیەی مرۆڤ بکرێتەوە کە وەک بوونەوەرێکی یەکسان و خاوەنماف وێنای دەکات. بەم مانایە، دروستبوونی وێنەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی یەکسان، پابەستی دروستبوونی وێنەی نەتەوەیە وەک یەکەیەکی سیاسیی نوێ کە تیایدا ئەندامانی ئەو نەتەوەیە لە ڕووی پرنسیپەوە بە یەکتری یەکسانن، بۆ ئەوەی تاکەکەسەکان بە یەکتری یەکسان بن، وێنەیەکی کۆمەڵگە و دەوڵەت پێویست بوو کە ئەوان وەک ئەندامی یەکسانی ناو ئەو دوو یەکە گشتییە تازەیە وێنا بکات.

## مافەکان و دۆکۆمێنتە سیاسییەکان

دوو شۆڕشی کۆمەڵایەتی و سیاسی ڕۆڵێکی هێجگار گرنگ لە قووڵکردنەوەی ئەو وێنانەی سەرەوەدا دەبینن و زمان و ڕوانین و وێناکردنێک گەشە پێ ئەدەن کە ماف و یەکسانیی مرۆڤەکان دەستەواژە هەرە سەرەکییەکانیانە. یەکەمیان شۆڕشی ئەمەریکیی ساڵی ١٧٧٦ و ڕاگەیاندنی سەربەخۆبوونی ئەمەریکایە کە بڵاوکردنەوەی "بەیاننامەی مافەکان"ی ساڵی

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٣٨-١٣٩.

١٧٨٧ی لێ دەکەوێتەوە. دووهەمیان شۆڕشی فەرەنسیی ساڵی ١٧٨٩ و بڵاوکردنەوەی "بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتی"یە. ئەم دوو بەیاننامەیە سەرجەمی ئەو گۆڕانکارییانەی باسمان کردن لە چوارچێوەیەکی تازەدا کۆ دەکەنەوە و ئەو وێنە مۆدێرنە بۆ مرۆڤ بەتەواوی دەچەسپێنن کە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و وەک بوونەوەرێکی یەکسان لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا وێنا دەکات. بێگومان بەر لەم بەیاننامانە هەندێک دۆکۆمێنتی تر لە مێژووی سیاسیدا هەبوون کە هەوڵی سەرەتاییان تێدایە بۆ دانانی سنوورێک بۆ دەسەڵاتی پادشاکان و ئەو نایەکسانی و خراپبەکارهێنانەی دەسەڵات کە لە ئارادا بووە، کەمەکێک سنووردار بکەن. نموونەی ئەمانەش ماگنا کارتا، Magna Carta، ساڵی ١٢٩٧ و "کەمپینی مافەکان،" ١٦٢٨ Petition of Rightی ساڵی ١٦٢٨ لە ئینگلتەرادا. هەردوو دۆکۆمێنتەکە لە بەریتانیا نووسراون و بەشێکن لە مێژووی سیاسیی ئەو وڵاتە. ماگنا کارتا ئەو دۆکۆمێنتەیە کە لە ساڵی ١٢٩٧دا هەندێک لە پیاوانی چینی سەرەوەی ئەو وڵاتە بە مەبەستی سنووردارکردنی هەندێک لە دەسەڵاتە ڕەهاکانی پادشای بەریتانیا دەینووسن. نووسینی ئەم دۆکۆمێنتە دوای دروستبوونی کۆمەڵێک ناکۆکیی گەورە دێت کە لەنێوان پادشای بەریتانیا و هەندێک لە بارۆنەکانی ئەو سەردەمەی وڵاتەکەدا دروست دەبێت. دۆکۆمێنتەکە داوای دوو مافی سەرەکی دەکات، یەکەمیان مافی پاراستنی کەنیسە لە دەستتێوەردانی بەردەوامی پادشا، دووهەمیان مافی بارۆنەکان لەوەدا کە بێ هۆ نەگیرێن و زیندان نەکرێن.

ئەمــە جگــە لــە داواکردنــی کەمکردنــەوەی بــڕی ئــەو باجــەی فیــوداڵ و دەرەبەگــەکان پێویســت بــوو بــە پادشــای ببەخشــن. بــۆ پیادەکردنــی ئــەم داوایانــەش، لیژنەیــەک دروســت دەکــەن لــە ٢٥ بــارۆن و ئــەم لیژنەیــە دەکەوێتــە دانوســتانەوە لەگــەڵ پادشــادا. خاڵــی ســەرەکیی ئــەم دۆکۆمێنتــە، بەرگریکــردن نییــە لــە شــتێک بــە نــاوی "مافــی مــرۆڤ"ەوە، ئەوەی هەیــە داواکردنی پاراســتنی مافــی هەندێــک لــە توێژەکانــی ســەرەوەی کۆمەڵگەیــە لــە بــەردەم دەســەڵاتی پادشــادا، ئەمــە جگــە لــە پاراســتنی مافــی کەنیســە وەک دەزگایــەک. ئــەوەی لێرەدا ئامادەیــە، داواکردنێکی تایبەتــە لــە پادشــا کــە هەندێــک مــاف بــە هەندێــک کەســی دیاریکــراو ببەخشــێت و خــۆی هەمــوو بڕیــارەکان دەر نــەکات، ئەو کەســانەش کــە مــاف وەر دەگــرن "خەڵــک"ی ئاســایی نیــن، بەڵکــو گرووپــە بەهێــز و دەســترۆیشــتوو و دەوڵەمەندەکانــی نــاو کۆمەڵگــەن، لــۆردەکان و فیوداڵــەکان و ڕابەرانــی کەنیســە و پیــاوە دینییــە گــەورەکان و هەندێــک ئەرســتۆکراتن. بــەڵام ســەرەڕای بەرتەســکیی داواکارییــەکان و بەرتەســکیی ئــەو هێزانــەی داواکارییــەکان بــەرز دەکەنــەوە، ئــەم دۆکۆمێنتــە لــە مێــژووی سیاســیی مافەکانــدا وەک هەنــگاوی یەکــەم دەبینرێــت بــۆ سنووردارکردنی دەســەڵاتی پادشــا و مامەڵەکردنــی هەندێــک گرووپــی نــاو کۆمەڵگــە وەک کەســانی خاوەنمــاف. ئــەو مافانــەش بریتــی بــوون لــەوەی پادشــا نەتوانێــت چۆنــی دەوێــت ئــاوا بــاج لــەو کەســانە بســێنێت، یــان موڵــک و ماڵیــان لــێ زەوت بــکات، یاخــود بیانگرێــت و زیندانیــان بــکات.

دۆکۆمێنتــی دووهــەم، وەک وتمــان، دۆکۆمێنتــی "کەمپینــی مافــەکان"ی ســاڵی ١٦٢٨. Petition of Right ئــەم کەمپینــەش

کۆمەڵێک لە سیاسەتمەدارانی بەریتانیا پێی هەڵدەستن دژ بە پادشای بەریتانیا لە سەدەی حەڤدەهەمدا. ئەم سیاسەتمەدارانە داوای ئەوە دەکەن کۆمەڵێک ئازادی دەستەبەر بکرێت کە پادشا بۆی نەبێت دەستیان بۆ ببات، واتە مەبەستی سەرەکیی کەمپینەکە ئەوەیە بتوانن سنوورێک بۆ دەسەڵاتی پادشا دابنێن. بۆ نموونە پادشا نەتوانێت بڕیاری کۆکردنەوەی باجێک دەر بکات کە پەرلەمان لەسەری ڕازی نەبووێت، پادشا بۆی نەبێت بەزۆر سەرباز لای خۆی گل بداتەوە، یان بەبێ هۆکارێک و لەخۆیەوە کەسێک بگرێت و بخاتە زیندانەوە، پادشا نەتوانێت لەخۆیەوە دادگای تایبەت دابنێت و دۆخی ناکاو و ئەحکامی عورفی ڕابگەیەنێت. ئەوانەی بەم کارە هەستان، پەنایان بۆ دۆکۆمێنتی یەکەم، واتە بۆ ماگنا کارتا برد، و داواکارییەکەی خۆیان خستە پاڵ مێژووی ئەو داواکارییانەوە و باسی ئەوەیان دەکرد کە ماگنا کارتا تا ئەمڕۆش زیندووە.

ئەم دوو دۆکۆمێنتە نیشانمان ئەدات بەریتانیا وڵاتی دروستبوونی مافەکانە و یەکەمین باسکردنێکی ماف لە دەرەوەی مافی ڕەهای پادشاکاندا لەم وڵاتەوە دەست پێ دەکات. سیستمی سیاسیی ئینگلیزی بەردەوام سیستمێکی پادشایی بەهێز بووە، بەڵام ئەم پادشایە بەردەوام لەپاڵ بوونی پەرلەمانێکدا کاری کردووە، کە لە کەسانی سەرەوەی کۆمەڵگە پێک هاتووە. لە سەدەی حەڤدەهەمدا ڕۆڵی ئەم پەرلەمانە چالاکتر و بەهێزتر دەبێت و لەوە دەکەوێت بەشێک بێت لە دیکۆرێکی سیاسیی پادشایانە. بەڵام هاوکات بوونی پەرلەمان لە ئەزموونی بەریتانیدا مانای ئەوە بووە

کە بەردەوام دەسەڵاتی پادشا، گەر بە شێوەیەکی زۆر سادە و سەرەتاییش بووبێت، سنووردار بووە و ئەو دیکۆرە سیاسییەی کە هەبووە، هەندێک جار لەوە کەوتووە تەنها ڕۆڵی دیکۆرێک ببینێت. هەموو ئەمانە لە کاتێکدا ڕووی داوە لە بەشەکانی تری ئەورووپادا، بەتایبەتی لە فەرەنسادا، پادشا دەسەڵاتی ڕەهای هەبووە و کەس و هیچ لایەن و دەزگایەک لەئارادا نەبووە بتوانن لە کار و کردەوەکانی پادشاکان بپرسنەوە. ئابسولیتیزم شێوازی سەرەکیی حوکمڕانیکردن بووە. سنووردانان بۆ دەسەڵاتی پادشا تەنها لە ئینگلتەرەدا بەتەواوی لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا دەر دەکەوێت. لە کۆتاییی بەیاننامەیەکدا کە پەرلەمانی ئینگلتەرا لەساڵی ١٦٠٤دا بڵاوی دەکاتەوە، پەرلەمانی ئەو وڵاتە بۆ یەکەم جار دەسەڵاتی خۆی وەک پەرلەمان بە هەمان ڕادەی دەسەڵاتی پادشا بە پیرۆز دادەنێت. لەو بەیاننامەیەدا نووسراوە: "دەنگی خەڵک لەو مەسەلانەدا کە زانیارییان دەربارەی هەیە، وەک دەنگی خوداوەند وەهایە." دەنگی خەڵک کە لە ڕێگەی پەرلەمانەوە دەر دەبڕدرێت، بە هەمان ڕادەی دەنگی خودا و دەنگی نوێنەرەکەی خود، واتە پادشا، پیرۆزە.[١] ئەم جۆرە دۆکۆمێنتانە ئەگەرچی گرنگن و ڕۆڵی بەرچاو لە مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئینگلتەرادا دەگێڕن، بەڵام هێشتا هەڵگری ئەو وێنە گەردوونییە بۆ مرۆڤ نین کە وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و یەکسان نمایشی بکەن. ئەو

---

١_بڕوانە: کۆمەڵێک وانەی زانا و کۆمەڵناسی ئەڵمانی George L. Mosse لە زانکۆی واشنتون لە ساڵی ١٩٦٩دا. http://mosseprogram. wisc.edu/audio_history119.htm بەتایبەتی ئەو دوو وانەیەی باس لە سیستمی سیاسیی ئینگلیزیی ئەو سەردەمە دەکات.

مافانەی داواش دەکرێن، هەندێک مافی کەمن بۆ هەندێک کەس و گرووپی بچووکی ناو کۆمەڵگە. وەک پێشتریش وتمان، مەسەلەی لەدایکبوونی مرۆڤی خاوەنماف وەک دیاردەیەکی گەردوونی، دوا دەکەوێت بۆ سەردەمی شۆڕشی ئەمەریکی و شۆڕشی فەرەنسی. تەنها لە سەردەمی ئەم دوو شۆڕشە و لەناو ڕووداوەکانی ئەم دوو شۆڕشەدا ئەو وێنەیەی مرۆڤ لەدایک دەبێت کە خاوەنی مافی یەکسان و مافی گەردوونییە.

## ڕۆشنگەری و وێنەی مرۆڤ

خاڵێک کە پێویستە لێرەدا ئاماژەیەکی خێرای بۆ بکەین، پەیوەندیی نێوان لەدایکبوونی وێنەی مرۆڤە وەک بوونەوەرێکی یەکسان و خاوەنماف، لە پەیوەندیدا بە "ڕۆشنگەری"یەوە. وەک ئاشکرایە ڕۆشنگەری یەکێکە لە بزووتنەوەی فیکری و مەعریفییە گرنگەکانی دونیای مۆدێرن و خاوەنی چەندەها دید و ڕوانینی نوێیە بۆ مرۆڤ و جیهان و عەقڵ و ئازادی و یەکسانی، کە لە سەدەکانی دوای خۆیدا، واتە لەدوای سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەمەوە، کاریگەریی گەورە لەسەر بەشێکی گەورەی دونیا بەجێ دەهێڵن. دوو بیرۆکەی سەرەکیی ناو ڕۆشنگەری، کاریگەریی گەورە لەسەر ڕوانینی سیاسی بەگشتی و لەسەر وێنەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف بەتایبەتی، بەجێ دەهێڵن. یەکەمیان ئەو پەیوەندییە پتەوەیە کە ڕۆشنگەری لەنێوان سیاسەتکردن و حوکمڕانی و زانستدا دروستی دەکات، دووهەمیان بیرۆکەی

ئازادییە.[1] مەبەست لە بیرۆکەی یەکەمیان داهێنانی جۆرێکی نوێیە لە سیاسەت کە بنەماکەی دین یان یاسای سروشتی یان کەلەپوور، یان عورف و عادەت نییە، بەڵکو زانستە. ئەم دوورکەوتنەوەیە لە دین و کەلەپوور و سروشت و عادەت و تەقالید، مانای بەجێهێشتنی هەموو ئەو جیاکاری و هەرەمیەتانەشە کە لەسەر بنەمای ئەو شتانە لەنێوان ئینسانەکاندا دروست دەکران و دەپارێزران. لەباتی ئەمانە پەنابردن بۆ زانست وەک بنەمای ئەنجامدانی کاری سیاسیی مانای کۆتاییهێنان بە هەڵاوێردن و دروستکردنی فەرق و جیاوازی لەنێوان مرۆڤەکاندا. چونکە لە دیدی ڕۆشنگەراندا، زانست لەسەر بنەمای دۆزینەوەی ڕاستی کار دەکات، نەک لەسەر بنەمای دروستکردن و پاراستنی جیاوازیی دینی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی. ئاشکرایە ئەم پەنابردنە بۆ زانست هەندێک جیاوازی دەسڕێتەوە و لەناو دەبات، بۆ نموونە جیاوازیکردن لەنێوان دینەکان و بەهاکان و کەلەپوورەکاندا، بەڵام هاوکات هەندێک جیاوازیی نوێ دروست دەکات، کە پێشتر لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بوونیان نەبووە، بۆ نموونە جیاکردنەوەی مرۆڤەکان لەسەر بنەمای ڕەگەز-Race، لەسەر بنەمای "قۆناغ"ەکانی گەشەکردن، لەسەر جیاکردنەوەی ئەوانەی "مێژوویان هەیە" لەگەڵ ئەوانەدا کە "مێژوویان نییە." ئەم جیاوازییە تازانە بەتایبەتی لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دێنە

---

١_بۆ وردەکارییەکانی ئەم دوو ئاکارەی ڕۆشنگەری خوێنەر دەتوانێت بۆ ئەو کۆمەڵە وانەیە بگەڕێتەوە کە پرۆفیسۆر ئیان شاپیرۆ لە زانکۆی یل-Yale University، دەربارەی ڕۆشنگەری پێشکەشیان دەکات. کۆمەڵە وانەکە لەسەر یوتوب هەن و خوێنەر دەتوانێت گوێیان لێ بگرێت. بڕوانە:
http://oyc.yale.edu/political-science/plsc-118

کایەوە و دەبنە هۆکارێک بۆ بەخشینی ڕەوایەتی بە ڕاسیزم و ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم. دەڵێم سەرەڕای ئەم ڕاستییە تاڵە کە عەقڵیەتی زانستی لە گەشەکردنی خۆیدا دروستی دەکات، خاڵێک کە شوێنی نکووڵیکردن نییە، ئەوەیە گەڕانەوەی ڕۆشنگەری بۆ زانست و کردنی بە بنەمای سیاسەت، کۆتایی بە قۆناغێکی درێژی مێژووی سیاسی دەهێنێت، کە تیایدا جیاوازییە دینی و فەرهەنگی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکان بنەمای کاری سیاسی و ڕێکخستنی سیاسییانەی کۆمەڵگە بوون. بەمەش زەمینە بۆ سڕینەوەی بەشێکی زۆری ئەو جیاوازییانە دەڕەخسێنێت کە فیکر بەگشتی و فیکری سیاسی بەتایبەتی بەر لە ڕۆشنگەری لەنێوان مرۆڤەکاندا و لە نرخاندنی مرۆڤەکاندا دروستیان دەکات و دەیانپارێزێت.

بیرۆکەی دووهەمی ڕۆشنگەری، کە گرنگە و ڕۆڵێکی گرنگ لە دروستکردنی وێنەی مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف دەبینێت، بیرۆکەی ئازادییە، بەتایبەتی بیرۆکەی ئازادیی تاکەکەسی وەک باشترین و سەرەکیترین چاکەکارییەکی سیاسی. ژێرخانی ئەم ڕوانینە تازەیەی ڕۆشنگەری بۆ ئازادی، بریتییە لە بوون و ئامادەگیی ماف، ماف وەک ئەو چوارچێوەیە کە ئازادی لەناویدا دروست دەبێت و گەشە دەکات. ئازادی لێرەدا دیاری یان بەخشش یان دەرەنجامی دڵپیسووتان و بەزەییی دەسەڵاتداران بۆ کۆمەڵگە نییە، هەروەها بەشێک نییە لە گوتارێکی سایکۆلۆژیی موناجاتئاسا سەبارەت بە مرۆڤ، بەڵکو مافێکە لە مافە تاکەکەسییە هەرە بنەڕەتییەکان، کە لە چوارچێوەیەکی سیاسیی تایبەت و لەناو تێگەیشتنێکی تایبەتدا بۆ سیاسەت لەدایک دەبێت. پەیوەندیی

نێوان زانست و ئازادی لە ڕۆشنگەریدا پەیوەندییەکی پتەوە و زۆر جار پرسیاری سەرەکیی ڕۆشنگەری ئەوەیە: چۆن لەسەر بنەمای زانست کۆمەڵگەیەک دروست بکەین، مرۆڤ تیایدا زۆرترین ئازادیی هەبێت؟ هەموو کەلەپووری تیۆرەی "کۆنتراکت" یان "پەیمانی کۆمەڵایەتی" لەدوای جۆن لۆکەوە سەرقاڵی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەیە، پێشم وایە بەشێکی گەورەی فیکری مارکسیزم و خودی مارکس خۆشی لە پرسیارێکی لەو بابەتەوە دەست پێ دەکات و ئەوەی مارکس و مارکسییەکانیش باسی دەکەن، دۆزینەوەی زەمینەیەکی نوێیە بۆ ئازادی لەسەر بنەمای لێکدانەوەیەکی زانستییانەی کۆمەڵگە و مێژوو. باسکردنی زیاتری ئەم بابەتانە دەکەوێتە دەرەوەی سنووری ئەم باسەوە. ئەوەی گرنگە، ئەوەیە کە ڕۆشنگەری لە دوو سەرەوە بەشدارە لە پتەوکردنی وێنەی مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی یەکسان و خاوەنماف.

پێداگرتن لەسەر بیرۆکەی ئازادیی مرۆڤ، دەرەنجامی هێجگار گەورە و گرنگی بۆ شێوازی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و بۆ چۆنێتیی مامەڵەکردنی مرۆڤ و بۆ مۆدێلەکانی حوکمڕانی لێ دەکەوێتەوە. چونکە بەشی هەرە زۆری دەرکەوتە سەرەکییەکانی دونیای مۆدێرن لەژێر پاڵتۆکەی چەمکی ئازادیی مرۆڤەکانەوە دێنە دەرەوە. بۆ نموونە ئازادیی بیرکردنەوە و توانای ئازادیی مرۆڤ بۆ پرسیارکردن و پشکنین دەبێتە هۆی لەدایکبوونی زانستی مۆدێرن. لە ئازادیی مرۆڤەوە بۆ بەشداربوون لە ژیانی گشتیدا مەسەلەی دیموکراسیەت لەدایک دەبێت. لە ئازادیی ئاڵوگۆڕ و بازرگانیکردنەوە ئابووریی پیشەسازیی مۆدێرن

لەدایک دەبێت. لە ئازادیی مرۆڤەوە لە ژیانی تایبەت و ژیانی گشتیدا مافەکانی مرۆڤ لەدایک دەبێت. لە ئازادیی تاکەکەسەوە سەرجەم ئەو گۆڕانکارییانە لەدایک دەبن، کە لەناو بونیادی خێزان و خێڵ و پەیوەندییەکانی خزمخواهیدا دروست دەبێت. ئازادیی ویژدان دەبێتە هۆی لەدایکبوونی بیرۆکەی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت و لەدایکبوونی بیرۆکەی کۆمەڵگەیەکی مەدەنیی ئازاد. ئەو تێزەش کە لەپشتی ئەم ڕوانینەوە بۆ ئازادی ئامادەیە، ئەوەیە کە ئازادی هۆکاری دەستەبەرکردنی یەکسانی و دادپەروەریی زیاترە، بەبێ ئازادی، نە یەکسانی و نە دادپەروەری ناتوانن دروست ببن و گەشە بکەن. کە ئەمە دەڵێم، مەبەستم نییە بڵێم ئازادیی مرۆڤ چارەسەری هەموو کێشەکانی مرۆڤ دەکات، سەرەڕای گرنگیی گەورە و هەمەلایەنەی ئامادەگیی ئازادی، بەڵام ئازادی بەتەنها بەس نییە بۆ چارەسەرکردنی بڕێکی زۆری کێشەکانی دونیای مۆدێرن، چونکە ئازادی ناتوانێت چارەسەری کێشەی نایەکسانی و کێشەی هەژاری و کێشەی دادپەروەری بکات، بۆیە تێکەڵکردنی ئازادی بەم مەسەلانە و بەستنەوەی بەو کایە تازانەوە، دەبێت بە بەشێک لە مێژووی بیرکردنەوە و مێژووی دەوڵەت و مێژووی کۆمەڵگە مۆدێرنەکان. ئەمانەش وا دەکەن هەندێک جار دەوڵەت یان کۆمەڵگە سنوورێک بۆ هەندێک لەو ئازادییانە دابنێن بە مەبەستی دەستەبەرکردنی هەندێک دەسکەوتی کۆمەڵایەتیی گرنگ. بۆ نموونە دانانی سنوور بۆ ئازادیی ئاڵوگۆڕی ئابووری لەپێناوی پاراستنی یەکسانیدا، یان لەپێناوی پیادەکردنی سیاسەتێکی دادپەروەرانەتری

دابەشکردنی سەروەت و سامانی نیشتیمانیدا. بۆ ئەوەی ئازادی هەندێک جار خۆی بە دەستی خۆی وێران نەکات، پێویست بەوە دەکات یاسا و دەزگای تایبەت هەبن کە پەیوەندییەکان و کردەکان و جووڵەکانی ئازادی ناو دونیا رێک بخەن و ئاراستە بکەن. بەڵام لەدایکبوونی مرۆڤی ئازاد لەناو دیدە جیاوازەکانی ناو رۆشنگەریدا، هەنگاوێکی گرنگی گواستنەوەیە بەرەو لەدایکبوونی ئەو مرۆڤەی بە کۆمەڵێک مافی سەرەکی و بنەڕەتییەوە لەدایک دەبێت و کەسیش بۆی نییە ئەو مافانەی لێ بسێنێتەوە. ئەمەش ئەو دواهەمین پاڵە مێژووییە گرنگە بوو، کە بۆ لەدایکبوونی بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ پێویست بوو.

## بەیاننامەکانی مافی مرۆڤ

وەک پێشتریش ئاماژەم پێ کرد، لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا دوو بەیاننامەی گرنگ لە دوو شوێنی جیاوازی دونیاوە دەربارەی مافەکانی مرۆڤ دەر دەچێت. یەکەمیان "بەیاننامەی مافەکانە،" Declaration of Rights، کە لە ١٢ی مانگی شەشی ساڵی ١٧٧٦دا لە ویلایەتی ڤێرجینیا لە ئەمەریکا دەر دەچێت. دووهەمیان "بەیاننانەی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتی"یە، کە لە فەرەنسا لە ٢٦ی مانگی هەشتی ساڵی ١٧٨٩دا لە پاریس دەر دەچێت. وەک مێژوونووسی هۆڵەندی پیتەر کۆپ دەڵێت، دەکرێت ئەو مافانەی لەم دوو

بەیاننامەیەدا هاتوون بەسەر سێ جۆر مافدا دابەش بکەین:[1]

یەکەم، ئەو مافانەی کە پەیوەندییان بە مافی هەبوونی موڵکیەتەوە هەیە. بەپێی ئەم مافانە مرۆڤ دەتوانێت خاوەنی موڵکیەتی تایبەت بێت و کەسیش بۆی نییە ئەم مافەی لێ بسێنێتەوە. بەپێی ئەم مافانە هیچ کەسێک لەوی تر زیاتر یان کەمتر مافی بوون یان نەبوونی موڵکیەتی تایبەتی نییە، ئەرستۆکراتێک و جووتیارێک و بۆرژوایەک بەقەد یەک مافی ئەوەیان هەیە خاوەنی موڵکیەت بن.

دووهەم، ئەو کۆمەڵە مافانە کە پەیوەندییان بە بوون و ئیشکردنی خێزانەوە هەیە، وەک هێزێکی گرنگی ئامێزانبوونی سیاسی کە کۆمەڵگەی لێ دروست دەبێت. مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە خێزانی هەبێت و دروستی بکات، وەک چۆن مافی ئەوەشی هەیە لەناو خێزاندا موڵکیەتی تایبەت بە خۆشی هەبێت. هەر لەم کۆمەڵە مافەدا باس لە هەندێک مافی تر دەکرێت، کە پەیوەندییان بە ئازادیی تاکەکەسییەوە هەیە، کە وا دەکەن مرۆڤ کەسایەتیی خۆی لەناو خێزاندا لەدەست نەدات. ئەمە جگە لە دابینکردنی مافی ئەوەی کە لەشی مرۆڤ نابێت بشێوێنرێت و نابێت ئازار بدرێت. هەروەها نابێت مرۆڤ بەبێ هۆکاری دروست و یاسایی بگیرێت و زیندان بکرێت.

سێیەم: کۆمەڵێک ماف کە گفتوگۆی ئاشکرای سیاسی دەستەبەر دەکات و دەپارێزێت، چونکە بەبێ ئەم مافانە، ناکرێت بۆچوونی ئاشکرا هەبێت و دروست ببێت. هەروەها

---

١_بڕوانە: Peter C. Kop (2009). Men en Burger: een geschiedenis van grondrechten. Walburg Pers. P. 19-20.

دابینکردنی مافی کۆڕ و کۆبوونەوەدروستکردن، مافی ئازادیی بڵاوکردنەوە و نەهێشتن و لابردنی سانسۆر. هەموو ئەمانەش ئەو زەمینە تایبەتە ساز دەکەن کە هەموو هاووڵاتییەک بتوانێت بەشداریی سیاسیی هەبێت لە سەرجەمی ئەو مەسەلانەدا کە لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا لەئارادان. ئەم کۆمەڵە تایبەتە لە ماف، ئازادیی دینییان هێنایە کایەوە.

ئەوەی لەم بەیاننامانەدا تازە و گرنگە ئەم خاڵانەیە:[1]

١_ سەرجەمی ئەو مافانەی لەو دوو بەیاننامەیەدا هاتوون وەک مافی گەردوونی ناسراون، هیچ یەکێکیان تەنها بۆ ئەم یان ئەو دەستە و تاقم و چین و توێژی دیاریکراوی ناو کۆمەڵگە نییە، هەریەکێکیش لە مافەکان بۆ هەموو مرۆڤێکە لە هەر شوێنێکی دونیادا بێت. ئەوەی جێی تێڕامانە، ئەو مافانە تەنانەت باس لەوە ناکەن کە مرۆڤ پێویستە هاووڵاتیی ئەم یان ئەو دەوڵەت بێت بۆ ئەوەی بتوانێت سوود لەو مافانە ببینێت، بەڵکو باس لە مافی مرۆڤ دەکەن وەک مرۆڤێکی گەردوونیی بان نەتەوەیی. مرۆڤ لێرەدا لەسەر بنەمای ڕەگەز، نێر و مێ، هەژار و دەوڵەمەند، ڕەش و سپی، چینی سەرەوە و چینی خوارەوە، ئەندامی ئەم یان ئەو نەتەوە، لەیەکتری جیا نەکراونەتەوە. ئەم وێناکردنە گەردوونییەی مرۆڤ، پێشتر لە سەرەتای سەدەکەدا لای جۆن لۆک (١٦٣٢-١٧٠٤) و لای جان جاک ڕۆسۆش (١٧١٢-١٧٧٨)، ئامادە بوو.

٢_ خاڵێکی گرنگی تر ئەوەیە، ئەو مرۆڤەی ئەو دوو

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٠-٢١.

بەیاننامەیە باسی دەکەن، مرۆڤە وەک تاکەکەس، تاکەکەسێکی ئازاد، نەک ئەندامی دەستە و گروپێکی دیاریکراو. لەو بەیاننامانەدا مافەکان بە تاکەکەس دراون و پەیوەندییان بەوەوە نییە داخۆ مرۆڤ سەر بە کام گروپی کۆمەڵایەتییە. ئەم ئاکارە ئاگەراییەی مافەکان و وێناکردنی خودی مرۆڤ خۆشی وەک تاکەکەس، سەرەتای لەدایکبوونی ئەو سەردەمە تازەیە کە تیایدا مرۆڤ بەر لە هەموو شتێک، خۆی وەک تاکەکەس دەبینێت، نەک وەک ئەندامی ئەم یان ئەو گروپی کۆمەڵایەتی و دینی و فەرهەنگیی جیاواز و تایبەت.

٣_ ئەم مافانە هەموویان مافێکن مرۆڤ لە ساتەوەختی لەدایکبوونییەوە خاوەنیانە، واتە مافی سروشتیی مرۆڤن و بە "سروشت" یان "جەوهەر"ی مرۆڤەوە گرێ دراون.

٤_ ئەم مافانە بە جۆرێک دارێژراون، مافی ئەوە بە مرۆڤ دەدەن داوا لە دەوڵەت بکات بە شێوەیەک دروست بکرێت و کار بکات، کە بتوانێت ئەو مافانە بپارێزێت. واتە مافەکان ڕەهەندێکی سیاسیی گرنگیان هەیە، کە پەیوەستە بەوەوە دەوڵەت چۆن بێت و دەسەڵاتدار دەتوانێت چی بکات و چی نەکات.

بەکورتی، مرۆڤ لەم وێناکردنە نوێیەدا تەنها بوونەوەرێکی گەردوونی نییە بەتەنها، بەڵکو بوونەوەرێکی عەقڵانی و ئەخلاقیی ئازادیشە. بە مانایەک لە ماناکان، ئەو مافانەی ئەم بەیاننامانە پێداگریی لەسەر دەکەن، بۆ ئەوەیە مرۆڤ بتوانێت هەم عەقڵ و هەم ویژدانی ئەخلاقییانەی خۆی بەوپەڕی سەربەخۆییەوە بەکار بهێنێت.[1] ئەم

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٣.

مرۆڤـە عەقڵانـی و ئـازادە تـەواو ناكۆكـە بـەو وێنەیـەی، بـۆ نموونـە، هۆبـز بـۆ مرۆڤـی هەیـە وەک بوونەوەرێـک کـە حـەز و ئارەزووەكانـی دەیجووڵێنێـت، یـان بـەو وێنەیـەی كـە لـە ئیسلامی کلاسیکیدا بۆ مرۆڤی گشتی، یان عامـە، هەیە وەک بوونەوەرێكـی بێمێشـک و گەمـژە و بەربـەری و توندوتیـژ.

ئـەوەی لـەم مافانـەدا گرنگـە، دوو بیرۆکەیـە، یەکەمیـان بیرۆكـەی یەكسـانیی مرۆڤەكانـە لەگـەڵ یەكـدا. دووهەمیـان ڕێگرتنـە لـە دەوڵـەت یـان لـە هـەر دەسـەڵاتێكی دیكـە لـەوەی ئـەو مافانـە پێشـێل بـكات. واتـە مافـەكان لـە سـەرێكەوە یەكسـانیی مرۆڤـەكان دەسـتەبەر دەكـەن، بـەڵام لـە سـەرێكی دیكـەوە سـنوورێک دەكێشـن بـۆ دەسـەڵات، بەتایبەتـی دەسـەڵاتی دەوڵـەت و حوكمڕانـان، كـە نەتوانـن بیبەزێنـن. وەک پێشـتریش چەنـد جارێـک باسـم كـرد، دروسـتبوونی ئـەم وێنەیـە بـۆ مـرۆڤ و مافەكانـی، مانـای ئـەوە نییـە وێنەكـە ڕاسـتەوخۆ بـووە بـە واقیـع و مێژووی سـەدەی هەژدەهـەم و نۆزدەهـەم مێژووی پیادەكردنـی ئـەو وێنەیـەن لەنـاو مێژوودا. ڕاسـتە بیرۆكـەی یەكسـانبوونی مرۆڤـەكان بیرۆكەیەكـی گرنگـە و لـەو بەیاننامانـەدا بـۆ یەكـەم جـار بـەو ئاشـكرایی و ڕوونییـە بـە "سروشـت"ی مرۆڤـەوە وەک مـرۆڤ گـرێ دراوە، بـەڵام پیادەكردنـی ئـەو مافانـە لـە واقیعـدا مێژوویەكـی تـەواو جیـاوازی هەیـە. هیـچ شـتێک هێنـدەی دۆخـی تۆمـاس جێفرسـۆن خـۆی وەک بەرگریكـەری ژمـارە یـەک لـە مافـی یەكسـانیی مرۆڤـەكان لەگـەڵ یـەک و لـە مافـی ئازادبوونیـان، ڕاسـتیی ئـەم مەسـەلەیەمان بـۆ ئاشـكرا نـاكات.

## تەحەداکانی بەردەمی بیرۆکەی یەکسانی

وەک نیشانمان دا، "بەیاننامەی مافەکان" ی شۆڕشی ئەمەریکی لە سەدەی هەژدەهەمدا بەگشتی و تۆماس جێفرسۆن بەتایبەتی، پێ لەسەر یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا دادەگرن و ئەم یەکسانییەش دەبەستنەوە بەوەوە کە مرۆڤ مرۆڤە. بەڵام سەرنجدانێکی خێرا لە ژیان و کارەکانی تۆماس جێفرسۆن خۆی وەک تاکەکەسێکی سەدەی هەژدەهەم نیشانمان ئەدات، ئەم مەسەلەی یەکسانییە تەنانەت لای ئەم پیاوە تەنها فیکرەیەکی گرنگە، بەبێ دابەزینی بۆ ناو واقیع، لانی کەم بۆ ناو ژیانی تایبەتیی تۆماس جێفرسۆن خۆشی. یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا، لای جێفرسۆن زیاتر ڕیتۆریکێکی سیاسی بووە تا بیرۆکەیەک کە دەرەنجامی کردەیی لە ژیانی شەخسیی ئەودا وەک مرۆڤ و وەک سەرۆکی ئەمەریکا هەبێت. ئەگەرچی تۆماس جێفرسۆن خۆی پاڵەوانی بەرگریکردنە لە مافی یەکسانیی مرۆڤەکان و لە ئازادیی مرۆڤ، بەڵام لە ژیانی تایبەتیی خۆیدا ڕێزگرتنی هیچ یەکێک لەم پرنسیپانە ڕەنگی نەداوەتەوە. جێفرسۆن خۆی خاوەنی کۆمەڵێک کۆیلە بووە کە ڕازی نەبووە ئازادیان بکات، تەنانەت لە ساڵی ١٨٢٢دا، واتە چوار ساڵ بەر لەوەی بمرێت، ژمارەی کۆیلەکان لە کۆشکە شاهانەکەیدا لە ڤێرجینیا بەرز دەبێتەوە بۆ ٢٦٧ کۆیلە.[١] چوار ساڵ دواتر و لە

---

١_بڕوانە: Shafer,Gregory (2002). Another side of Thomas

سەرەمەرگدا تەنها بەوە ڕازی دەبێت سێ کەس لە کۆیلەکان ئازاد بکرێن. هەموو ئەمانە لە کاتێکدا بوو، تۆماس جێفرسۆن وەک سێهەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، خۆی بە قوتابییەکی دڵسۆزی ڕۆشنگەری و شوێنپێهەڵگرێکی ڕاستەقینەی جۆن لۆک و جان جاک ڕۆسۆ دەزانی. ئەمە جگە لەوەی جێفرسۆن خوێنەرێکی باشی فەلسەفەی یۆنانی و ڕۆمانیی کۆن بووە، هەروەها وەک پیاوی عەقڵ و پیاوی بەرگریکردن لە سیستمی حوکمڕانیی کۆماری وێنا دەکرا. خۆشی خۆی بە مرۆڤێک دەزانی، خەریکی بوونیادنانی وڵاتێک و نەتەوەیەکی تازەیە، کە نەک تەنها بەشی هەرە زۆری نەخۆشییەکانی ڕابردووی تێدا نییە و مۆدێلێکە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بەڵکو بەرگری لە یەکسانیی مرۆڤەکان و لە ئازادییان دەکات.

ئەو خاڵەی دەمەوێت لێرەدا بەرگری لێ بکەم، ئەوەیە کە دەرچوونی ئەو بەیاننامانە و لەدایکبوونی ئەو وێنانە بۆ مرۆڤ، مانای کۆتاییهاتنی وێنە کۆنەکان و ڕوانینە کۆنەکان و هەڵسوکەوتە کۆنەکان نییە. کۆیلایەتی وەک واقیعێکی تاڵ و وەک هێمایەک بۆ نایەکسانییەکی ترسناک لەنێوان مرۆڤەکاندا، تا ماوەیەکی درێژ دەمێنێتەوە. هەندێک نووسەر دەڵێن لە سەدەی هەژدە و نۆزەدا لە هەر پێنج ئەمەریکاییەک، یەکێکیان کۆیلە بووە.[1]

جاکۆبییەکانی شۆڕشی فەرەنسی زۆر جیددیتر و شێلگیرتر

---

[1]_بڕوانە: Katz، Stanley N.(1988). he Strange Birth and Unlikely History of Constitutional Equality. The Journal of American History, Vol. 75, No. 3 (Dec., 1988), p. 749

Jefferson. The Humanist,Jan-Feb, 2002, Vol.62 (1),p.16

بوون لە پیادەکردنی مەسەلەی یەکسانیی نێوان مرۆڤەکان و دابەزاندنی ئەم پرنسیپە بۆ ناو واقیعی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەی فەرەنسی، تا جیڤرسۆن و ئەمەریکییەکان. ئەمەشیان تەنها لەبەر ڕێزگرتن لە پرنسیپەکان نەبوو، بەڵکو پێداویستییەکی کۆمەڵایەتی و ئاسایشیی گرنگی لەپشتەوە بوو. جاکۆبییەکان پێویستیان بەوە بوو لەشکرێکی نوێ دروست بکەن بۆ پاراستنی فەرەنسا و بۆ خۆڕزگارکردن لەو هەموو ئەرستۆکراتەی زۆربەیان ئەفسەری پلەبەرزی ناو سوپای فەرەنسی بوون. دروستکردنی لەشکرێکی نوێ بۆ فەرەنسا پێویستی بەوە بوو دەرگاکانی سوپا بەیەکسانی بە ڕووی هەموو ئەوانەدا بکاتەوە، کە دەیانویست ببن بە بەشێک لەو سوپا تازەیە. پێداویستیی فەرەنسا بە دروستکردنی سوپایەکی نوێ و بەهێز لە ڕێگەی خزمەتی سەربازیی ئیجبارییەوە، یەکێکە لەو پاڵنەرە سەرەکییانە کە لە فەرەنسادا مەسەلەی "یەکسانبوون"ی مرۆڤەکان و نەهێشتنی جیاوازی لەنێوان پێگە و پلە کۆمەڵایەتییەکاندا تەواو لاواز دەکات، لانی کەم لەناو لەشکردا خۆیدا. لەشکرە سوننەتییەکەی فەرەنسا، لەشکرێک بوو زۆرینەی هەرەزۆری پێگە سەرەکی و پلە باڵاکانی، ئەگەر هەرهەمووی نەبێت، لەژێر دەستی ئەرستۆکراتەکاندا بوو. شۆڕشی فەرەنسی کە دەسەڵاتی ئەرستۆکراتەکانی هەڵوەشاندەوە، لەشکری فەرەنسیی لە پێگەی بەرزی ئەرستۆکراتەکان لەناو لەشکردا ئازاد کرد. ئەم پێگانە دەبوایە پڕ بکرێنەوە و مەرجی پڕکردنەوەکانیشیان بە توانا و شارەزایی و لێزانیی کەسەکانەوە گرێ درابوو، نەک بە پاشخانە کۆمەڵایەتییەکەیانەوە، ئەمەش هەنگاوێکی گرنگی

پاڵنان بوو بە بیرۆکەی یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا. هەموو ئەمانە ڕۆڵیان لە سڕینەوەی هەندێک لەو جیاوازییە چینایەتی و دینی و فەرهەنگییانەدا بینی کە بەر لە شۆڕش ئامادە بوون و هەنگاوێک مەسەلەی یەکسانبوونی مرۆڤەکانی لەگەڵ یەکدا بردە پێشەوە.

لە شۆڕشی فەرەنسیدا، قورسایی پرنسیپی یەکسانی لە قورسایی پرنسیپی ئازادی گەورەتر بوو، ئەم ڕاستییەشە وا لە کەسێکی وەک مارکس دەکات، شۆڕشی فەرەنسی وەک شۆڕشێکی چینایەتی ببینێت و ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی شۆڕشەکەی بەلاوە گرنگتر بێت تا ڕەهەندە سیاسییەکانی. لە بەرواری ٧-٨-١٧٩٢دا پەرلەمانی دوای شۆڕش، بەڕەسمی کۆتاییی بە سیستمی پادشایەتی لە فەرەنسادا هێنا و پەرلەمانتارەکان لەناو هۆڵی پەرلەماندا هاواریان کرد: "بە ناوی نەتەوەی فەرەنسییەوە... یان ئەوەتا ئازادی و یەکسانی دەستەبەر دەکەین، یان ئەوەتا لەم شوێنەدا دەمرین."[١] بۆیە لە بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتیدا فەرەنسییەکان زۆر بەڕوونی نووسییان: "مرۆڤەکان بەئازادی و بەیەکسانی لە مافدا لەدایک بوون و بە هەمان شێوەش دەمێننەوە." جاکۆبییەکان ساڵێک دواتر، واتە ساڵی ١٧٩٣، مافی یەکسانییان خستە پاڵ مافە بنەڕەتییەکانی تری مرۆڤ، لەوانە مافی ئازادی، ئاساییش، موڵکیەت. ئەلێکسی دی تۆکفیل لە هەمووان باشتر ئەم مەسەلەی یەکسانییە لە شۆڕشی فەرەنسیدا دەبینێت و پێی وایە پێداگرتن لەسەر ئەم یەکسانییە بەهێزترین هۆکارێکە کە سیستمە کۆنەکە بەتەواوی لەبەریەک هەڵدەوەشێنێتەوە

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧٥٠.

و شۆڕشی فەرەنسییش لە سەرجەمی شۆڕشەکانی بەر لە خۆی جیا دەکاتەوە. لە بەراوردکردنی شۆڕشی ئینگلزیی ساڵی ١٦٤٠دا بە شۆڕشی فەرەنسیی ساڵی ١٧٨٩، تۆکفیل پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە شۆڕشی ئینگلیزی، شۆڕشێکە لەپێناوی ئازادیدا، بەڵام شۆڕشی فەرەنسی، شۆڕشە لەپێناوی یەکسانیدا. تۆکفیل پێی وایە ئەگەر فەرەنسییەکان بتوانن هەڵبژێرن لەنێوان ئەوەدا کە ئازاد بن یان لەگەڵ یەکدا یەکسان بن، ئەوا بێ دوودڵی یەکسانبوون هەڵدەبژێرن.[1] لە فەرەنسادا ئەو کەلەپوورە ڕۆسۆییەی پێ لەسەر گرنگیی یەکسانبوونی مرۆڤەکان دادەگرێت، ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لەو گرنگییە گەورەیەدا کە شۆڕشی فەرەنسی بە مەسەلەی یەکسانیی ئەدات. ڕۆسۆ باوەڕی وا بوو کە کۆمەڵگە یەکسانبوونی نێوان مرۆڤەکان وێران دەکات، بۆیە ئەوە ئەرکی یاساکانە ڕێ لەم مەیلە وێرانکارەی ناو کۆمەڵگە بگرن و یەکسانیی نێوان مرۆڤەکان بپارێزن. لە سەردەمی ڕۆسۆوە ئەو خاڵە ئاشکرا دەبێت، کە ئەوە ئەرکی یاسایە یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتریدا بپارێزێت دژ بە هەموو ئەو هێز و مەیل و ئەگەرانەی لەناو کۆمەڵگەدا هەیە بۆ وێرانکردنی ئەم یەکسانییە. مۆنتسیکیو لەم خاڵەدا لەگەڵ ڕۆسۆدا هاوڕایە و پێی وایە "لە دۆخی سروشتیدا مرۆڤەکان بەیەکسانی لەدایک دەبن، بەڵام ئەوان ناتوانن بەیەکسانی بمێننەوە. کۆمەڵگە ئەو یەکسانییەیان لێ دەسێنێتەوە و ئەوان تەنها دەتوانن لە ڕێگەی یاساوە جارێکی تر بە یەکتری یەکسان ببنەوە."[2]

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧٥٠.

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧٥١.

تا بەر لە شۆڕشی فەرەنسی، جیاوازیی نێوان چینەکان و مرۆڤەکان تەنها جیاوازی نەبووە لە دەسەڵات و توانای ئابووریدا، تەنها جیاوازی نەبووە لەوەدا کە زۆرینەی کۆمەڵگە جووتیار بوون و زەوییەکانیان هیی فیوداڵ و ئەرستۆکرات و پیاوە دینییەکان بوو، هەروەها تەنها ئەوەش نەبوو کە ئەم زۆرینە گەورەیەی ناو کۆمەڵگە بە چەندان شێوازی جیاواز چەوسێندراونەتەوە و لە زۆر ڕووەوە تەواو لەژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی چین و توێژە باڵادەستەکانی ناو کۆمەڵگەدا ژیاون. ئەوەش نەبووە کە کرێکارانێک هەبوون هێزی کاری خۆیان فرۆشتووە و ئەم فرۆشتنەش تاکە ئامرازێکی دابینکردنی لانی هەرە کەمی ژیانێکی پڕ برسێتی و هەژاری و نەبوونی بووە، بەڵکو لەوەشدا بووە کە جیاوازیی نێوان مرۆڤەکان و توێژەکان و چینە کۆمەڵایەتییەکان دابەزیوەتە خوارەوە بۆ ئاستی جلوبەرگ و شێوازی خۆپۆشین و چۆنێتیی دەرکەوتن لەناو کۆمەڵگەدا. بۆ نموونە دانیشتووانی فەرەنسا لەناو سیستمێکی تەواو داخراوی چینایەتیدا نیشتەجێ بوون، کە زیاتر لە سیستمی "کاست"ەوە نزیک بووە تا هەر شتێکی دیکە. یەکێک لە دەرکەوتەکانی ئەم سیستمە چینایەتییە داخراوە و یەکێک لە ئامرازەکانی پاراستن و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەشی لە شێوازی جلوبەرگدا بووە، هەر چین و توێژێک بۆی هەبووە جۆرێکی تایبەت لە جلوبەرگ لەبەر بکات، کە پێگەی کۆمەڵایەتیی ئەوان نیشان بدات. چین و توێژەکانی خوارەوە بۆیان نەبووە ئەو شێوازە لە جلوبەرگ بپۆشن کە چینەکانی سەرەوە پۆشیویانە، بونیادی پەیوەندییە چینایەتییەکان لەناو جلوبەرگی ڕۆژانەدا ڕەنگی داوەتەوە و

پۆشـاک یەکێک بووە لەو ئامرازانـەی ئـەو بونیادە چینایەتییەی پاراسـتووە. تەنها لـە سـەردەمی ڕۆبسـپێردا، کـە شۆڕشـی فەرەنسـی ڕووکارە توندوتیـژ و تۆقێنەرەکـەی دەر دەکەوێـت و دەوڵـەت دەسـت دەخاتـە نـاو سـەرجەمی کاروبارەکانـی ژیانی کۆمەڵگەوە، سیسـتمی جلوبـەرگ گۆڕانی بەسـەردا دێت و زۆرینـەی کۆمەڵگە بۆیـان هەیـە هەمـان جلوبـەرگ بپۆشـن. شۆڕشـی فەرەنسـی، بەتایبەتـی دیکتاتۆریەتـی جاکۆبییەکانـی نـاو شۆڕشـەکە، زۆر شـتی گـۆڕی، لەپێـش هەمووانـەوە دەسـتکاریکردنی ئینتیمـای خەڵـک و گۆڕینـی لـە ئینتیمـا بـۆ پادشـا و بنەماڵـەوە، بـۆ ئینتیمـا بـۆ بیرۆکـەی "نەتـەوە" و "نیشـتیمان." ئـەم دەسـتکاریکردنەش بەنـاو داهێنانـی چەنـدان ڕەمـز و سـیمبوڵی تـازەدا تێپـەڕی، لەوانـە داهێنانـی "ئـاڵا" و "سـروودی" نیشـتیمانی و بەخشـینی مافـی جلپۆشـین بـەو شـێوەیەی کـە خەڵـک خـۆی دەیەوێـت بـە هەرکەسـێک. داماڵینی پۆشـاک لـە مانـا هیرارکییـە نایەکسـانەکەی بـەو شـێوەیەی لـە سـەردەمی باڵادەسـتیی ئەرسـتۆکراتەکاندا هەبـوو، یەکێکـە لـە گۆڕانـە گرنگەکانـی نـاو شۆڕشـی فەرەنسـی. ئەمـە جگـە لـە داهێنانـی خزمەتـی سـەربازیی ئیجبـاری بـۆ پاراسـتنی نەتـەوە و نیشـتیمان و بەخشـینی مـاف بـە هەمـوو ئەوانـەی وەک فەرەنسـی لەدایک دەبن، بۆ ئـەوەی ببن بـە بەشـێک لـە سـوپا و لەنـاو سـوپاشدا بەپێی لێوەشـاوەیی و توانـا تـا بەرزترین پلـەی سـوپا بتوانن بـەرز ببنـەوە، بەبێ ئـەوەی ئـەم بەرزبوونـەوە و پێشـکەوتنە بـە پاشـخان و پێگـە کۆمەڵایەتییەکانیانـەوە گـرێ بدرێت...[1] پێشـتر بەدرێژی لەسـەر ئـەم خاڵـە وەسـتاین و لێرەدا

---

[1]_بڕوانە: کۆمەڵێک وانـەی زانـا و کۆمەڵناسـی ئەڵمانی George L. Mosse

پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات.

لە سەدەی حەڤدەهەمەوە تا دێت ژیانی گشتی زیاتر گەورەتر و قەرەباڵغتر دەبێت، لەو سەدەیەدا بۆ یەکەم جار قاوەخانە دروست دەبێت و کەسانی چینەکانی سەرەوە و پارەدارەکان لەو قاوەخانانەدا کۆ دەبنەوە بۆ ئەوەی باسی کاروبار و ڕووداوەکانی ژیانی ڕۆژانە بکەن، باسکردنی سیاسەت و دەسەڵاتداران بەشێکی گەورەی باسوخواسی ناو قاوەخانەکان بووە. هاوکات بۆ ڕاکێشانی مشتەریی زیاتر بۆ ناو قاوەخانەکان، لەو قاوەخانانەدا ڕۆژنامەکان دادەنران و خەڵک دەیانتوانی بیانخوێننەوە و دوای خوێندنەوەشیان بۆچوونیان لەسەر بابەتەکانی ناو ڕۆژنامەکان دەر ببڕن. هابرماز ئەم دۆخە تازەیە ناو دەنێت دروستبوونی "مەجالێکی گشتی"ی بۆرژوازی، کە تیایدا قاوەخانەکان دەبنە ناوەندێکی گرنگ بۆ گفتوگۆ و ڕاگۆڕکێی سیاسی، تا بە دروستکردنی پارت و ڕێکخراو و گروپی سیاسی دەگات و خۆشیان ڕۆڵی دەزگا و دامەزراوێکی سیاسیی گرنگ دەبینن. بەڵام ئەم قاوەخانانە لە سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەمدا تەنها شوێنی خەڵکە پارەدار و دەوڵەمەندەکان بوون، بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەمدا بنەما کۆمەڵایەتییەکانی ئەم "مەجالە گشتییە" فراوانتر دەبێت و قاوەخانەکان دەرگاکانیان بە ڕووی بەشێکی زۆری چینی ناوەڕاستیشدا دەکرێتەوە.[1]

هەموو ئەم قسەوباس و گوتارانە سەبارەت بە

---

لە زانکۆی واشنتۆن لە ساڵی ١٩٦٩دا. http://mosseprogram.wisc.edu/audio_history119.htm

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو.

یەکسانی لە شۆڕشی فەرەنسی و دروستبوونی "مەجالی گشتی" و بڵاوبوونەوەی دیدێک بۆ مرۆڤ، کە خاوەنماف و یەکسانە بەوانی تر، دیسانەوە نابێتە هۆی لابردن و سڕینەوەی جیاوازییەکان لەنێوان کۆمەڵگە ئەورووپییەکاندا. سەدەی نۆزدەهەم لە پەیوەندیدا بە مەسەلەی یەکسانیی نێوان مرۆڤەکانەوە سەدەیەکی پڕ ناکۆکییە. لە سەرێکەوە سەدەکە سەدەی کۆتاییهێنانە بە کۆیلایەتی و یاساغکردنی بازرگانیکردن بە کۆیلەوە، هەروەها سەدەی سەرهەڵدانی سۆسیالیزم و دیموکراسیەتیشە، کە لە هەردووکیاندا بیرۆکەی یەکسانیی مرۆڤ بیرۆکەیەکی بنەڕەتی و سەرەکییە، بەڵام هاوکات سەدەی سەرهەڵدانی پۆلێنکردنی مرۆڤەکانە لەسەر بنەمای ڕەنگ و جۆری قژ و جۆری کەللەسەر و ڕەگەز و لەوێشەوە سەرهەڵدانی ڕاسیزم. سەدەی گەشەکرنی کاپیتالیزم و شۆڕشی پیشەسازی و ڕاکێشانی منداڵان و ژنانە بۆ ناو بواری کارکردنێکی ڕۆژانەی درێژ، کە کاتژمێرەکانی کارکردن لەنێوان ١٠ بۆ ١٢ سەعاتدا بووە و لە هەندێک دۆخدا گەشتۆتە ١٦ کاتژمێریش، هەموو ئەمانەش بە نرخێکی هێجگار کەم. هاوکات سەدەی نۆزدەهەم سەدەی سەرهەڵدانی داروینیزمە، کە هەم لای داروین خۆی و هەم دواتر لە "داروینیزمی کۆمەڵایەتی"دا باس لە جیاکردنەوەی مرۆڤەکان دەکرێت لەسەر بنەمای قابیلیەت و توانای ژیان و خوگونجاندن لەگەڵ دونیادا، بەرامبەر بەو مرۆڤانەی ناتوانن بگونجێن و لەناو دەچن، مرۆڤی تر هەن کە دەتوانن بگونجێن و بەردەوام بن. داروینیزمی کۆمەڵایەتی مرۆڤەکان لەسەر بنەمایەکی دیکە دابەش دەکات و بەتەواوی هەموو جۆرە

یەکسانییەک لەنێوانیاندا دەسڕێتەوە. لە ئاستی فەلسەفیشدا نیتشە یەکێکە لەو دەنگە فەلسەفییە گەورانەی سەدەی نۆزدەهەم، کە باوەڕی بە یەکسانیی نێوان مرۆڤەکان نییە و بەگژ ئەم بیرۆکەیەشدا دەچێتەوە.

## تێز و شێوازی نوێی نایەکسانی

چەمکی گەشەکردن-evolution، لە سەدەی نۆزدەهەمدا یەکێکە لە چەمکە تیۆرییە هەرە گرنگەکان و بەشێکی گرنگی ڕوانین بۆ دونیا و بۆ مێژوو و بۆ سروشت لەپاڵ ئەم چەمکەدا دێتە کایەوە. بەڵام هاوکات ئەم چەمکە یەکێکە لەو چەمکە سەرەکییانەی کە کۆمەڵگەکان و مرۆڤەکان لە یەکتری جیا دەکاتەوە و بەم جیاکارییەشی جارێکی تر نایەکسانی لەسەر بنەمایەکی تیۆریی نوێ دەهێنێتەوە کایە. وەک دەزانین، ئەم چەمکە لای داروین، لای ئۆگست کۆنت، لای مارکس و زۆرانێکی تر ئامادە بووە و بەشێکی گەورەی فیکر و ڕوانینەکانی ئەم تیۆریستانە لە دەوری ئەم چەمکە سووڕاوەتەوە. تیۆرە بەناوبانگەکەی داروین لەسەر "ڕەچەڵەکی جۆرەکان،" خۆی ناوی تیۆرەی گەشەکردنە و باس لە گەشەکردنی جۆرەکانی ژیان دەکات لە ژیانی سادەی بوونەوەرە سادەکانەوە بۆ ژیانی ئاڵۆز و پێشکەوتووی مرۆڤ، بەمەش کۆمەڵێک قۆناغی جیاواز لەم ڕێگەی پێشکەوتنەدا گریمان دەکات. کاتێک داروینیزمی کۆمەڵایەتی دێتە کایەوە، ئەم تێزەی داروین بەسەر کۆمەڵگەکاندا پیادە دەکرێت. هێربێرت سپێنسەر بە داهێنەری داروینیزمی کۆمەڵایەتی ناو دەبرێت، ئەگەرچی ئەو

خۆی هەرگیز ئەو دەستەواژەیەی بەکار نەهێناوە. سپێنسەر پێی وا بوو مرۆڤەکان تا بەرەو پێشەوە بڕۆن، لە ڕووی جۆرەوە باشتر دەبن، لە مرۆڤی کەمتر باشەوە بۆ مرۆڤی زۆرتر باش و باشتر گەشە دەکەن.[1] تێزی گەشەکردنی شتەکان لە ڕێگەی جوولەی مێژوو و تێپەڕینی کاتەوە فیکرەیەکی باڵادەستە لە سەدەی نۆزدەهەمدا. لای هیگڵ بە تێپەڕینی کات و لە ڕێگەی گەشەکردنەوە ڕۆحی ڕەها تا دێت باشتر گوزارشت لە خۆی دەکات و تا دێت باشتر لەناو مێژوودا بەرجەستە دەبێت، لای مارکس لە ڕێگەی گەشەکردن و جووڵانی بەردەوامی مێژوو بەرەو پێشەوە، ململانێی چینایەتی تا دێت کۆمەڵگە و مرۆڤی باشتر دروست دەکات، لای هێربێرت سپێنسەر، خەڵک تا دێت باشتر دەبن، چونکە مەعریفەی باشتر و زۆرتر بەدەست دەهێنن و ئەمەش لە ڕێگەی جینەکانی مرۆڤەوە بۆ نەوەکانی دواتر دەگوازرێتەوە، ئەمەش وا دەکات هەموو نەوەیەک لە نەوەکەی بەر لە خۆی باشتر بێت. لە پیادەکردنی ئەم دیدەدا بەسەر کۆمەڵگەدا، سپێنسەر ڕای وا بوو، دوو جۆر کۆمەڵگە لە مێژوودا هەیە، یەکەمیان کۆمەڵگەی چەکدارە، دووهەمیان کۆمەڵگەی پیشەسازییە. یەکەمیان ئەو کۆمەڵگانەیە کە تیایدا خەڵک هێز بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی بەسەر مرۆڤەکانی تردا سەر بکەون و بیانهێننە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. ئەم کۆمەڵگەیە بە شێوەیەکی سروشتی و لە گەشەی خۆیدا دەگۆڕێت بۆ جۆرێکی نوێ لە کۆمەڵگە کە کۆمەڵگەی پیشەسازییە. لە کۆمەڵگەی پیشەسازیدا

---

١_بڕوانە: Offer, John (2010). Social change and selectionist thought: on Spencer, Darwin and Runciman. The Sociological Review, 58:2

هەموو کەس بەپێی هەوڵی خۆی و لە ڕێگەی سیستمی بازاڕ و بەرهەمهێنانەوە هەقی خۆی وەر دەگرێت و تا ئەو شوێنەی ئەم کۆمەڵگەیە لە ساتێکی تایبەتی گەشەکردنی خۆیدا پێویستی بە دەوڵەت نامێنێت و کۆمەڵگا خۆی دەتوانێت هەموو ئەو کارانە ئەنجام بدات کە دەوڵەت ئەنجامیان ئەدات. تیۆرەی داروینیزمی کۆمەڵایەتی، بڕێکی گەورەی کۆمەڵگەکانی دونیا وەک کۆمەڵگەی چەکدار دەبینێت، کە مرۆڤەکانی ئەو گەشەیەیان نەکردووە کە کۆمەڵگە پیشەسازییەکان کردوویانە، بۆیە لەم دوو جۆرە کۆمەڵگەیەدا دوو جۆر مرۆڤی جیاواز و نایەکسان دەژین. چەمکی "گەشەکردنی مرۆڤ-human progress،" لای سپێنسەر، لە کۆتاییی سەدەکەدا دەبێتە چەمکێکی زۆر گرنگ و لە سەردەمی زۆرینەی پیاوانی فیکرە. بەم جۆرە داروینیزمی کۆمەڵایەتی شەپازلەیەکی گەورە لە مەسەلەی یەکسانیی نێوان مرۆڤەکان دەدات و لەسەر وێناکردنێکی تایبەتی مێژوو پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە هەندێک مرۆڤ لە ئینسانیەتیاندا زیاتر لەوانی تر گەشەیان کردووە و زیاتر لەوانی تر لە مەقام و پێگەیەکی مێژووییی بەرزتردان.[1]

ئەگەر سەدەی نۆزدەهەم لە سەرێکەوە سەدەی زیاتربوون و فراوانبوونەوەی مافەکان بێت، بەتایبەتی مافە سیاسییەکان، سەدەیەک بێت کرێکاران و دواتر ژنان مافی دەنگدان وەر بگرن و کەمایەتییە دینییەکان و چینە کۆمەڵایەتییەکانی خوارەوەی کۆمەڵگە ببنە خاوەنی پارتی سیاسیی سەربەخۆی خۆیان و کاریگەرییان لەسەر کرانەوەی زیاتری دەوڵەت هەبێت بە ڕووی گروپ و هێز و چینە جیاوازەکاندا، سەدەی لەدایکبوونی

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم و بەهێزبوونی ئەم ئایدیۆلژیایە بێت، واتە ئەگەر سەدەی نۆزدەهەم لەم ئاستەدا سەدەیەک بێت خەریکی دابەزاندنێکی لەسەرخۆی وێنەکانی مرۆڤ بێت وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف بۆ ناو مێژووی کۆمەڵگە ئەورووپییەکان، ئەوا هاوکات سەدەکە سەدەی سەرهەڵدانی ئیمپریالیزم و داگیرکردنی بەشێکی گەورەی دونیایە لەلایەن هێزە ئەورووپییەکان و سەدەی سەرهەڵدانی داروینیزمی کۆمەڵایەتی و سەدەی هاتنەکایەی ڕاسیزم و بیرۆکەی "گەشەکردن"ی جیاوازیی مرۆڤەکان و کۆمەڵگەکانە. هەموو ئەمانەش تەحەدای نوێ ڕووبەڕووی بیرۆکەی یەکسانیی نێوان مرۆڤەکان دەهێننە کایەوە و هاوکات ڕووبەری نوێ بۆ بەرگریکردن و بەگژاچوونەوەی جیاوازییە چینایەتی و ڕەگەزی و فەرهەنگی و فیکری و شارستانییەکاندا دێنە کایەوە. لەناو ئەم دۆخە ئاڵۆزەدا، وێنەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی یەکسان و خاوەنماف بزر نابێت و لە ئاستی جیاواز و بە شێوازی جیاواز کاری خۆی لەناو مێژووی ئەو سەدەیە و سەدەکەی دوای خۆشیدا دەکات. هاوکات سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، سەدەی سەرهەڵدانی دەوڵەتی نەتەوە و هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتە گەورەکانە، سەدەی پەیدابوونی ناسیۆنالیزمە وەک بزووتنەوەی سیاسیی بەهێز و سەدەی گۆڕانی چوارچێوەکانی دەوڵەتی نەتەوەیە بۆ چوارچێوە سەرەکییەکانی دەستنیشانکردنی شووناسی تاکەکەسی و دەستەجەمعی. ئەم گۆڕانانەش دەرەنجامی گەورە و سەرەکییان دەبێت بۆ مەسەلەی چۆنێتیی وێناکردنەکانی مرۆڤ و مافەکانی. لە سەدەی بیستەمدا مافەکانی مرۆڤ دەبنە شتێک کە مرۆڤ تەنها لە چوارچێوەی

دەوڵەتی نەتەوەییدا دەتوانێت سوودیان لێ وەر بگرێت و پەنایان بۆ ببات، لە دەرەوەی ئەو چوارچێوانەدا، مرۆڤ ناتوانێت بۆ هیچ مافێک لە مافەکان بگەڕێتەوە. ڕاستە وێنەکانی مرۆڤ لە مافەکانی مرۆڤدا وێنەی گەردوونین و پابەستن بە وێناکردنی مرۆڤەوە وەک مرۆڤ، نەک بە ئەندامی ئەم یان ئەو دەوڵەتی نەتەوەییەوە، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا ئەم مافانە بە کردەوە کورت دەکرێنەوە بۆ مافی ئەو کەسانەی هاووڵاتیی ناو یەکێک لەو دەوڵەتە نەتەوەییانەیە. ئەم کورتکردنەوەیە لە سەدەی بیستەمدا و لەدوای سەرهەڵدانی نازیەت و کوشتنی ملیۆنەها جوولەکە و قەرەج و پیر و پەککەوتە لە هۆلۆکۆستدا، دەکەوێتە ژێر ڕەخنەی برێک لە بیریارە گرنگەکانی سەدەکەوە، لەپێش هەمووانیشەوە، ژنە فەیلەسووفی ئەڵمانی: هانا ئارێنت (١٩٠٦-١٩٧٥).

## هانا ئارێنت و مافی هەبوونی ماف

یەکێک لە کێشە هەرە سەرەکییەکانی دونیای مۆدێرن لەوەدایە کە ئەو ڕووبەرە سیاسییە سەرەکییەی تیایدا دروست دەبێت و دەبێتە چوارچێوەی هەموو مافەکان و وێناکردنە تازەکان بۆ مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف، چوارچێوەیەکی نەتەوەییە. ئەو بوونەوەرە سیاسییەیە کە لە دونیای مۆدێرندا ناوی "دەوڵەتی نەتەوە"ی لێ نراوە. یەکێک لە میکانیزمە سەرەکییەکانی ئیشکردنی ئەم ڕووبەرە سیاسییە نوێیەش بریتییە لە کێشانی هێڵێک لەنێوان

ئەوانەی بەشێکن لەو ڕووبەرە و ئەوانەی بەشێک نین لێی، ئەوانەی سەر بەو نەتەوەیەن و ئەوانەی دەکەونە دەرەوەی سنوورەکانی ئەو نەتەوەیەوە. لەو بەشەدا کە باسم لە ڕوانینی ئاگامبن کرد بۆ بابەتی هۆمۆساکەر، لەوە دوام کە ئاگامبن پێی وایە لە دونیای مۆدێرندا "هۆمۆساکەری نوێ" هەن کە دەوڵەتی نەتەوە دروستیان دەکات، واتە ئەو کەسە بێمافانە هەن کە لەناو دەوڵەتی نەتەوەدا دروست دەبن و ژیانیان لەناو ئەو دەوڵەتەدا کورت دەبێتەوە بۆ "ژیانێکی ڕووت." ئەمانەش بریتین لە پەناهەندەکان و بیانییەکان و هەموو ئەوانەی کە ناتوانن ببن بە بەشێک لەو "نەتەوە" سیاسییەی کە دروست کراوە، ئەمانە لەباتی داننان بە مرۆڤبوونیاندا و قبوڵکردنیان لەسەر ئەو بنەمایە، وەک "ئەوی ترێکی ڕادیکاڵ" دەبینرێن و نماییش دەکرێن، وەک کەسێک کە ناتوانێت ببێت بە ئەندامێکی خاوەنمافی ناو ئەو نەتەوەیە و بەمەش وەک بوونەوەرێکی بێماف دەمێنێتەوە. ئەم دۆخە وا دەکات زۆرێک لە تیۆریستە سیاسییەکانی ئەم سەدەیە پێیان وا بێت تەحەدای سەرەکیی دونیای ئەمڕۆ، ئەوەیە چۆن سنووره سیاسییە نەتەوەیییەکان بە ڕووی "ئەوی ترە" جیاواز و نەناسراوەکاندا بکرێتەوە. وەک چۆن لە یۆنانی کۆندا خەیاڵی سیاسی ناتوانێت ئەوانەی دەکەونە دەرەوەی "پۆلس، polis" واتە ئەوانەی دەکەونە دەرەوەی شاردەوڵەتی یۆنانی کۆنەوە، وەک مرۆڤ وێنا بکات، لە دونیای مۆدێرندا، دەوڵەتی نەتەوە هەمان مەیلی شاردەوڵەتەکانی یۆنانی کۆنی هەیە و ناتوانێت ئەوانەی کە بەشێکی دانپیانراو نین لەو نەتەوەیەی دەوڵەت حوکمڕانیی

دەکات وەک مـرۆڤ، بەتایبەتـی مرۆڤـی خاوەنمـاف، وێنـا بکات. هەمـوو کەسـێک تەنها کاتێک دەبێت بە مرۆڤ و مافی ئەوەی دەبێت ببێت بـە بەشـێک لـە شـار یـان لـە نەتـەوە یـان لـە کۆمەڵگـە، کـە لەنـاو ئـەو یەکانـەدا بێـت و وەک بەشـێک لـەو یەکانـە ببینرێـت و مامەڵـە بکرێـت، کـەی لـە دەرەوەی ئـەو یەکانـەدا بـوو وەک بەشـێک لـەو یەکانـە نابینرێـت و لەوێشـەوە نـەک تەنهـا مافـی نییـە، بەڵکـو تەنانـەت وەک مرۆڤیـش نابینرێـت و مامەڵـە ناکرێـت. ئـەوەی لـەم دۆخـەدا ئامادەیـە، لۆژیکی دابەشـکردنی جیهانـە بـۆ ماڵـی نەتەوەیـی و ئەتنـی و دینیـی جیـاواز و لەیەکدابـڕاو، کـە هـەر ماڵـە یاسـا و بەهـا و یەکێتیـی سیاسـیی تایبـەت بـە خـۆی هەیـە و ئەوانـەی وەک مافـی مـرۆڤ وێنـا دەکرێـن، تەنهـا ئـەو کەسـانەن کـە لەنـاو چوارچێـوەی ئـەو ماڵانـەدا ئامـادەن. بەکورتـی، ئـەوەی لـەم دیدە ناسیۆنالیسـتییەدا غائیبـە، مرۆڤـە وەک بوونەوەرێکـی خاوەنـی جیهـان، یـان وەک دانیشـتوویەکی نـاو جیهـان، وەک بوونەوەرێکـی گەردوونـی و یونیڤێرسـاڵی، مرۆڤـی ئەودیـوی ئینتیمـا بـۆ وڵاتێـک و نەتەوەیـەک. ئەگـەر چەمکـی نەتـەوە لـە سـەرەتای دروسـتبوونیدا وەک یەکەیەکـی نـوێ بەشـێک بووبێـت لـە سـڕینەوەی جیاوازییـەکان لەنێـوان مرۆڤەکانـدا، ئـەوا لـە سـەدەی بیسـتەمدا دەگۆڕێـت بـۆ یەکێـک لـەو یەکانـەی جیـاوازی و بێمافـی دروسـت دەکات.

ڕەخنەگرتـن لـە مافەکانـی مـرۆڤ، بـەو شـێوەیەی لـە بەیاننامـەی مافەکانـی مـرۆڤ و مافـی هاووڵاتـی لـە شـۆڕشـی فەرەنسـیدا هاتـووە، مێژوویەکـی درێـژی هەیـە، ڕەنگـە ڕەخنەکانـی کارل مارکـس لـەم مافانـە لـە هـەرە دیارتریـن و

بەناوبانگترینی ئەو ڕەخنانە بێت لە سەدەی نۆزدەهەمدا و ڕەخنەکانی هانا ئارێنتیش لە هەرە دیارترینی ئەوانەی لە سەدەی بیستەمدا لەو بەیاننامانە دەگیرێن. مارکس پێی وایە ئەو "مرۆڤ"ەی لە بەیاننامەی "مافەکانی مرۆڤ"دا پێشنیار کراوە، مرۆڤێکی خەیاڵی و ئەبستراکتە، کوڕی هیچ مێژوویەک و هیچ کۆمەڵگەیەکی کۆنکریت نییە، وێنەکە "وێنەیەکی فانتازییە،" خەوناوییە، هەرکاتێکیش ئەو وێنەیە کۆنکریت دەکرێت و دادەبەزێنرێتە ناو مێژووەوە، دەکەوێتە ناو سنوورەکانی دەوڵەتی نەتەوەی مۆدێرنەوە. واتە ئەو مرۆڤە یان ئەوەتا ئەبستراکت و خەیاڵییە، یان مرۆڤێکی نەتەوەییە. وەک دەزانین مارکس یەکێکە لە ڕەخنەگرە سەرسەختەکانی ئەم دەوڵەتە نەتەوەییە و پێی وایە قۆناغی ناسیۆنالیزم و دەوڵەتی نەتەوە قۆناغێکی تێپەڕە و جووڵەی مێژوو بەرەو ئەوە دەڕوات کۆتایی بە هەردووکیان بهێنێت. جگە لەمە، مارکس پێی وایە پاراستنی مافی بوونی موڵکیەتی تایبەت لەو بەیاننامانەدا وا دەکات موڵکیەت بەئەبەدی بکرێت و توانای ئەوە لە مرۆڤایەتی بسەنرێتەوە، بیر لە کۆمەڵگەیەکی بێموڵکیەتی تایبەت بکاتەوە. مارکس پێی وایە بەیاننامەی مافاکانی مرۆڤ هەموو مافەکان دەخاتە خزمەتی پاراستنی موڵکیەتەوە، بەمەش هەموو ڕەهەندێکی گەردوونی و یونڤێرساڵی لەو مافانە دەسێنێتەوە. مارکس پێی وایە ئەو مافانە مرۆڤ وەک "هاوولاتیی دەولەت" پێناسە دەکات و لەم ڕێگەیەشەوە مرۆڤ بە مانا کۆمەلایەتییەکەی پێناسە ناکات، هاولاتی چەمکێکی سیاسییە و پێناسەکردنی مرۆڤیش وەک هاوولاتیی دەوڵەتێکی نەتەوەیی، کورتکردنەوەی

پێناسەکردنی مرۆڤە بۆ مانا سیاسییەکەی. مارکس پێی وایە ئەو مرۆڤەی لەناو ئەو مافانەدا ئامادەیە، مرۆڤێکی گەردوونی نییە، بەڵکو کەسێکە دەوڵەتی نەتەوەیی دروستی دەکات.[1]

هاوکات لە دیدی مارکسدا ئەو وێنەیەی مرۆڤ کە لەپشتی بەیاننامەکانی مافی مرۆڤەوە ئامادەیە، وێنەی تاکەکەسێکی دابڕاوە لەناو کۆمەڵگەیەکدا کە پێویستە ئەو تاکەکەسە لەو کۆمەڵگەیە بپارێزرێت. کۆمەڵگە لەناو ئەو بەیاننامانەدا ڕووبەرێک نییە تاکەکەس لەناویدا دروست ببێت و پێبگات و گەشە بکات، بەڵکو شوێنێکە دژ بە تاکەکەس و پێویستە تیایدا تاکەکەس لە خودی کۆمەڵگەکە بپارێزرێت. بە مانایەکی دیکە، ئەو وێنەیەی بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ بۆ کۆمەڵگەی دروست دەکات، وێنەی کۆمەڵگەیەکی ناحەز و دوژمنکارە لە پەیوەندیدا بەو مرۆڤەوە کە لەو کۆمەڵگەیەدا دەژی، مرۆڤێک لە دیدی مارکسدا کورت کراوەتەوە بۆ تاکەکەسێکی سەربەخۆ و دابڕاو. بەکورتی لە دیدی مارکسدا وێنەی ئەو تاکەکەسەی لەپشتی مافەکانی مرۆڤ و هاوولاتیی شۆڕشی فەرەنسییەوە ئامادەیە، وێنەی تاکەکەسێکە لە هەلومەرجێکی هۆبزیدا، تیایدا هەمووان دژ بە هەموانن و ئەرکی ئەو مافانە ئەوەیە مافەکان و ئازادییەکانی تاکەکەس لە پەیوەندیدا بە تاکەکانی تر و بە کۆمەڵگەوە بپارێزرێت. بە بۆچوونی مارکس، پەیوەندیی مرۆڤ و مرۆڤ لەو

---

[1]_بڕوانە: Hamacher,Werner (2015). On the Right to Have Rights Human Rights; Marx and Arendt. The New Centennial Review, Volume 14, Number 2, Fall 2014, p.173.

بەیاننامەیەدا پەیوەندییەکی ناتەندروست و پڕ مەترسییە و ئەوەی پێویستە ڕوو بدات، پاراستنی تاکەکەسە لە تاکەکەسەکانی تر. مارکس پێی وایە، ئەم ڕوانینە وا دەکات شتێک بە ناوی کۆمەڵگەوە لەناو ئەو بەیاننامانەدا بوونی نەبێت، ئەگەر هەشبێت، ئەوا وێنەی کۆمەڵگەیەکە بەبێ کردەی کۆمەڵایەتیبوون، بەبێ توانای وێناکردنی مرۆڤەکان لە دیدێکی جیاواز لەو دیدە هۆبزییەی مرۆڤەکان وەک دوژمنی یەکتری وێنا دەکات. وێنەی کۆمەڵگەی ناو مافەکان، وێنەی کۆمەڵگەیەکە پڕ لە تاکەکەسی لەیەکدابڕاو و داخراو، کە هیچ پەیوەندییەکی هاوبەش و پێکەوەیی جگە لە پەیوەندیی دوژمنایەتی و ململانێ و ترسی بەردەوام لە یەکتری کۆیان ناکاتەوە. هاوکات شتێک بە ناوی هارمۆنیەت و هاریکاری و هاودەردییەوە لەم وێناکردنەدا بۆ کۆمەڵگە بوونی نییە. لە دیدی مارکسدا، ئەم مافانە لە باشترین حاڵەتدا دەتوانن تاکەکەس لە ڕووی سیاسییەوە ئازاد بکەن، بەڵام ناتوانن لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ئازادی بکەن. ئەگەر مافەکان گەردوونی و یونیڤێرساڵیش بن، ئەوا ئەو مافانە مافی ژمارەیەکی بێشوماری تاکەکەسی داخراو و بێپەیوەندین، کە شتێکیان بە ناوی کۆمەڵگە و کۆمەڵایەتیبوونەوە لەناودا نییە.[1] سەرەڕای هەموو ئەم ڕەخنانە، مارکس پێی وایە کە بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ دیاردەیەکی نوێیە و هێما بۆ ئاستێکی نوێ لە "گەشەکردنی ڕۆحیی مرۆڤانە دەکات."[2]

هانا ئارێنتیش لە کتێبی "بنەماکانی تۆتالیتاریزمدا"

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٨٠.

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٧٩.

دەگەڕێتەوە سەر مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ و ڕەخنەیەکی توند ئاراستەی ڕەهەندە یاساییەکانی ئەم مافانە دەکات. لای ئەم فەیلەسووفەش، مافەکانی مرۆڤ وەک مافی هاوولاتیبوون پێناسە کراون و هاوولاتیبوونیش دیاردەیەکی سەرەکیی ناو چوارچێوەکانی دەوڵەتی نەتەوەیە. ئەمەش مانای ئەوەیە، بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت پەنا بۆ مافەکانی مرۆڤ ببات، دەبێت هاوولاتیی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بێت، دەنا ناتوانێت پەنا بۆ هیچ یەکێک لەو مافانە ببات. ئەم گرێدانەی "مافەکانی مرۆڤ" بە "مافی هاوولاتییەوە،" ئەو خاڵە سەرەکییەیە کە هانا ئارێنت ڕەخنەی دەکات. لە دیدی ئارێنتدا، ئەم بەستنەوە لۆژیکییەی مافەکانی مرۆڤ بە دەوڵەتی نەتەوەییەوە، مانای ئەوەیە ئەو کەسەی بێدەوڵەت بوو بێمافیش دەبێت، ئەو کەسەی چوارچێوەی دەوڵەتێک نەیگرێتە خۆی، هیچ یەکێک لەو مافانە نابێت بە مافی ئەو وەک مرۆڤێک. هاوکێشەکە لای ئارێنت زۆر سادەیە: "بێدەوڵەتی مانای بێمافی." خاڵێکی دیکە کە ئارێنت جەختی لێ دەکاتەوە، مەترسییەکانی دەوڵەتی مۆدێرنە، ئەو ڕاستییەیە کە دەوڵەتی نەتەوە لە دونیای مۆدێرندا توانای ئەوەی هەیە لەناو سنوورە نەتەوەییەکانی خۆیدا پێناسەی ئەوە بکات، کێ مرۆڤە و کێ مرۆڤ نییە، یانی کێ مافی هەیە و کێ مافی نییە، بەمەش هەموو مانایەک لەو بنەما گەردوونی و یونیڤێرساڵیانە دەسێنێتەوە، کە ئەو مافانە هەڵگریین. ئەمە وا دەکات دەوڵەتی نەتەوە کەی بیەوێت بتوانێت ئەو مافانە پەک بخات و نەهێڵێت هیچ

کاریگەرییەکیان هەبێت.[1] بە بۆچوونی ئارێنت، ئەم گرێدانەی مافەکانی مرۆڤ و بە مافی هاوولاتیبوونەوە، وا دەکات لە سەدەی بیستەمدا چەندەها دەوڵەت مافی هاوولاتیبوون لە ملیۆنەها مرۆڤی ناو سنوورەکانی خۆیان بسێننەوە و بیانگرن و لە ژینگەی ڕەسەنی خۆیان هەڵیان بکەنن و لە کەمپەکانی کوشتندا کۆیان بکەنەوە و دواجاریش بیانکوژن. هاوکات ئەم دۆخە وا دەکات بە ملیۆنەها مرۆڤ وڵاتەکانی خۆیان بەجێ بهێڵن و لە شوێنێکی دیکەدا ببن بە پەناهەندە. هاوکێشەکە لای ئارێنت بەم شێوەیە: دەرکردنە دەرەوەی سنوورەکانی دەوڵەتی نەتەوە مانای لەدەستدانی هاوولاتیبوون و لەدەستدانی هاوولاتیبوونیش مانای لەدەستدانی هەموو مافێک، بە مافەکانی مرۆڤیشەوە. لای ئارێنت هەم بە هۆی نەبوونی دەزگا و هێز و لایەنێکی نێونەتەوەیی و گەردوونییەوە، کە لە مەسەلەی ڕێزگرتن و پیادەکردنی مافەکانی مرۆڤ بپرسێتەوە، هەم بە هۆی ئەو گرێدانە توندەی مافەکانی مرۆڤ بە مافی هاوولاتیبوونەوە، دۆخێک دروست بووە، تیایدا مافەکانی مرۆڤ گۆڕاون بۆ کۆمەڵێک پرنسیپی لاواز، کە دەوڵەتی نەتەوە بتوانێت بەئاسانی پەلاماریان بدات و بێڕێزییان بەرامبەر بکات.

وەک دەبینین، ئەو خاڵەی هانا ئارێنت لێیەوە دەست پێ دەکات بۆ ڕەخنەکردنی مافەکانی مرۆڤ، هەمان ئەو خاڵەیە کە مارکس گرنگیی پێ دەدات، واتە مەسەلەی بەستنەوەی ئەم مافانەیە بە مافی هاوولاتیبوونەوە، بە جۆرێک، هەموو

---

[1] ـبڕوانە: لاپەڕە ٣٦٩-٣٨٤ Arend, Hannah (2004). The Origins of Totalitarianism. New York: Schocken Books.

لەدەستدانێکی مافی هاوولاتیبوون، مانای لەدەستدانی مافەکانی مرۆڤیش بێت. بە حوکمی ئەوەش، دونیای مۆدێرن یەک دونیایە و بەتەواوییش ڕێکخراو و دیسپلینکراوە، بۆیە لەدەستدانی ئەو مافانە لە شوێنێکی ئەم دونیایەدا مانای "لەدەستدانی جیهان" دەگەیەنێت، چونکە هەموو شوێنەکانی جیهان نەک تەنها بەیەکەوە گرێ دراون، بەڵکو هەموویان بە هەمان شێوە ڕێک خراون و هەمان پرنسیپەکانی دەوڵەتی نەتەوە و هاوولاتیبوون لەناویاندا سەروەرە. ئەمە وا دەکات مافەکانی مرۆڤ مافی مرۆڤێکی ئەبستراکت بێت بەبێ جیهان، یان مافێک بێت لە جیهانێکی ئەبستراکتدا بەبێ مرۆڤ، دەرکردن لە نیشتیمانی نەتەوەیی مانای دەرکردن بێت لە جیهان، چونکە هەموو جیهان لەسەر بنەمای دابەشبوونی نیشتیمانی نەتەوەیی ڕێک خراوە. ئەمە وا لە ئارێنت دەکات، لەباتی قسەکردن لەسەر مافەکانی مرۆڤ، باس لە "مافی هەبوونی ماف" بکات، وا بکات بەرگری لە شتێک بکات، کە پابەست بێت بە "سروشت"ی ئینسانەوە وەک ئینسان، نەک بە ئینتیمای نەتەوەیی و نیشتیمانی و ئەتنییەوە. بەرگری لە مافێک بکات، بەر لەوەی ببێت بە مافی ناو شێوازێکی تایبەتی ڕێکخستنی جیهان.

بە بۆچوونی من، ئەو مەترسییە گەورەیەی ئارێنت لە دونیای مۆدێرندا نیشانی ئەدات، مەترسیی "لەدەستدانی جیهانە،" ئەوە نییە مرۆڤ نیشتیمانێکی نەتەوەیی لەدەست بدات، بەڵکو ئەوەیە جیهان لەدەست بدات، چونکە جیهانی مۆدێرن جیهان نییە بە مانا گشتییەکەی جیهان، بەڵکو جیهانێکە دابەش کراوە بۆ چەندان "ماڵ" و "نیشتیمانی

نەتەوەیی،" بە ڕادەیەک، لە دەرەوەی ئەو "نیشتیمانە نەتەوەییانەدا" شتێک بە ناوی "جیهانە"وە نەماوەتەوە، بۆیە دەرکردن لە یەکێک لەو نیشتیمانانە، مانای دەرکردنە لە جیهان خۆی. ئەمەش لە دیدی ئارێنتدا مانای ئەوەیە مرۆڤ لە دونیای مۆدێرندا "سروشت"ی مرۆڤبوونی لەدەست داوە و بووە بە ئەندامی ناو ئەم یان ئەو یەکەی سیاسی کە "نیشتیمانە نەتەوەییەکانە." ئەمەش تەنها یەک مانای هەیە: شووناسی سیاسیی مرۆڤ وەک ئەندامی ئەم یان ئەو نەتەوە، کۆتایی بە "شووناسی سروشتی"ی مرۆڤ وەک مرۆڤ هێناوە. "مافی هەبوونی ماف،" وەک ئارێنت لە کۆتاییی کتێبی بنەماکانی تۆتالیتاریزمدا باسی دەکات، مانای ئەوەی مرۆڤ لە چوارچێوەیەکدا بژی، تیایدا لەسەر بنەمای کردەوەکانی و لەسەر بنەمای بۆچوونەکانی داوەری بکرێت، نەک لەسەر بنەمای ئەندامبوون یان نەبوون لەم یان لەو گرووپی ئەتنی و دینی و نەتەوەییدا، بەڵام هاوکات مانای ئەوەشە کە مرۆڤ مافی ئەوەی هەبێت سەر بە گرووپ و کۆمەڵەیەکی مرۆییی ڕێکخراو بێت،organized community.[1] ئارێنت پێی وایە، لەباتی یاسا نەتەوەیی و نیشتیمانییەکان، یاسایەکی نوێ پێویستە کە هەموو جیهان وەک یەکە ببینێت، یاسایەک، ئەو ناوی دەنێت "یاسایەکی تازە بۆ زەمین-"**new law of the earth** کە وەک پرنسیپێکی سیاسیی تازە کار بکات و بەرگری لە کەرامەتی ئینسانی بکات.[2] ئارێنت لە ڕێگەی بەرگریکردن لەوەوە کە

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٧٦-٢٧٧.

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل xxvii.

مـرۆڤ مافـی ئـەوەی هەیـە خاوەنمـاف بێـت، بەرگریـی لـە مافێکی بنەڕەتیتـر دەکات لـە مافـی هاولاتیبـوون، ئـەم مافـەش نـەک تەنهـا مافێکی بنەڕەتییە، بەڵکو تاکە مافێکی سیاسییشـە کـە دەتوانێـت وەک چوارچێـوەی سـەرەکیی مافەکانـی تـری مـرۆڤ کار بکات. ئارێنت ئـەو مافـە بنەڕەتـی و دامەزرێنـەرە نـاو دەنێت مافـی "پێکەوەژیـان و ڕێکخسـتنی ئـەو مەسـەلانەی پەیوەندییـان بـە ژیانی مـرۆڤ و لەپێش هەمووانیشـەوە ژیانی گشـتییەوە هەیـە، بـەلام لـە ڕێگـەی زمانـەوە نـەک لـە ڕێگـەی توندوتیژییـەوە."[١]

بەکورتـی، ئـەو خاڵـەی ئارێنت بەرگریی لێ دەکات، ئەوەیە کـە بـەر لـە ڕیزکردنـی مافەکانـی مـرۆڤ لەپاڵ یەکدا، مافێکی بنەڕەتیتـر و بنچینەییتـر هەیـە کـە مـرۆڤ پێویسـتە هەیبێـت، ئەویش "مافی هەبوونی مافە،" ئەوەشـی کۆڵەکە فیکرییەکانی ئـەم مافـە دەستنیشـان دەکات، "مافـی سروشـتی" یـان "مافـی خوداکـرد" نییـە، بەڵکـو مافێکـە لـەو ڕاسـتییەوە سـەرچاوە دەگرێـت، کـە مـرۆڤ بوونەوەرێکـی سیاسـییە و توانـای دروسـتکردنی کۆمەڵـە و کۆمەڵگـە و یەکـەی دەسـتەجەمعیی فرەشـێوە و گـەورەی هەیـە. ئـەم مافـە پەیوەندیـی بـەوەوە هەیـە کـە مـرۆڤ بوونەوەرێکـە توانـای دەرکردنـی بڕیـاری دەسـتەجەمعیی هەیـە دەربـارەی ئـەو سیسـتمەی مرۆڤـەکان بەیەکـەوە کـۆ دەکاتـەوە، دەربـارەی ئـەوەی ئـەو سیسـتمە چـی بێـت و چـۆن بێـت. مافـی هەبوونـی مـاف ئـەو پرنسـیپەیە کـە دەکەوێتـە پێـش دەرکردنـی بڕیـارە دەسـتەجەمعییەکانەوە سـەبارەت بـەوەی کۆمەڵگـە چییـە و هیـی کێیـە و چـۆن

---

١_بڕوانە: Hamacher, Werner (٢٠١٥). لاپەڕە ١٨٨-١٨٩.

ڕێک بخرێت. لای ئارێنت، وەک لای ئەرستۆ، مرۆڤ بوونەوەرێکی سیاسییە، سیاسیبوونیشی دەکەوێتە پێش دەرکەوتەکانی تری مرۆڤبوونیەوە، بۆیە مافی هەبوونی ماف، مافێکە کاری ڕێکخستنی ئەو دۆخی سیاسیبوونەی مرۆڤە، بۆ بەتاڵکردنەوەی ئەو سیاسیبوونەیە لە ئەگەری خراپبەکارهێنانی ئەگەرە سیاسییەکانی ناو مرۆڤ. لای ئارێنت، هەموو مافێک و ئەو کۆمەڵگەیەشی کە ئەو مافانە ڕێک دەخات، بەرهەمی بڕیاری مرۆڤانە و دەستەجەمعییە، بۆیە "مافی هەبوونی ماف،" ئەو دۆخەیە کە دەکەوێتە پێش دەرکردنی بڕیارە دەستەجەمعییەکان، ئەو پێشینەیەیە کە نەک تەنها پێشمەرجی بڕیارە دەستەجەمعییەکانە، بەڵکو دەرەنجامی ئەو بڕیارانەشە. واتە هەموو ئەو بڕیارانەی دەستنیشانی ئەوە دەکەن چ جۆرە کۆمەڵگەیەک و چ جۆرە ژیانێکی ئینسانی و کۆمەڵایەتیی دەستەجەمعی دروست ببێت، هەم پێشمەرجەکانیان و هەم دەرەنجامەکانیان دەبێت "مافی هەبوونی ماف" ڕێکیان بخات. ئەمەش مەسەلەیەک نییە یەک جار بڕیاری لەسەر بدرێت و تەواو ببێت، بەڵکو دۆخێکی بەردەوامە و لەگەڵ مرۆڤ و بڕیارە دەستەجەمعییەکانیدایە، لە بەردەمی هەموو بڕیارێکدا، کە پەیوەندیی بە ژیانی گشتییەوە هەیە، سەرلەنوێ ئامادەیە.[1] "مافی هەبوونی ماف،" شتێکە دەکەوێتە پێش هەموو پارادایمێکی تایبەتی چۆنێتیی وێناکردن و تێگەیشتن و پێناسەکردنی مرۆڤەوە، بە مرۆڤی سروشتی خۆشیەوە.

ئەم مانایەی مرۆڤبوون لای ئارێنت مانایەکە دەکەوێتە

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٩٠.

پێش هەر پێناسەیەکی ئەخلاقی و مێژوویی مرۆڤەوە، دەکەوێتە پێش بەخشینی هەر "جەوهەر" و "سروشت"ێکەوە بە مرۆڤ. لە ڕاستیدا ڕوانینی ئارێنت بۆ مرۆڤ تەواو ناکۆکە بە هەر وێنەیەکی "جەوهەرگەرا" بۆ مرۆڤ. ئارێنت مرۆڤ وەک خاوەن "جەوهەر" و "سروشت"ێکی تایبەت نابینێت کە مافەکان بەو جەوهەر و سروشتەوە گرێ درابن، بە پێچەوانەوە، ئارێنت مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی پلوارالی بێجەوهەر دەبینێت، کە کراوەیە بەسەر چەندەها شێوازی بوون و شێوازی جیاوازی ئامادەگی لەناو جیهاندا. "مافی هەبوونی ماف،" وەک چۆن پابەندە بە توانای مرۆڤەوە بۆ دەرکردنی بڕیاری دەستەجەمعی و دەرکردنی بڕیار سەبارەت بە ژیانی گشتی، ئاواش پابەستە بەو ڕاستییەوە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی پلوراڵە و مرۆڤبوون لە هیچ جەوهەر و وێنەیەکی سروشتیدا بەند ناکرێت. "مافی هەبوونی ماف،" بەشێکە لە هەوڵی مرۆڤ بۆ ڕزگارکردنی ئەم پلوراڵیزمە و ڕێگرتن لەوەی کورت بکرێتەوە بۆ دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی مرۆڤبوون. بۆیە ئەم مافی هەبوونی مافە، مافێک نییە بەتەنها بۆ کەسێک یان کۆمەڵگەیەک، شتێک نییە هی ئەم یان ئەو مرۆڤ بێت بەتەنها، بەڵکو مافێکە هی هەموو ئەو "ئەوانی تر"ەشە کە بەشێکن لە دۆخی پلوراڵیی مرۆڤبوون لەناو جیهاندا، مافێکە بەر لە دروستکردنی یاساکان و بەهاکان و ئەخلاقە تایبەتەکان ئامادەیە، بەر لە فۆرمیلەکردنی ئەم وێنە یان ئەوی تر بۆ مرۆڤ. لە بەشی سێهەمی ئەم نووسینەدا، بەدرێژی باس لە بۆچوونی هانا ئارێنت بۆ پلوراڵیزمبوونی ژیان دەکەین.

# دەرەنجام

لەدایکبوونی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و وەک کەسێک یەکسان لەگەڵ کەسەکانی تردا، دیاردەیەکی تەواو نوێی ناو مێژووی مرۆڤایەتییە. دەکرێت بەئاسانی ئەم لەدایکبوونە بگەڕێنینەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم و بیبەستینەوە بە هەردوو شۆڕشی ئەمەریکی و فەرەنسییەوە و بە لەدایکبوونی ئەو بەیاننامانەوە کە ئەو دوو شۆڕشە تیایدا بەرگری لە مرۆڤ و مافەکانی دەکەن. لەم دوو شۆڕشەدا مرۆڤ بە مانای بوونەوەرێک، خاوەنی کۆمەڵێک مافی بنەڕەتی، کە هیچ کەس و لایەن و هێزێک بۆی نییە لێی بسێنێتەوە، لەدایک دەبێت. ئەم لەدایکبوونە پابەستە بە لەدایکبوونی پارادایمێکی سیاسی و تیۆری و مەعریفیی نوێوە، کە لە قۆناغەکانی پێشتردا بوونی نەبووە. لەم پارادایمەدا ئەوەی لەدایک دەبێت مرۆڤە، بە مانا گەردوونییەکەی، مرۆڤە وەک مرۆڤ، مرۆڤە لە دەرەوەی دەستنیشانکردنە دینی و ئەتنی و نەتەوەیی و ژیارییەکانیەوە. لەدایکبوونی ئەم پارادایمە، تەنها کارێکی فیکری و تیۆری نەبووە، تەنها کاری نووسەران و زانایان و خوێندەواران نەبووە، بەڵکو بەرهەمی ڕەنج و کۆشش و خەباتی ژمارەیەکی بێشومار لە سەرباز و کەسانی نەناسراون، کە بەسەر یەکەوە مێژووی کۆمەڵگە مۆدێرنەکان دروست دەکەن. یەکێک لە ئاکارە سەرەکییەکانی مۆدێرنە، ئەوەیە کە مرۆڤی سادە دەگۆڕێت

بۆ بکەرێکی مێژوویی. کە باس لە لەدایکبوونی پارادیمێکی نوێ دەکەم، تیایدا مرۆڤی خاوەنماف و مرۆڤی یەکسان یەکەی سەرەکین، پێویستە سێ خاڵ تەواو ئاشکرا بێت، یەکەمیان ئەوەیە کە بەر لە لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن و لە قۆناغەکانی پێشووتری ژیانی مرۆڤایەتیدا، هەندێک بۆچوون و ڕوانین هەبوون، مرۆڤیان لە سێنتەری گرنگیپێدان و نرخاندنی بەرزدا ناساندووە، شتێکیان داوا کردووە، نزیک لەوەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف ببینێت، بەڵام هەموو ئەمانە جگە لە ساتەوەختی کورت و جگە لە خواستی ناڕوون و جگە لە گوتارێکی هێجگار سەرەتایی زیاتر نەبوون. مەسەلەی خەمخۆری و مشوورخواردن بۆ ئەوانی تر، بەشێکە لە مێژووی مرۆڤ لە سەردەمە کۆنەکانەوە تا ئەمڕۆ، ئەم (ئەوانی تر)یش دەشێت کەسانی جیاواز بن، دەشێت کەسانی نزیکی وەک باوک و دایک و برا و خوشک و دۆست و ناسراون بن، بەڵام دەشێت کەسانێک بن، مرۆڤ نەشیانناسێت کەچی بە ئەرکی خۆی زانیبێت کە لە خەمیاندا بێت، وەک خەمخۆری بۆ کەسانی پیر و پەککەوتە، کەسە لاواز و پەراوێزییەکانی ناو کۆمەڵگە، ئەوانەی زۆر هەژار و نەدارن هتد... بەکورتی، مشوورخواردنی کەسانی نەناسراو بەشێک بووە لە کەلەپووری دینی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگیی بەشێکی زۆری کۆمەڵگەکانی دونیا، بەڵام ئەم خەمخۆرییە، خەمخۆرییەکی ئەخلاقییە و تەواو جیاوازە لە وێناکردنی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و یەکسان بە کەسەکانی تر، کە وێناکردنێکی سیاسییە و پەیوەستە بە کۆمەڵێک ئاڵوگۆڕی سیاسی و کۆمەلایەتیی گرنگەوە. ماف

وەک دیاردەیەکی سیاسی، گوتارێکی تەواو نوێیە و بەشێکە لە مێژووی لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن.

خاڵی دووهەم ئەوەیە، ڕاستە بەر لە سەدەی حەڤدەهەم و بەر لە دوو شۆڕشە گەورەکەی ئەو سەدەیە چەندان دۆکۆمێنتی سیاسی و بیرۆکەی ئەخلاقی و پەیامی دینی هەبوون، کە لە ڕێزگرتنی مرۆڤ و نرخدانان بۆ مرۆڤ نزیک بوونەتەوە، بەڵام هیچیان بە ڕادەی ئەو پارادایمە نوێیە ئاشکرا و ڕوون نەبوون و ئەو یەکسانی و مافبەخشینەش کە ئەو بەیاننامانە باسی دەکەن، بەو شێوە گەردوونی و یونڤێرساڵییە نمایش نەکراون.

خاڵی سێهەمیش ئەوەیە، کە لەدایکبوونی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی گەردوونیی خاوەنماف، لەدایکبوونێکی بێکێشە نەبووە و ئەو وێناکردنەی کە لەپشتی بەیاننامەکانی مافی مرۆڤەوەن، هەم ڕەخنە کراون، وەک لای مارکس و هانا ئارێنت بینیمان، هەم کەوتوونەتە ناو چوارچێوەکانی دەوڵەتی نەتەوەییەوە و بەسەر هەموو مرۆڤێکدا پیادە نەکراون، هەم زۆر جاریش لە ئاستی گوتاردا ماونەتەوە و بەزەحمەت دابەزیونەتە ناو مێژووەوە. هاوشان بەمانەش، چەندەها شێوازی نوێی هەڵاوێردن و نایەکسانی و بێمافی دروست بووە، کە وا دەکەن مەسەلەی بەرگریکردن لە ماف و لە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی یەکسان، کاری هەموو سەردەمەکان و ئەرکی هەموو نەوەکان بێت. تەنها لەدوای جەنگی جیهانیی دووهەمەوە، بەتایبەتی لە ساڵانی شەستەوە، لە ئەورووپا و ئەمەریکادا، مافەکانی مرۆڤ بە شێوازی جیاواز و زۆر جار سنووردار، دەکەونە بواری پیادەکردنەوە. ڕەنگە

دروستبوونی "دەوڵەتی یاسا و خوشنوودگەرایی،" کە تیایدا مرۆڤ کۆمەڵێک مافی گرنگ وەدەست دەهێنێت، بێگومان بە هەموو نووقسانییەکانیەوە، تاکە ئەزموونێکی سیاسیی ناو دونیای مۆدێرن بێت، کە ڕێزگرتن لە وێنە تازەکەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و یەکسان، پیادە بووبێت. تەنها لەم ئەزموونانەدا مرۆڤ دەبێت بە بەهایەکی دەستووری، کە دەبێت لەلایەن هەموانەوە ڕێزی لێ بگیرێت، بەڵام لێرەشدا هەم چوارچێوە نەتەوەییەکان و هەم دۆخی هەلاوێردنی ناوەکی ئامادەن، کە پیادەکردنی ئەم مافانە زەحمەت دەکەن.

لەپشتی دروستبوونی وێنەی مرۆڤەوە وەک بوونەوەرێکی گەردوونیی خاوەنماف، هەم کۆمەڵێک داواکاریی سیاسی ئامادەیە و هەم خواستی دروستکردنی شێوازێکی تایبەت لە دەوڵەت و کۆمەڵگە ئامادەیە، هەم کۆمەڵێک داواکاریی ئەخلاقییش ئامادەیە، لە نموونەی گرنگیدان بە مەسەلەی مشوورخواردنی مرۆڤە قوربانییەکان و هاریکاریکردن و بەدەمەوەچوونیان، وەک ئامرازێک بۆ کەمکردنەوەی ئازارەکانی مرۆڤ لەناو دونیادا. پێداگرتن لەسەر هاودەردی و هاوهەستی و هاوچارەنووسیی یونڤێرساڵیی مرۆڤەکان بەشێکە لەو وێنە تازەیەی بۆ مرۆڤی خاوەنماف لەدایک دەبێت. بێگومان بەرامبەر بە مانا گەردوونییەکەی بوونی مرۆڤ چەندان مانای تر هەیە، کە تەواو ناگەردوونی و ناوچەیین، لەوانەش، بوونی مرۆڤ وەک ئەندامی خێزان، خێڵ، ئەتنیەت، نەتەوە، جێندەر، کاست، دین، ئاستی شارستانی، جۆری حەزی سێکسی، هتد... مانا گەردوونییەکانی بوونی مرۆڤ نابێت مانای سڕینەوەی ئەو ئینتیما تایبەتانەی تری

مرۆڤ بێت، بەڵکو پێویستە مانای کۆکردنەوەی هەموو ئەو ئینتیمایانە بێت لەناو چوارچێوەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و مەعریفیی نوێدا، کە تیایدا مانا گەردوونییەکان هەوڵ بدەن ببن بە بەشێک لە مانا ناوچەیی و لۆکاڵییەکان و ئەمانەش هەوڵ بدەن ببن بە بەشێک لەو وێنە گەردوونییە مافساز و یەکسانەی مرۆڤ کە وێنە گەردوونییەکەی مرۆڤ هەڵگریەتی.

لەم ناوچەیەی ئێمەدا مرۆڤ تا ئەمڕۆ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و یەکسان بوونی نییە. نە لە سیاسەتدا، نە لە ئابووریدا، نە لە دیندا، ئەم مرۆڤە یەکسان و خاوەنمافە بوونی نییە، بەڵام سەرەتاکانی لەدایکبوونی لەناو هۆشیاریی زیاد لە گروپ و چینێکی کۆمەڵایەتیدایە. درووشمەکانی بەهاری عەرەبی، کە بریتی بوون لە "ئازادی و نان و کەرامەت" گوزارشت لە سەرەتا زەحمەتەکانی ئەم لەدایکبوونە دەکەن.

## سەرەتا

ئەم وتارە تایبەتە بە دەستنیشانکردنی ماناکانی کەرامەت وەک چەمکێکی تیۆری و فیکری و وەک بەشێکیش لە پێکهێنەرە هەرە بنەڕەتی و سەرەکییەکانی مرۆڤبوونی مرۆڤ. چەمکی کەرامەت تەنها چەمکێکی ئەخلاقی نییە کە شتێکمان لەسەر چۆنێتیی وێناکردن و مامەڵەکردنی مرۆڤ پێ بڵێت، بەڵکو چەمکێکی سیاسیشە کە دەتوانێت زۆر شتمان دەربارەی مۆدێلەکانی دەسەڵات پێ بڵێت، هەروەها شتێکی زۆریشمان دەربارەی ئەو کۆمەڵگەیە پێ بڵێت کە لەژێر خوێندنەوە و ڕاڤەکردندایە. کەرامەت لەم گۆشەنیگایەوە چەمکێکی تیۆریی گرنگە بۆ نرخاندن و داوەریکردنی مۆدێلەکانی دەسەڵات و شێوازی کۆمەڵگەکان. پرسیاری سەرەکی دەربارەی کەرامەت ئەوەیە: ئایا مرۆڤ لەناو چ جۆرە سیستمێکی دەسەڵات و چ جۆرە کۆمەڵگەیەکدا دەژی؟ ئایا لەو جێگەیانەدا وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت دەبینرێت و مامەڵە دەکرێت یان نا؟ ئایا دەزگا و یاسا و بەها و ئەخلاقیاتی پاراستنی کەرامەت لەو دەوڵەت کۆمەڵگەیەدا هەن یان نین؟ ئایا مرۆڤ وەک بوونەوەرێک دەبینرێت کە هەڵگری "شتێک"ە نەکرێت دەستی بۆ ببردرێت و بریندار بکرێت، چونکە ئەو "شتە" پەیوەندیی بە کەرامەتی مرۆڤەوە هەیە، یان خودی کەرامەتی ئەو مرۆڤەیە؟ لە پەیوەندیدا بە کۆمەڵگەی کوردستانەوە ئەم

نووسینە دەیەوێت کەمەکێک لەسەر مێژووی کۆمەڵگای ئێمە لە سەدەی بیستەمدا بوەستێت و لە ڕێگەی چەمکی کەرامەتەوە هەندێک بۆچوونی تایبەت لەسەر ئەو مێژووە دەر ببڕێت.

بەشی یەکەمی ئەم نووسینە تەرخانە بۆ ڕاڤەکردنێکی کورت و خێرای مێژووی میللەت و مرۆڤی ئێمە لە سەدەی بیستەمدا لەپاڵ چەمکی کەرامەتدا، بەتایبەتی لەپاڵ ئەو وێناکردنەدا کە فرانز فانۆن بۆ دیاردەی داگیرکردن و کۆلۆنیالیزمی هەیە. لە بەشی دووهەمی نووسینەکەدا، چەمکی کەرامەت بەدرێژی شی دەکرێتەوە و چەند دیدێکی تیۆریی جیاواز دەخرێتە ڕوو، لەوانەش، دیدی ئەرستۆ و دیدی ئیمانوێل کانت. پاشان بەدرێژی لەسەر ڕوانینەکانی دوو فەیلەسووفی هاوچەرخ دەوەستین، کە مەسەلەی کەرامەت یەکێک لە بابەتە سەرەکی و گرنگەکانی ناو نووسینەکانیانە: یەکەمیان فەیلەسووفی کەنەدی: چارلس تایلەرە و دووهەمیان فەیلەسووفی ئەڵمانی: ئالێکس هۆنێسە، کە بە نەوەی سێهەمی قوتابخانەی فرانکفۆرت دادەنرێت.

## کۆمەڵگەی ئێمە و کەرامەت

لە کتێبێکدا بە ناوی "کەرامەت"ەوە، دەروونناسی ئەمەریکی: دۆنا هێکس دەنووسێت: "ئەگەر بێکەرامەتی شتێک بێت مرۆڤ بکات بە بوونەوەرێکی پارچەپارچە و لەتوپەت، ئەوا کەرامەت ئەو شتەیە کە ئەو پارچە و لەتانە کۆ دەکاتەوە و جارێکی دیکە دەمانکاتەوە بە مرۆڤ."[1] دەکرێت مێژووی سەدەی

1_ Hicks, Donna (2011). Dignity: Its Essential Role in Resolving

بیستەمی کۆمەڵگەی ئێمە، مێژووی داگیرکردن و بێمافکردن و بێڕێزیکردن بەرامبەر بە مرۆڤی ئەم کۆمەڵگەیە، وەک مێژووی شکاندنی کەرامەت و هەوڵدان بۆ بێکەرامەتکردنی مرۆڤی ئێمە تەماشا بکەین. هەموو کردەی داگیرکردنێک، کۆلۆنیالیزم وەک پرۆژە و وەک ئاکار، وەک شێوازی ئیدارەدان و حوکمڕانی، تەنانەت وەک شێوازێکی تایبەتی شارسازی، کردەی شکاندنی کەرامەتی ئەو میللەت و نەتەوانەیە کە داگیر دەکرێن. لەناو هەموو پەیوەندییەکی کۆلۆنیالیدا، کردەی شکاندنی کەرامەت ئامادەیە، جۆرێک لە ڕاسیزم ئامادەیە کە مرۆڤ و میللەتەکان لە یەکتری جیا دەکاتەوە و یەکێکیان بە خاوەنکەرامەت و ئەوی تریان وەک بێکەرامەت وێنا دەکات. ڕەنگە کەس هێندەی فرانز فانۆن ئەم ڕاستییە مێژووییانەی نەناسیبێت و بەوردی تیۆریزەی نەکردبێت. لای فانۆن، کۆلۆنیالیزم پرۆژەیەکی گەورەی شکاندنی کەرامەتی میللەتان و کەرامەتی تاکەکەسە داگیرکراوەکانە. بۆیە سیانەی کەرامەت و داگیرکردن و خەباتی نیشتیمانی، دەبنە سیانەیەکی لەیەکدانەبڕاو و فانۆن پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان مافی بەکارهێنانی توندوتیژی و تیمارکردنی کەرامەتێکی بریندارکراودا پێشنیار دەکات، کتێبی "چەوساوەکانی سەرزەوی،" مانیفێستێکی سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژیی ئەم ئاکارە سەرەکییەی داگیرکاری و کۆلۆنیالیزم و کاردانەوەیە بە ڕووی کۆلۆنیالیزمدا. تێزێکی سەرەکی کە فانۆن لەم کتێبەدا بەرگریی لێ دەکات، ئەوەیە کە کۆلۆنیالیزم لە هەموو شێوەکانیدا کردەیەکەی توندوتیژ و ڕاستیستانەیە و شکاندنی کەرامەتی تاکەکەسی و دەستەجەمعی

---

Conflict. Yale University Press. P. xii.

بەشێکی ناوەکیی ئەو کردەیەیە، بۆیە پەنابردن بۆ توندوتیژی بۆ سڕینەوەی برینە سیاسی و دەروونییەکانی کۆلۆنیالیزم و بۆ ساڕێژکردنەوەی کەرامەتی شکێنراو، نەک تەنها کردەیەکی ڕەوایە، بەڵکو پێداویستییەکی سیاسی و فەرهەنگی و سایکۆلۆژییشە. لە بەشی یەکەمی کتێبی "چەوساوەکانی سەرزەوی"یەوە بۆ بەشی چوارەمی کتێبەکە، فانون بەدرێژی بەرگری لەم تێزە دەکات.[1] لە دیدی فانۆندا، مرۆڤی داگیرکراو و کەرامەتشکێنراو دەتوانێت تەنها لە ڕێگەی بەکارهێنانی توندوتیژییەوە خۆی لە سەرجەمی ئیهانەکارییەکان و گرێ دەروونییەکانی کۆلۆنیالیزم ڕزگار بکات، بەتایبەتی گرێی خۆبەکەمزانین و تەماهیکردن لەگەڵ داگیرکەران خۆیاندا.[2]

ئێستا با بگەڕێینەوە بۆ بۆچوونەکەی دۆنا هێکس. ئەگەر ئەو بۆچوونەی دۆنا هێکس لەسەر پەیوەندیی نێوان شکاندنی کەرامەت و لەتلەتبوونی ناوەکیی مرۆڤ ڕاست بێت، ئەوا دەکرێت مێژووی سەدەی بیستەمی کۆمەڵگەی ئێمە وەک مێژووی پارچەپارچەکردنێکی ناوەکیی مرۆڤی ئێمە و مێژووی لەتلەتکردنی دونیای ناوەوەی ئەو مرۆڤە وێنا بکەین، تا ڕادەی هەوڵدان بۆ سڕکردنی هەستکردنی ئەم مرۆڤە بە بوونی مرۆڤانەی خۆی، وەک بوونەوەرێکی

---

١_بڕوانە: Fanon,F. (١٩٨٢). Thewretcheodftheearth. New York: Grove

٢_ئەوەی من لێرەدا باسی دەکەم، تێزە سەرەکییەکەی فانۆنە، ئەم باسکردنە مانای باوەڕبوون بەو تێزە و بەرگریکردن لەو تێزە نییە. بەلام ئەم ڕوانینانەی فانۆن ڕۆڵێکی گرنگ لە بزووتنەوە دژەکۆلۆنیالییەکاندا دەبینێت و بەردەوام بەشێک بووە لە سایکۆلۆژیا و خەیاڵی سیاسیی بزووتنەوە دژەکۆلۆنیالییەکان.

یەکگرتوو و کامڵی پارچەپارچەنەبوو لە ڕووی دەروونی و ویژدانییەوە. مێژووی بێمافکردن و بێنرخکردنی بەردەوامی تاکەکەس و گروپەکانی کۆمەڵگەی ئێمە بە درێژاییی سەدەی بیستەم، مانای دەستدرێژیکردنێکی بەردەوام بۆ سەر مرۆڤبوونی ئەم مرۆڤە و ڕێگرتن لە هەستکردنی ئەم مرۆڤە بە یەکپارچەییی دەروونی و ڕەمزی و سیاسی و ئەخلاقیی خۆی. یەکگرتن بە مانای بوونی "جەوهەر"ێکی نەگۆڕ نا، بەڵکو بە مانای بوونی لانی کەمی هارمۆنیەتی ناوەکی و لانی کەمی هەستکردنی ناوەکیی ئەم مرۆڤە بە بەهای خۆی وەک مرۆڤێکی خاوەنکەرامەت. کردەی کۆلۆنیالیزم کردەی وێرانکردنی ناوەکیی مرۆڤە لە ڕێگەی پەلاماردانی دەرکەوتە جیاوازەکانی کەرامەتی مرۆڤەوە. وەک وتم، لە کتێبی "چەوساوەکانی سەرزەوی"دا، فرانز فانۆن پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ گریمان دەکات لەنێوان وێناکردنی نیشتیمان و زەوی لەلایەن میللەتە داگیرکراوەکانەوە و مەسەلەی کەرامەتەوە، چونکە نیشتیمان لەم ڕوانینەدا تەنها زەوییەک نییە سەرچاوەی نان و ئاو بێت بۆ مرۆڤ، بەڵکو سەرچاوەی کەرامەتیشە. بەم مانایە، کردەی داگیرکردن خۆی کردەی سەندنەوەی کەرامەتە لە مرۆڤەکان و چۆنێتیی مامەڵەکردنی ئەو مرۆڤانەشە وەک کەمتر لە مرۆڤ. لەم گۆشەنیگایەوە، دەکرێت هەموو شۆڕش و یاخیبوون و بەرگرییەکانی مرۆڤ لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، زۆربەی هەرە زۆری ئەدەبیاتی ئێمە لە سەدەی بیستەمدا، هەموو ئەو کردە مێژووییانەی ئەم مرۆڤە هۆشیارانە لەناو مێژووی خۆیدا پیادەی کردووە، وەک هەوڵدانێک بۆ دەرچوون لەو دۆخی کەرامەتشکاندن

و لەویشـەوە لەمرۆڤخسـتنە وێنـا بکەیـن، کـە لـە شـکاندن و بریندارکردنـی کەرامەتـەوە لەدایک دەبێت. لـەم گۆشـەنیگایەوە، مێژووی سـەدەی بیسـتەمی کۆمەڵگەی ئێمـە، مێژووی گەڕانـی مرۆڤـی ئـەو کۆمەڵگەیەیە بـەدوای وەدەسـتهێنانەوەی کەرامـەت و سـارێژکردنی برینەکانی کەرامەتێکی شـکاو و بریندارکراودا، مێژووی هەوڵدانیەتـی بـۆ وێناکـردن و دانپیانـان بـەم مرۆڤـەدا وەک کەسـێکی خاوەنکەرامـەت.

کردنـی کەرامـەت بـە یەکێـک لـە چەمکـە سـەرەکییەکانی دونیـای ئێمـە، تەنها بۆ دەسـتکاریکردنی شێوازی ئەو حوکمڕانی و دەسـەڵاتە نییـە کـە سـڵ لـە درێژەدان بـە شـکاندنی کەرامەتـی مرۆڤـی ئێمـە ناکاتـەوە، بەڵکـو هەوڵدانـە بـۆ پڕکردنـەوەی ئـەو پارچەپارچەبوونـە ئەخلاقـی و سیاسـی و ڕەمزییانـەش کـە مێژووی درێژی بێمافی و بێڕێزیـی داگیرکـەران لـە کۆمەڵگـەی ئێمـەدا دروسـتی کـردووە. بێگومـان دروسـتکردنی ئـەو دۆخـی پارچەپارچەبوونـە ناوەکییـە تەنهـا لـە ڕێگـەی بەکارهێنانـی توندوتیژییـەوە نەبـووە، تەنهـا لـە ڕێگـەی گرتـن و لێـدان و ڕاونـان و کوشـتن و بێماڵوحاڵکردنـەوە نەبووە، بەڵکو پرۆسـەی بریندارکردنێکـی دەروونیـی قـووڵ و بەردەوامیشـی لەپشـتەوە بـووە. کردەیەکـە بەردەوامیـی بێنرخکردنـی مـرۆڤ ئاراسـتەی کـردووە و میکانیزمـە سـەرەکییەکەشـی میکانیزمی لەمرۆڤخسـتن بـووە. چونکـە هەوڵـدان بـۆ شـکاندنی کەرامەتـی مـرۆڤ، تەنها لـەوەدا بەرجەسـتە نییـە ئێسـقانەکانی بشـکێنن و جەسـتەی پڕ بکـەن لـە بریـن، تەنهـا لـە ڕێگـەی بەکارهێنانـی توندوتیژییـەوە نییـە، بەڵکـو لـە ڕێگـەی کـردەی ڕێزنەگرتـن و تەماشـانەکردنی ئـەو کەسەشـەوەیە وەک بوونەوەرێکـی بەهـادار، وەک کەسـێک

بەردەوام پەراوێز بخرێت، بێنرخ بکرێت، ئیهانە و سووکایەتیی پێ بکرێت، ئازادییەکانی سنووردار بکرێت، بێماف بکرێت و وەک کەسێکی بچووک و گرگن و گەمژە و نەزان و جاهیل ناو بنرێت و مامەڵە بکرێت و هتد... هەموو ئەمانە وایان کردووە وێناکردنەکانی ئینسانی ئێمە بۆخۆی لە سەدەی بیستەمدا پڕ ببێت لە برینی ماددی و ڕەمزیی قووڵ، لە بریندارکردنی ئازادی و دادپەروەری و مافەکانیەوە بیگرە بۆ بریندارکردنی ویژدان و ڕۆحی، تا بە بریندارکردنی زمان و جلوبەرگ و بۆنە نیشتیمانی و دەستەجەمعییەکانی دەگات. بەم مانایە، سەدەی بیستەم سەدەی مامەڵەکردنی مرۆڤی ئێمەیە وەک بوونەوەرێکی بچووک، وەک کەسێکی بێنرخ و بێڕێز، وەک مرۆڤێکی پارچەپارچە و بریندار، وەک ناکەسێکی گەمژە و نەزان و جاهیل، چ لەلایەن داگیرکەرانەوە، چ لەلایەن ئەو نوخبە سیاسی و ڕۆشنبیرەشەوە کە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا خودێکی فووتێکراو و نارسیسیزمێکی ناتەندروست ئاراستەیان دەکات. نارسیزمێک، تەنها لەسەر خودئەڤینی و خۆخۆشویستنێکی پەڕگیر کار ناکات، بەڵکو لەسەر نەفیکردن و بێڕێزییەکی گەورەش بەرامبەر بە هەموو ئەوانی تر کار دەکات.

وەک وتم، لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا، ئەزموونی حوکمڕانیی کورد خۆی شتێکی ئەوتۆی لە پێکهاتی ئەم مێژووە پڕکەرامەتشکاندن و پڕبرینە نەگۆڕیوە. ئەزموونی دوای ڕزگاربوون، ئەزموونی هەڵوەشاندنەوەی گرێ دەروونی و برینە ویژدانی و ئیهانەکردنە ماددی و ڕەمزییەکانی مرۆڤی ئێمە نەبووە، بە پێچەوانەوە، ئەم ئەزموونە برین

و پارچەپارچەبوونی نوێی دروست کردووە برین و پارچەپارچەبوونی لا نەبردووە، ئیهانەکردنی نوێی داهێناوە، ئیهانە کۆنەکانی لا نەبردووە، مرۆڤی ئێمەی بچووک و گرگن کردووە، وزەیەکی پۆزەتیڤی تێدا دروست نەکردووە. ئەو برینانەی لە سەدەی بیستەمدا و لە پەیوەندی بە چەمکی کەرامەتەوە لە دونیای دەرەکی و ناوەکیی مرۆڤی ئێمەدا دروست کراون، لەمڕۆدا لەباتی سارێژکردنیان، هەم شێواز و دەرکەوتی تریان وەر گرتووە، هەم قووڵاییی نوێیان پێ بەخشراوە و هەم ڕەهەندی نوێیان تێدا کراوەتەوە. لە بیست ساڵی ڕابردوودا، کۆمەڵگەی ئێمە پڕ کراوە لە ململانێی توندوتیژ و فرەلایەن، لە ملشکاندنی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی، لە دروستکردنی مرۆڤی پلەدوو و پلەسێی بێماف، لە دابەشکردنێکی نائینسانی و نائەخلاقیی نرخاندنی جیاوازی مرۆڤەکان، لە پەلاماردانی ژیان و گوزەرانی چەندان هێزی کۆمەڵایەتی، لە کوشتنی ژنان و چەوساندنەوەی بەردەوامی مرۆڤە لاوازەکان، لە بێئومێدکردنێکی فرەلایەنی سەرجەمی هێزەکانی دونیای ئێمە، هتد... ئەوەشی ئەم گشتە وێرانە ئاراستە .دەکات و یاسای سەرەکیی ململانێکانی ناویەتی، یان لانی کەم ئەو بەها سەرەکییەیە کە ململانێکان ئاراستە دەکات، مەسەلەی شکاندنی کەرامەتی بەرامبەرە نەیار و لاواز و نادۆستەکانە، بریندارکردنی مرۆڤبوونی مرۆڤەکان و بێنرخکردنی بەهاکانیانە، بەخشینەوەی گرگنی و بچووکییە بەسەر هەموو ئەوانەدا کە لەگەڵ یاسا نائینسانییەکانی ئەو دونیایەدا ناتەبان. ئەم دۆخەش دۆخێکی دروستکراو و ڕێکخراو و پلانبۆدانراوە، مەبەست لێی دروستکردنی مرۆڤێکە، ڕوانینی

بۆ خۆی ڕوانینێک بێت پڕ لە بێنرخی و هەستکردن بە لاوازی و بە هیچی و بە بێتوانایی، پڕ بێت لە وێناکردنی خۆی وەک بوونەوەرێکی بچووک و بێهێز و پەراوێزی. ئەوەی لێرەدا زۆر بەقووڵی و بەفراوانی ئامادەیە، کارکردنە لەسەر ئەوەی مرۆڤەکان بەر لەوەی ڕێزیان بۆ یەکتری نەمێنێت، ڕێزیان بۆ خۆیان نەمێنێت، خۆیان بە کەسێک نەزانن شایستەی ڕێز و ماف بن، بە گەمژە و گەلحۆ و گەوج بکرێن، یان ئەوەیان تێدا بچێنرێت، کە گەمژە و جاهیل و لەوە نەزانتر و هەژارترن داوای ماف و داوای پاراستنی کەرامەتی خۆیان بکەن، پێیان ئاسایی بێت سووکایەتییان پێ بکرێت و نرخیان بۆ دانەنرێت، ئاسایی بێت وەک بوونەوەری بچووک مامەڵە بکرێن، زۆر کەمتر و نزمتر لە کەسوکاری ئەم بنەماڵە و خێزان و حیزب و گروپ و ناوچە، ببینرێن و مامەڵە بکرێن.

هەموو ئەو دەرکەوتانەی سەرەوە وا دەکات ناونان و باسکردن و نیشاندانی شێوازە جیاوازەکانی بێکەرامەتکردنی ئینسان و قسەکردن لەسەر دەرکەوتە جیاوازەکانی، نیشاندانی شێوازەکانی دروستکردن و بڵاوکردنەوەی بێکەرامەتی بە کۆمەڵگەدا، یەکێک بێت لە ئەرکە سەرەکییەکانی فیکری ڕەخنەیی و ئینسانی لە دونیای ئێمەدا. بەرگریکردن لە کەرامەت وەک کرۆکی سەرەکیی ژیان، وەک ئەو چوارچێوەیەی پێویستە مرۆڤەکان و گروپەکان لەگەڵ یەکدا کۆ بکاتەوە، هەم ئەرکێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییە، هەم ئەرکێکی فیکری و تیۆرییە، هەم ئەرکێکی ئەخلاقییە. ئەم وتارە هەنگاوێکی سەرەتاییە بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە، چونکە جەنگ بۆ پاراستنی کەرامەت لە دونیای ئێمەدا کۆتایی نەهاتووە.

## کەرامەت وەک چەمک

کەرامەت دەستەواژەیەکی ئینشایی نییە، وشەیەک نییە ساکار و بێقوولایی، بەتەنهاش بەشێک نییە لەو زمانە ڕۆژانەییەی مرۆڤ بۆ ئاخاوتن بەکاری دەهێنێت، کەرامەت چەمکێکی فیکریی گرنگی ناو دونیای مۆدێرنە و هێمایەکی ڕاستەوخۆشە بۆ ڕوانینێکی تایبەت بۆ مرۆڤ و ماف و دانپیانانی کۆمەلایەتی و ڕێزگرتن و نرخاندن. واتە کەرامەت بەشێکی بنەڕەتی و سەرەکییە لە ڕوانین و مرۆڤبینییەک، کە پێداگرتن لەسەر بەها و نرخی مرۆڤ وەک بەها و نرخێکی پارێزراو و دەستبۆنەبراو، ژێرخانە یاسایی و سیاسی و ئەخلاقییەکەی دەستنیشان دەکات. بە بۆچوونی من، کەرامەت بەر لە هەموو شتێک، چەمکێکی ئەخلاقییە، پێ لەسەر مامەڵەکردنی مرۆڤ وەک بەهایەکی گەورە دادەگرێت، کە نابێت لەژێر هیچ ناوێکدا لە نرخی کەم بکرێتەوە. بەلام ئەم ڕوانینە ئەخلاقییە چەندان دەرەنجامی کۆمەلایەتی و سیاسی و کولتووریی لێ دەکەوێتەوە، کە بەسەر یەکەوە شێوازێک لە کۆمەڵگە و شێوازێک لە حوکمڕانی و شێوازێک لە دەزگا و شێوازێک لە پەیوەندیی فرەجۆر لەنێوان ئەو لایەنانەدا گریمان دەکات. خاڵی سەرەکییش لە هەموو ئەمانەدا، ڕێزگرتنی مرۆڤە وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و خاوەنبەها و نرخێکی ناوەکیی گرنگ. کەرامەت هێماش بۆ گرنگیی دروستکردنی دونیایەک دەکات، مرۆڤ تیایدا

وەک بەهایەکی ناوەکیی گەورەی ناو ئەو دونیایە ببینرێت و مامەڵە بکرێت. بەکورتی، کەرامەت چەمکێکە پەیوەستە بە شوێن و جێ و پێگەی مرۆڤەوە لەناو کۆمەڵگەدا.[1] کەرامەت ڕوانگەیەکە، پێمان دەڵێت مرۆڤ لەکوێدا وەستاوە و چ نرخ و بەهایەکی لەناو کۆمەڵگە و لە پەیوەندیدا بە کەسەکانی ترەوە هەیە. چەمکی کەرامەت خۆی چەمکێکی پێوانەییە و بەرگری لە شوێن و جێ و نرخی یەکسانیی مرۆڤەکان لە کۆمەڵگەدا دەکات، ئەوەشی هەم پێوەری ئەم یەکسانییە و هەم ئەم یەکسانییەش دەسەپێنێت، خودی مرۆڤبوون خۆیەتی.

لەپشتی وێناکردنی مرۆڤەوە وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت، وێناکردنێکی تایبەتی کۆمەڵگە و وێناکردنێکی تایبەتی دەسەڵات و وێناکردنێکی تایبەتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیش ئامادەیە، کە لە دونیای مۆدێرندا خۆی لە وێناکردنی مرۆڤدا دەبینێتەوە وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و وەک کەسێک یەکسان بە کەسەکانی تر. وەک لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان کرد، وێنەی لەدایکبوونی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و بوونەوەرێکی یەکسان بەوانی تر، وێنەیەکی نوێیە و لەناو چوارچێوە یاسایی و سیاسی و مەعریفییەکانی دونیای مۆدێرندا دروست بووە. بەم مانایە، چەمکی کەرامەتیش بەو مانایانەی لە سەرەوە باسمان کرد، چەمکێکی سەرەکیی ناو دونیای مۆدێرنە و وێناکردنی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت بەشێکە

1_Waldron, Jeremy (2012). How law protects dignity. The Cambridge law journal, Vol 71, Issu 1, March 2012,p 201.

لەو وێناکردنە مۆدێرنە، کە لە دونیای مۆدێرندا بۆ مرۆڤ لەدایک دەبێت. بێگومان ئەمە مانای ئەوە نییە، دونیای بەر لە دروستبوونی دونیای مۆدێرن دونیایەک بووە چەمکی کەرامەت تیایدا ئامادە نەبووبێت، تێکستە دینییە کۆنەکان و ئەدەبیات و هەندێک ڕوانگەی ئەخلاقیی کۆمەڵگەکانی بەر لە دونیای مۆدێرن، بێبەش نین لە چەمکی کەرامەت، بەڵام ئەوەی شوێنی سەرنجە، ئەوەیە کە چەمکی کەرامەت لە دونیای کۆندا چەمکێک نەبووە گرێ درابێت بە مرۆڤبوونەوە وەک مرۆڤ، بەڵکو گرێدراو بووە بە کۆمەڵێک پلەوپایە و مەقامی کۆمەڵایەتیی تایبەتەوە. ئەوانەی سەر بە چین و توێژەکانی سەرەوەی کۆمەڵگە بوون، خاوەنی کەرامەت و ئەوانەی لە خوارەوەی کۆمەڵگەدا بوون، بێکەرامەت یان خاوەنی کەرامەتی کەمتر بوون، ئەوانەشی کە بێکەرامەت یان کەرامەتیان کەمتر بووە، ئیتر هەم مافی کەمتر و هەم نرخی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی کەمتریان هەبووە.[1] تەنها لەناو چوارچێوەکانی دونیای مۆدێرندا چەمکی کەرامەت دەبێت بە چەمکێکی دیموکراس و کراوە بە ڕووی هەموو مرۆڤەکاندا.

مێژووی کەرامەت لە دونیای مۆدێرندا مێژووی بەئەبستراکتبوونی چەمکی کەرامەتە، واتە مێژووی دابڕانیەتی لە پێگە چینایەتی و کۆمەڵایەتی و دینی و فەرهەنگییە تایبەتەکان و بەستنەوەیەتی بە چەمکی مرۆڤەوە

1_Sulmasy, F. P. (2007). Human dignity and human worth. In J. Malps, & N. Lickiss (Eds.), Perspectives on human dignity: Aconversation (pp. 9-18). Dorderecht, The Netherlands: Springer.

وەک چەمکێکی ئەبستراکت، بە مرۆڤەوە وەک مرۆڤ، نەک بە مرۆڤەوە وەک ئەندامی چین و توێژ و دین و گروپە کۆمەڵایەتی و کولتوورییە تایبەتەکان. ئەگەرچی بڕێکی زۆر لە دینەکان مرۆڤ وەک نوێنەری خودا، یان وەک دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی خودا لەسەر زەوی وێنا دەکەن، بەم مانایەش هەموو مرۆڤێک دەکەنە خاوەنی ڕەهەندێکی خودایی، کە قابیلی ئیهانەکردن و سووکایەتیپێکردن نییە، بەڵام ئەو خوداییبوونە ناوەکییە هەمیشە لەناو مێژوو و لەناو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا بە شێوازی جیاواز دەر کەوتووە، یان زۆر جار هەر دەر نەکەوتووە. ئەم خودایە تەنها خودای ناو ئەم یان ئەو دین بووە بەتەنها، یان خودای ناو ئەم یان ئەو گروپی ئیماندار بووە بەتەنها، کەسانی بێدین و یان کەسانی خاوەن دینیتر هەڵگری ئەم ڕەهەندە خودایییە نەبوون. بە مانایەکی دیکە، کەرامەتی مرۆڤ لە دیدە دینییەکەدا گرێ دراوە بە باوەڕبوونی مرۆڤەوە بەم یان بەو خودا و ئینتیمای بۆ ئەم یان ئەو دین، لە دەرەوەی ئەو باوەڕ و ئینتیمایەدا، مرۆڤ هەڵگری کەرامەت نەبووە، یان کەرامەتێکی نوقسان و بیماری هەبووە، تەواو نایەکسان لەگەڵ کەرامەتی مرۆڤە باوەڕدارەکاندا. بۆیە بەدرێژاییی قۆناغی دینەکان، مەسەلەی کەرامەت مەسەلەیەک نەبووە گرێدراو بە بوونی مرۆڤەوە وەک مرۆڤ، مرۆڤێک دینی هەبێت یان نەیبێت، باوەڕی بە خودایەک لە خوداکان هەبێت یان بێ خودا بەناو بووندا تێپەڕێت و لەپاڵ مرۆڤەکانی تر و لەناو کۆمەڵگەدا بژی.

لە دونیای هاوچەرخدا، چەمکی کەرامەت یەکێکە لە

چەمکە سەرەکییەکانی بەرگریکردن لە مرۆڤ لەبەرامبەر سەرجەمی ئەو پەیوەندی و دەزگا و شێوازانەی دەسەڵات و هێزانەدا کە لەسەر بێنرخکردن و چەوساندنەوە و گرگنکردنی مرۆڤ کار دەکەن و چەندان ڕووبەری کۆمەڵایەتی و ڕەمزیی توندوتیژ دروست دەکەن، کە تیایاندا شێوازی جیاوازی مرۆڤبوون و شێوازی جیاوازی لەناو-دونیادا-بوون و شێوازی جیاوازی شووناس، بێدەنگ و پەراوێز، یان بەتەواوی نەفی دەکەن. چەمکی کەرامەت، چەمکێکە تەواو ناکۆک و دژ بە هەموو ئەو هەڵسوکەوت و وێناکردنانەی کە لەسەر بێنرخکردن یان سوکایەتیکردن، ئیهانەکردن یان بریندارکردنی مرۆڤبوونی مرۆڤ کار دەکەن. هەندێک ئەم چەمکە فراوانتر دەکەنەوە و باس لە بوونی کەرامەت تەنها لەلای مرۆڤ ناکەن، بەڵکو باس لە بوونی کەرامەت لای هەموو بوونەوەرێکی زیندوو دەکەن، هەموو ئەو شتانەی ژیانیان تێدایە، پێویستیان بەوەیە ڕێز بۆ ئەو ژیانە دابنرێت کە تیایاندایە، واتە ڕێزی کەرامەتیان بگیرێت.[1]

ئەگەر چەمکی مرۆڤ خۆی چەمکێکی نۆرماتیڤی بێت، واتە چەمکێک بێت پێوانەیی و ناوەڕۆکێکی پۆزەتیڤی هەبێت، ئەوا چەمکی کەرامەت مانای بەرگریکردن لەو مانا پۆزەتیڤەی مرۆڤ و سەلماندنی ئەو مانا پێوانەیییەی مرۆڤبوون. ئەم مانا پێوانەیی و پۆزەتیڤەش لە زمانی ڕۆژانەدا کاتێک دەر دەکەوێت، کە مرۆڤ لەلایەن کەسێک

---

1_Fischer, Johannes (2010). “The social recognition of human dignity.” ESKA 1 Journal International de Bioethique. Vol. 21, 3 PP. 45.

یـان لایەنێکـەوە پەلامـار بدرێـت و سـووکایەتیی پـێ بکرێـت، یاخـود ئـازار بدرێـت و بچەوسـێنرێتەوە، ئـەوکات گوێمـان لـە کاردانـەوەی لـەم بابەتـە دەبێـت: "ئـەو کەسـە مرۆڤـە و وەک مرۆڤیش شایستەی ئەو جۆرە مامەڵەیە نییـە،" "نابێت مـرۆڤ بـەو جـۆرە مامەڵە بکرێت،" "ئـەو جۆرە هەڵسوکەوتانە قابیلی مـرۆڤ نیـن." لەپشتی بەکارهێنانی چەمکی مـرۆڤ لـەو دۆخانـەدا، وێناکـردن و مانابەخشـینێک بـە مـرۆڤ لـە ئارادایـە، کە لەسـەر ڕێزگرتـن و نرخاندنـی پۆزەتیڤی مرۆڤبـوون بەنـدە. مرۆڤبـوون خۆشـی وەک بەهایەکـی ئەبسـتراکت دەبینرێـت و نابەسـترێتەوە بـە ئەندامبـوون لـەم یـان لـەو چیـن و توێـژ و گرووپـی کۆمەڵایەتیـدا. چەمکـی کەرامـەت چەمکـی بەرگریکـردن و سـەلماندنی ئـەم ڕووە پۆزەتیڤـەی مـرۆڤ و مرۆڤبوونـە. بەکورتـی، لەنـاو مانـا پێوانەییەکانـی چەمکـی مـرۆڤ خۆیـدا، بیرۆکـەی ڕێزگرتنـی مـرۆڤ و داننـان بـە مرۆڤـدا وەک بوونەوەرێکـی بەهـادار و ئەبسـتراکت ئامادەیـە. لـە زمانـی ڕۆژانـەدا کـە دەوترێـت فـلان یـان فیسـار کـەس کەرامەتـی شـکاوە، مانـای ئەوەیـە هێرشـێکی قـووڵ کراوەتـە سـەر ئینسـانبوونی ئـەو کەسـە، وەک بوونەوەرێکـی بێنـرخ و بێبەهـا مامەڵـە کـراوە، گەمەیەکـی ناشـیرین بـە ئینسـانبوونی کـراوە و بچـووک و گرگـن و بێنـرخ کـراوە.

وەک وتـم، بەخشـینی ئـەم مانـا ئەبسـتراکتە بـە کەرامـەت و نیشـاندانی وەک بەشـێک لـە مرۆڤبوونـی مـرۆڤ دوا دەکەوێـت بـۆ سـەردەمی لەدایکبوونـی مۆدێرنـە، ڕەنگـە فەیلەسـووفی ئەڵمانـی: ئیمانوێـل کانـت، یەکـەم فەیلەسـووف بێـت ئـەم چەمکـەی بـە شـێوەیەکی ڕوون بـاس کردبێـت و وەک بەشـێک

لە فەلسەفە ئەخلاقییەکەی و وەک بەشێک لە ڕوانینی گشتیی خۆی بۆ ئینسان وەک بەهایەکی ئەبستراکت و گەردوونی نیشان دابێت. لە ڕاستیدا وەک شارەزایانی فیکری کانت دەڵێن، چەمکی کەرامەت چەمکێکی بنەڕەتی و هەرە سەرەکیی ناو فەلسەفە ئەخلاقییەکەی ئەم فەیلەسووفەیە. لای کانت، هەموو مرۆڤێک خاوەنی کەرامەتە، هەموو مرۆڤێک کە بتوانێت ئازاد بێت و خاوەنی عەقڵ و توانای بیرکردنەوە بێت، بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەتە.[1] مادامەکیش مرۆڤ مرۆڤە، کەسێکە خاوەنی عەقڵە و توانای ئازادبوونی هەیە، بۆیە ئەو یاسا ئەخلاقییە بنەڕەتییە دەیگرێتەوە کە کانت بەم شێوەیە دای دەڕێژێت، یاساکەی کانت دەڵێت: "بە شێوەیەک هەڵسوکەوت بکەیت، وەک ئەوەی هەموو مرۆڤایەتی لە کەسایەتیی خۆتدا یان لە کەسایەتیی یەکێکی تردا بەکار دەهێنیت، هەروەها لە هەمان کاتدا مرۆڤ وەک ئامانج ببینیت و هەرگیزیش وەک ئامرازێک بەکاری نەهێنیت." بەم مانایە، مرۆڤ پێویستە هەمیشە وەک ئامانج و غایەت ببینرێت، نەک وەک ئامراز بۆ بەدەستهێنانی ویست و خواستی تایبەت. کەرامەت لە شێوە "کانت"ییەکەدا، مانای بیناکردنی مرۆڤ وەک بەشێک لە مرۆڤایەتییەکی گەورەتر، مرۆڤێکی ئەبستراکت، هەروەها مانای مامەڵەنەکردنی مرۆڤ وەک ئامراز و شتومەک، ئەمە جگە لە مامەڵەکردنی بەو شێوەیەی کە مرۆڤ مامەڵەی خۆی دەکات. کانت لەم ئاستەدا دەنووسێت: "مرۆڤ خاوەنی کەرامەتە (واتە خاوەنی

1_Giesinger, Johannes (2012). Kant on dignity and education. Educational Theory Vol 62, nr 6, p 609.

نرخێکی ڕەهای ناوەکییە) کە وا دەکات هەموو بوونەوەرێکی عەقڵانی لە دونیادا ڕێزی بگرێت."[1] بەم مانایە، کەرامەت شتێک نییە مرۆڤ نەیبێت و پێویستە بەدەستی بهێنێت یان کۆی بکاتەوە، بەڵکو پێدراوێکی سروشتییە، بەشێکە لە مرۆڤبوونی مرۆڤ، لەناو هەموو منداڵێکدا چێنراوە و لەگەڵ لەدایکبوونیدا بە کەرامەتەوە لەدایک دەبێت. ئەم دۆخە وا دەکات پاراستنی کەرامەت پێویستی بە ڕێزگرتنی مرۆڤ هەبێت وەک مرۆڤ. بە بۆچوونی کانت، ئەو بڕە سەرەتایی و بنەڕەتییە لە کەرامەت کە لەناو هەموو منداڵێکی بچووکدا ئامادەیە، ئەو کەرامەتەی کە منداڵێک پێیەوە لەدایک دەبێت، پێویستە زەمینە و هەلومەرجی بۆ بخولقێنرێت بۆ ئەوەی بتوانێت تەنها لەناو تاکەکەس خۆیدا، بەڵکو لەناو دونیادا وەدی بهێنرێت و لەناو خۆشیدا بە شێوەیەکی بەهێزتر بەرجەستەی بکات. لای کانت، ئینسان تەنها لە ڕێگەی وەدیهێنانی کەرامەتەوە دەتوانێت ببێت بە بوونەوەرێکی ئەخلاقیی سەربەخۆ، مادامەکیش کەرامەت شتێکە بە شێوەیەکی سروشتی لەناو مرۆڤ خۆیدا ئامادەیە، کاری ژینگە دەرەکییەکانی مرۆڤ ئەوەیە یارمەتیی مرۆڤەکان بدەن لەو بوونە سروشتییەی کەرامەت ئاگادار بکرێنەوە. مرۆڤ لێرەدا هەم هەستی ڕێزگرتنی خۆی بۆ خۆی لا بەهێز و گەورە دەبێت، هەم هەست بە ڕێزگرتنی ئەوانی تریش، بەم جۆرە کەرامەت دەتوانێت ببێت بەو چوارچێوە گشتییە کە کەسەکان بە یەکدییەوە دەبەستێتەوە و کۆ دەکاتەوە.

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦١٠.

## کەرامەت وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و ئینسانی

وەک باسمان کرد، چەمکی کەرامەت ئاماژە بۆ پلەوپایە و نرخاندنێکی بەرز و پۆزەتیڤیی مرۆڤ وەک مرۆڤ دەکات، هێما بۆ پلەوپایەیەکی ئینسانی دەکات، کە شوێن و جێی شیاوی هەموو مرۆڤەکانە وەک مرۆڤ، نرخاندن و ڕێزێک بۆ مرۆڤبوونی مرۆڤ پێشنیار دەکات، کە وا بکات کەس نەتوانێت سووکایەتی بە مرۆڤبوونی مرۆڤەکان بکات. هەموو ئەمانەش بەبێ گوێدانە شووناس و پێگە و کولتوور و شێوەژیانی ئەو مرۆڤە. لەم ڕوانینەدا بریندارکردنی کەرامەت مایەی لە نرخ و پلەوپایە کەمکردنەوەی مرۆڤە وەک مرۆڤ. ئەوەی لە مەسەلەی برنیدارکردنی کەرامەتدا گرنگە ئاشکرا بێت، ئەوەیە کە ئەم بریندارکردنە، ئەم کەمکردنەوەی پلەوپایەی مرۆڤ وەک مرۆڤ، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، نەک سروشتی، پەیوەندیی بە شێوازی ڕێکخستنی کۆمەڵگە و شێوازی ڕێکخستنی پەیوەندییەکان و پەیوەندیی بە دەزگاکان و یاساکانەوە هەیە. شتێک بۆ ئەوەی وەک کردەی بریندارکردنی کەرامەت ببینرێت، پێویستە لەلایەن مرۆڤەوە ڕوو بدات، نەک بۆ نموونە، دەرەنجامی کارەساتێکی سروشتی، یان هەر کارەساتێکی تری دەرەوەی کردەی مرۆڤانە بێت. لەپشتی بریندارکردنی کەرامەتەوە، جۆرێک لە بێنرخکردن و ناچارکردنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییش هەیە، ئەو کەسەی کەرامەتی دەشکێندرێت، کەرامەتشکاندنەکەی

دەرەنجامـی فشـار و هێرش و هەڵسوکەوتی کەسانێکی تـرە و پابەسـتە بـە کۆمەڵێـک پەیوەندیـی هێـز و دەسـەلاتەوە کـە لـەو سـاتەدا بالادەسـتە. بریندارکردنـی کەرامـەت مانـای ئـەوە نییـە مـرۆڤ ژیانـی خـۆی لـە دۆخـی هەژاریـی و نەداریـی و نەبوونیـدا ببینێتـەوە، بەڵکـو مانـای ئەوەیـە مـرۆڤ هـەژار و نـەدار و نەبـوو کرابێت.[1] هـەژاری بـە شـێوەیەکی ئۆتۆماتیکـی هێرشـکردنە سـەر کەرامەتـی مـرۆڤ نییـە، بـەلام هەژارخسـتن لـە هەمـوو فۆرمەکانیـدا، هێرشـکردنە سـەر کەرامەتـە. بۆیـە پێشـێلکردنی کەرامـەت کەمتـر ی بـەو هەلومەرجـە بابەتییـەوە هەیـە کـە مرۆڤـەکان خۆیانـی لەنـاودا ئەدۆزنـەوە و زیاتـر پەیوەندیـی بـە جـۆر و شـێوازی پەیوەندییـە کۆمەلایەتییەکانـەوە هەیـە. بریندارکردنـی کەرامـەت، پەیوەندیـی بـە کۆمەڵێـک پرۆسێسـی کۆمەلایەتـی و سیاسـی و فەرهەنگییـەوە هەیـە، کـە تیایـدا هەندێـک مـرۆڤ وەک بوونـەوەری کەمتـر و سـووکتر مامەڵـە بکرێـن، هەروەهـا پەیوەندیـی بـە کارلێکردنـی مرۆڤەکانـەوە لەسـەر یەکتـر و بـە دروسـتکردنی کۆمەڵێـک بوونیـاد و ڕووبـەری تایبەتیـی دروسـتکراوی نـاو کۆمەڵگـەوە هەیـە، هەروەهـا پەیوەندیـی بـە ڕێکخسـتنی شـوێن و پێگـەی تاکەکەسـەکانەوە لەنـاو ئـەو بوونیادانـەدا هەیـە.[2] بـەم مانایـە، بریندارکردنـی کەرامەتـی ئینسـان کەمتر پەیوەندیـی بـە دۆخـی نەبوونـی، یـان نائامادەگیـی هەندێـک پێشـمەرجی تایبەتـەوە

1_Forst, Rainer (2011). 'The Grounds of Critique: on the Concept of Human Dignity in Social Orders of Justification'. Normative Orders Working Paper. Institut für Politikwissenschaft, Frankfurt am Main. P, 4.

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٥.

هەیە، کە بتوانێت ژیانێکی باش یان ماقوڵ بۆ مرۆڤ دابین بکات، بەڵکو پەیوەندیی بە دەستدرێژیکردنێکی هۆشیارانە و مەبەستدارەوە هەیە بۆ سەر شوێن و جێی ئەخلاقی و ماددیی مرۆڤ لەناو هەلومەرجی ژیان لەناو کۆمەڵگەدا، بەبێ ئەوەی هیچ هۆکار و پاسادانێکی ماقووڵ و عەقڵانی بۆ ئەنجامدانی ئەو دەستدرێژیکردنانە لە ئارادا بێت. بریندارکردنی کەرامەتی مرۆڤ، مانای دابەزاندنی مەقامی مرۆڤ بەبێ بوونی هیچ هۆکارێکی ڕاستەقینە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. کەرامەت لێرەدا مانای ئەوەیە، مرۆڤ بۆ هیچ هۆکارێک لە هۆکارەکان وەک مرۆڤێکی کەمتر لەوانی تر و بێماف، یان پەراوێزخراو یان بێبەشکراو لە پێشمەرجە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی ژیانی ئینسانی و کۆمەڵایەتی مامەڵە نەکرێت. هیچ هێز و دەسەڵاتێک نەتوانێت بەبێ بوونی بەهانە و هۆکاری ڕاستەقینە و پاسایی گومانهەڵنەگر، دەست بخاتە ناو ژیانی کەسەکان و باڵادەست بێت بەسەریاندا.

لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسی ئەوەم کرد کە وێناکردنی مرۆڤەکان وەک کەسانی خاوەنکەرامەتی یەکسان دیاردەیەکە سەر بە دونیای مۆدێرنە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە دونیای مۆدێرن بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دونیای ڕێزگرتنی کەرامەتی مرۆڤەکانە. دونیای مۆدێرن پڕە لە شێوازی جیاوازی هێرش و پەلاماردان بۆ سەر کەرامەتی مرۆڤ و پەراوێزخستن و وێرانکردنیشی. سووکایەتیکردن بە مرۆڤ و بریندارکردنی کەرامەتی بەشێکە لە زۆرێک لە ڕووداوە گەورە و بچووکەکانی ناو دونیای ئەمڕۆ. ئەمڕۆکە بە شێوەیەکی ڕۆژانە و لە زیاد لە شوێنێک و لە زیاد لە

ئاستێکدا سووکایەتی بە ژمارەیەکی زۆری مرۆڤەکانی سەر ئەم ئەستێرەیە دەکرێت. بەڵام هەموو ئەمانە ئەو ڕاستییە سادەیە ناشارنەوە کە داواکردنی پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ وەک مرۆڤ، وێناکردنی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت، داواکاری و وێناکردنێکی تازەن و لەپشتیانەوە جۆرێک لە پێداگریی ئەخلاقی و سیاسی ئامادەیە، کە دروستکردنی شێوازێکی تایبەتیی دەوڵەت و حوکمڕانی و شێوازێکی تایبەتی کۆمەڵگە گریمان دەکەن. لە دونیای ئەمڕۆدا، ئەو شێوازە لە دەوڵەت "دەوڵەتی یاسا" و ئەو کۆمەڵگەیەش کۆمەڵگەیەکی لیبراڵە.

## کەرامەت و نرخ

کانت کەرامەت و نرخ لەبەرامبەر یەکتریدا ڕادەگرێت و دەڵێت لە دونیای حەز و ئارەزوو و هیواکاندا شتەکان یان ئەوەتا نرخیان هەیە، یان ئەوەتا کەرامەتیان هەیە. کە وتمان فلان شت یان فیسار شت نرخێکی تایبەتی هەیە، ئەمە مانای ئەوەیە ئەو شتانە دەکرێت بە چەندان شتی تر بگۆڕدرێنەوە کە هەمان نرخیان هەبێت. واتە بەرامبەر بە نرخ، نرخ هەیە، بەڵام کە وتمان فلان شت کەرامەتی هەیە، ئەمە مانای ئەوەیە ئەو شتە لە سەرووی هەموو نرخێکەوەیە، ناتوانرێت دەستنیشان بکرێت بایی چەندە، چونکە هیچ شتێک ناتوانێت نرخی کەرامەت دیاری بکات. بۆیە لای کانت، لەبەرامبەر کەرامەتدا نرخ نییە، بەڵکو ئینسانبوونی ئینسان هەیە، ئینسان

وەک خاوەنی عەقڵ و بیرکردنەوە بوونی هەیە.[1] شتێک کە کەرامەتی هەبوو، مانای ئەوەیە ناکرێت بە هیچ شتێکی دیکە بگۆڕدرێتەوە، یان هیچ شتێکی دیکە لە شوێنی ئەو دابنرێت. شتی خاوەنکەرامەت، شتێکە نرخەکەی لەناو خۆیدایە و هیچ شتێک ناتوانێت ئەو نرخە بهێنێتە دەرەوە، لێی کەم بکات یان تێچوون و بەهاکەی دەستنیشان بکات. بەم مانایەش، کەرامەت جارێکی دیکە بە شێوەیەکی توند و ڕاستەوخۆ بەستراوەتەوە بە فیکرەی مرۆڤبوون خۆیەوە، ئینسان مادام ئینسانە، کەواتە خاوەنی کەرامەتە، کەرامەتیش تەنها بە ڕێزگرتن و هەبوونی ماف و نرخاندنی مرۆڤبوونی مرۆڤ دەپێورێت، نەک بە شتی دیکە. لە ڕاستیدا ئینسان بۆیە ئینسانە، چونکە خاوەنی کەرامەتە، کەرامەت شتێکە، بەقووڵی بە بوونی ئینسانەوە وەک ئینسان بەستراوەتەوە.

کە دەوترێت کەرامەت شتێکە گرێ دراوە بە بوونی ئینسان خۆیەوە وەک ئینسان، کەرامەت لێرەدا پەیوەندیی نییە بە شوێن و پێگەی کۆمەڵایەتییەوە، پەیوەندیی نییە بەوەوە ئینسان چ کارەیە و چۆن دەژی، دینی هەیە یان نا، خەڵکی لادێیە یان شار، دەرچووی زانکۆیە یان دەرچووی خوێندنی سەرەتاییە، سیاسییە یان ڕۆشنبیر، بێکارە یان کاردارە. لە گۆشەنیگای کەرامەتەوە، هەموو ئەو جۆرە کەسانە مرۆڤن و کەرامەتیان بە مرۆڤبوونیانەوە گرێ دراوە. ئەوەی کەسێک بەڕێکەوت لەم یان لەو خێزان و لەم یان لەو بنەماڵە و لەم

1_McCurdden, C (2008). "Human dignity and jiudical intrepretation of human rights." The European Journal of International Law 19(4). P. 659

یان لەو چین و توێژی کۆمەڵایەتیدا لەدایک بووە، مانای ئەوە نییە ئەو کەسە کەرامەتی لە کەسێکی دیکە زیاترە. مرۆڤەکان وەک مرۆڤ، هەموویان بە هەمان بڕ خاوەنی کەرامەتن، کە لەدایک دەبن بە هەمان بڕ لە کەرامەتەوە لەدایک دەبن.

ئەم وێناکردنە بۆ کەرامەت، وێناکردنێک نییە دەرەنجامێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی نەبێت، بە پێچەوانەوە، دەرنجامەکانی لەو ئاستانەدا گەورە و فرەلایەنن. کە دەوترێت ئینسان بەوەی ئینسانە خاوەنی کەرامەتە، ئەمە مانای ئەوەیە ئەو دونیایەی کە ئینسانی تێدا دەژی، دەبێت ڕێزی ئەم پێدراوە وجودی و ئەخلاقی و شارستانییە بگرێت، دەبێت ئەو دونیایە وا ڕێک بخرێت، هیچ کەسێک نەتوانێت تیایدا کەرامەتی ئەوی تر بریندار بکات، توانا و ئەگەری وەدیهێنانی کەرامەتی خۆی بە مرۆڤ ببەخشێت، وا بکات هەم خۆی وەک بوونەوەرێکی خاوەن ڕێز ببینێت و هەم دەوروبەرەکەشی ئەو ڕوانینەیان بۆی هەبێت. لەپشتی ئەم دیدەوە بۆ کەرامەت، کۆمەڵێک هەندەسەی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئامادەیە، پرۆژەی تایبەت بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئامادەیە، کە بنەما سەرەکییەکانیان لەسەر ڕێزگرتن لە مرۆڤبوونی مرۆڤ دروست بووە. یەکێک لە تێکستە گرنگەکانی دونیای ئەمڕۆ، بریتییە لە جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ، کە پەیوەندییەکی پتەوی بە مەسەلەی کەرامەتی مرۆڤەوە هەیە. چەندان نووسەر و شارەزای بواری لێکۆڵینەوەی یاسایی باس لەوە دەکەن، کە پاراستنی کەرامەت تەنها مافێک لە مافەکانی ناو جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ نییە، بەڵکو ژێرخانە فیکری

و ئەخلاقییەکەی سەرجەمی مافەکانی تری ناو جارنامەکەیە.[1] بەم مانایە، لە ڕووی تیۆرییەوە، مەسەلەی ڕێزگرتن لە کەرامەت و پاراستنی لەپشتی بەشێکی زۆری دەستوور و یاساکانی ئەو کۆمەڵگەیانەوەیە کە لە دونیای مۆدێرندا ڕێزی مافەکانی مرۆڤ دەگرن. لە ڕاستیدا لە هەرشوێنێکدا باس لە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و مافەکانی، باس لە مەسەلەی پاراستن و ڕێزگرتنی ئەو مافانە کرا، لەوێدا چەمکی کەرامەت بەشێکە لەو زمانەی بەکار دێت بۆ قسەکردن و بەخورد لەسەر ئەم بابەتانە.

## مرۆڤ وەک بوونەوەری بێکەرامەت

وەک ئاماژەمان پێ کرد لەو لێکدانەوە "کانتی"یانەی سەرەوەدا، چەمکی کەرامەت بەشێکە لە دونیابینییەکی نوێ، کە ژێرخانە فیکری و ئەخلاقییەکەی بینینی مرۆڤەکانە وەک بوونەوەری یەکسان، یەکسان لە کەرامەت و نرخ و بەها و مافدا. بەڵام ئەم دیدە ڕۆژگارێکی هێجگار درێژە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ئامادە نەبووە. لێرەدا نامەوێت مێژوو و شێوازی نایەکسانییەکانی نێوان مرۆڤ بگێڕمەوە، بەڵام با جارێکی دیکەش سەرنجێکی خێرا لە ڕوانینی یەکێک لە فەیلەسووفە هەرە گەورەکانی دونیای کۆن بدەین و بزانین ئەم جارەیان لە پەیوەندیدا بە چەمکی کەرامەتەوە، چ جۆرە

1_Waldron, Jeremy (2012). "How law protects dignity." The Cambridge law journal, Vol 71, Issu 1, March 2012, pp 201.

ڕوانینێکی بۆ ئەو مرۆڤانە هەبووە کە لە کۆمەڵگەی یۆنانیدا ئامادە بوون، مەبەستم لەو فەیلەسووفەش ئەرستۆیە. (داوای لێبوردن لە خوێنەر دەکەم، کە دەشێت بەشێک لەم پەرەگرافە دووبارەکردنەوەی هەندێک بۆچوون بێت کە لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا نیشان دران).

بە بەراورد بە ئەفلاتوون، ئەرستۆ وەک فەیلەسووفێکی هێمنتر و عەقڵانیتر ناسراوە، کەمتر تەماشای ئاسمان و زیاتر تەماشای زەویی کردووە، لەباتی سەیرکردنی خوداکان و ئایدیالییە ئاسمانییەکانیش، تەماشای مرۆڤ و ژینگە و دەزگا و دەستوور و پەیوەندییەکانی مرۆڤی لەگەڵ کەسەکانی دەوروبەریدا کردووە، بەتایبەتی لە کتێبی "سیاسەت"دا، کە سەرچاوەی سەرەکیی ڕوانینەکانی ئەرستۆیە بۆ کۆمەڵگە و دەسەڵاتداریتی و شێوازی ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا. ئەم خۆخەریککردنەی ئەرستۆ بە ژیانی مرۆڤەوە لەسەر زەوی و بە کێشەی ڕێکخستنی ژیانی هاوبەش و گشتییەوە، وا دەکات یەکەم داهێنەری ڕاستەقینەی زانستە سیاسییەکان بێت لە مێژووی فیکردا. ئەرستۆ نووسینێکی زۆری لەسەر مەسەلەی هاوولاتیبوون و بەشداربوون لە کاروبار و بەڕێوەبردنی ژیانی گشتیی کۆمەڵگەکاندا هەیە، ئەوەی من دەمەوێت لێرەدا کەمەکێک لەسەری بوەستم، لە پەیوەندیدا بە چەمکی کەرامەتەوە، مەسەلەی ڕوانینی ئەرستۆیە بۆ پێگەی مرۆڤەکان لە کۆمەڵگەدا، بەتایبەتی ڕوانینی بۆ بوونی مرۆڤی کۆیلە و بوونی سیستمی کۆیلایەتییە لە کۆمەڵگەکەی خۆیدا. ئەوانەی شارەزاییەکی سەرەتاییان لەم ڕەهەندە تایبەتەی فیکری

ئەم فەیلەسووفە گەورەیەی دونیای کۆن هەبێت، دەزانن ئەرستۆ چ بەرگرییەکی سەرسەخت لە سیستمی کۆیلایەتی و لە کۆیلەکردنی ئینسان دەکات و چۆن وەک دیاردەیەکی "سروشتی" و "شەرعی" دەیبینێت و مامەڵە دەکات. بۆ وردەکاریی زیاتر، خوێنەر دەتوانێت بۆ بەشی یەکەمی ئەم کتێبە بگەڕێتەوە.

دەستەواژەی "سروشت" یەکێکە لە دەستەواژە سەرەکییەکانی ناو فیکری ئەرستۆ، لای ئەم فەیلەسووفە یۆنانییە، هەموو شتێک لە گەردووندا سروشتێکی تایبەت و نەگۆڕی هەیە و ئەو شتانەش بەپێی ئاکارەکانی ئەو سروشتە تایبەتە دەژین و دەجووڵێن و کار دەکەن. هەموو گۆڕانکارییەکیش لە مێژووی مرۆڤدا گۆڕانە بەرەو گەیشتن و وەدیهێنانی خواست و ئاکارەکانی ئەو سروشتە. ئەگەر گۆڕانکاری لای ئەفلاتوون مانای دوورکەوتنەوەی بەردەوام بێت لەو "جەوهەر" و "سروشتە" نموونەیی و ئاسمانییانەی لە دونیای ئایدیالدا ئامادەن، واتە گۆڕان لە "جەوهەر"دا کردەیەکی خراپ و نێگەتیڤ بێت، ڕووی لە سەروەرکردنی "کۆپییەکان" بێت بەسەر نوسخە "ڕەسەن" و "بنەڕەتی"یەکەدا، چونکە "گۆڕانی زیاتر" مانای "دوورکەوتنەوەی زیاتر" لە سروشتی ئاسمانییانە و ئایدیالانەی شتەکان، ئەوا گۆڕان لای ئەرستۆ تەواو پێچەوانەی ئەم دیدە ئەفلاتوونییەیە و بە مانای جووڵەی بەردەوامی شتەکان دێت بە ئاراستەی گەیشتن بە سروشتی ڕاستەقینەی خۆیان کە لە قووڵایی هەر شتێکدا ئامادەیە، هەروەها جووڵەیە بە ئاراستەی وەدیهێنانی ئەو سروشتە

کە مرۆڤ و دەزگاکان و شتەکان هەیانە.[1] بە مانایەکی تر، ئەگەر گۆڕان لای ئەفلاتوون دوورکەوتنەوەی هەرچی زیاتری شتەکان و دیاردەکان بێت لە سروشتی ڕاستەقینەی خۆیان، ئەوا گۆڕان لای ئەرستۆ جووڵەی شتەکان و دیاردەکانە بەرەو گەیشتن بەو سروشتە و وەدیهێنان و بەرجەستەکردنی توانا و خواستەکانی ئەو سروشتە. لە پەیوەندیدا بە مرۆڤەوە، ئەرستۆ پێی وایە، باشترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە بەپێی سروشتی ڕەسەنی خۆی دەژی و لەو سروشتە ڕەسەنە لا نادات و دوور ناکەوێتەوە، واتە ئەو مرۆڤە سروشتی خۆی بەو شێوەیە دەژی کە لەناو ئەودا ئامادەیە. کێشەکە لەوەدایە، ئەرستۆ مرۆڤەکان بە خاوەنی "یەک سروشتی ئینسانیی یەکسان" نازانێت، پێی وا نییە "سروشتی" مرۆڤەکان یەک سروشتە، بە پێچەوانەوە، ئەرستۆ ڕای وا بوو "سروشت"ی ژن جیاوازە لە سروشتی پیاو و "سروشت"ی کۆیلەش جیاوازە لە "سروشت"ی خاوەنکۆیلە. هەروەها پێی وایە سروشتی پیاو لە هیی ژن و سروشتی کەسی ئازاد لە کەسی کۆیلە بەرزتر و پێگەیشتووتر و بەهادارترە. بۆیە ئەرستۆ هەموو هەوڵدانێکی کۆیلە بۆ ئەوەی لە کۆیلایەتی ڕزگاری ببێت و هەموو هەوڵدانێکی ئافرەت بۆ ئەوەی بەشدار بێت لە ژیانی گشتیی دەرەوەی خێزان و بەدەستهێنانی مافی یەکساندا، نەک تەنها وەک کارێکی ناڕاست و خراپ وێنا دەکات، بەڵکو وەک تەعداکردنە سەر ئەو "سروشت"ەش دەبینێت کە کۆیلەی وەک کۆیلە و ئافرەتی وەک ئافرەت پێک هێناوە.

---

1_Curtis, Micael (2008). The great political theories. New York, HarperPerennial. p. 29.

لە ڕووی ئەنترۆپۆلۆژییەوە ئەرستۆ باس لەوە دەکات کە مرۆڤەکان بەردەوام پێویستیان بە یەکترە و پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە هەر لە بنەڕەتیشەوە کۆمەڵگە ناتوانێت بەبێ هاریکاریی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا دروست ببێت، هەروەها بەبێ ئەم هاریکارییە، مرۆڤایەتییش ناتوانێت بێتە کایەوە و بەردەوام بێت. بۆ نموونە ژن و پیاو پێویستیان بە یەکە بۆ ئەوەی منداڵیان ببێت و کاروباری ناوماڵیان ڕێک بخرێت و لەوێشەوە درێژە بە ژیانی مرۆڤایەتی بدەن، بەڵام لەم پێویستییەدا "سروشت"ی ژن وایە لە ماڵەوە بمێنێتەوە و منداڵی ببێت و کاری ناو ماڵ بەڕێوە ببات و "سروشت"ی پیاویش وایە، ژیانی گشتی ڕێک بخات و بەڕێوە ببات. حوکمڕان و حوکمکراویش پێویستیان بە یەکە بۆ ئەوەی بتوانن کاروباری وڵات ببەن بەڕێوە، بەڵام حوکمڕان کەسێکە بە سروشت وا دروست بووە حوکمڕان بێت و حوکمکراویش بە سروشت وا دروست بووە کە حوکم بکرێت، لادان لەم سروشتە بە زیانی هەردووکیان و بە زیانی حوکمڕانی و بە زیانی مرۆڤایەتی کۆتایی دێت. ئەرستۆ کە باس لە ئاغا و سەپان، دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات، ئازاد و کۆیلە دەکات، باس لە پێگەی جیاواز ناکات کە "پەیوەندییەکی سیاسی" و "کۆمەڵایەتی" دروستی کردبن، واتە ئەو پەیوەندییانە وەک پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و سیاسی نابینێت، بەڵکو باس لە "پەیوەندیی سروشتی" دەکات و وەک دەرکەوتی جیاوازیی "پەیوەندیی سروشتی"ش وێنایان دەکات. بە بۆچوونی ئەرستۆ، ئەوەی وا دەکات کەسێک کۆیلە بێت، بوونی سیستمێکی سیاسیی دیاریکراو و پەیوەندییەکی تایبەتیی هێز و مۆدێلێک لە دەسەڵات و شێوازێکی تایبەتی

ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو سروشتی کۆیلە وەک کۆیلە و سروشتی ئاغا وەک ئاغا لە بوونی ئەم شتانە بەرپرسیارن. کۆیلە بە "سروشت" کەسێکە خاوەنی خۆی نییە، بەڵکو کەسێکی تر خاوەنیەتی، موڵکی کەسێکی ترە و ئامرازی دەستی کەسێکی ترە، "سروشت"ی ئەو کەسەی تریش لە سروشتی کۆیلەکە جیاوازە. بوونی ئەم سروشتە جیاوازانەش شتێک نییە لەپڕ و لەخۆیەوە دروست بووبێت، بەڵکو لە ئەزەلەوە هەن و بەو جۆرەن، هەندێک کەس هەر لە ساتەوەختی لەدایکبوونیانەوە دروست بوون بۆ ئەوەی حوکمڕان بن و هەندێکی تریش بۆ ئەوەی کۆیلە بن.[1]

ئاشکرایە شتێک لێرەدا بە ناوی مرۆڤەوە وەک بوونەوەرێکی یەکسان و مرۆڤبوون وەک بەهایەکی یەکسان ئامادە نییە، بۆیە هاوکات شتێکیش بە ناوی کەرامەتەوە، بەتایبەتی بەو مانا "کانتی"یەی باسمان کرد، لە بیرکردنەوەی ئەرستۆدا بوونی نییە. ئەگەر کەرامەت مانای ڕێزگرتن و بەرزنرخاندن و یەکسانوێناکردنی مرۆڤەکان بێت وەک مرۆڤ، ئەگەر کەرامەت شتێک بێت کە هەمووان وەک مرۆڤ بە هەمان ڕادە و بڕ هەیانبێت و نەکرێت نرخێکی بۆ دابنرێت، ئەوا شتێک بەم مانایە لە دونیای کۆندا بوونی نەبووە. ئەم شێوازە لە بیرکردنەوە لە کەرامەت و لە وێناکردنی مرۆڤ لە دونیای کۆندا نائامادەیە. ئەگەر بمەوێت لە دیدی ئەرستۆوە باس لە کەرامەت بکەم، کە تەواو دیدێکە ناکۆکە بە دیدی کانت، دەکرێت بڵێم کەرامەتی کۆیلە لای ئەرستۆ لەوەدایە ڕێزی کۆیلەبوونی خۆی و ڕێزی ئاغابوونی خاوەنکۆیلەکە وەک ئاغا

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٨.

بگرێت، هەوڵ نەدات سنوورەکانی کۆیلەبوون تێبپەڕێنێت و دەستدرێژی نەکاتە سەر ئەو "سروشت"ەی لە ئەزەلەوە پێی بەخشراوە. ئەوەی لەم دیدە ئەرستۆییەدا ئامادەیە، داننانە بە مرۆڤدا وەک مرۆڤ، وەک بوونەوەرێک یەکسان لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا، نەسڕینەوەی ئەو جیاوازییانەیە کە کەرامەت بۆ کەرامەتی جیاواز و بۆ کەرامەتی بەرز و نزم دابەش دەکات. ئەوەی ئامادەیە، وێناکردنی چەمکی مرۆڤە وەک چەمکێکی ئەبستراکت، کە هێما بۆ گەردوونیبوونی مرۆڤ بکات وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەتی یەکسان، ئەوەی بیرلێنەکراوەیە مەسەلەی "داننان"ە بە مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی یەکسان لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەدا. ئەم ئامادەییە هەم لەناو دینەکان و هەم لەناو فیکری فەلسەفیی دوای ئەرستۆشدا ئامادەیە، ڕوانینی ئیبن ڕوشد و فارابی و ئیبن سینا لە دونیای ئیسلامدا بۆ خەڵکی ئاسایی، ئەوەی پێی دەڵێن عەوام یان عامە، هەمان ڕوانینی نایەکسان و هەرەمیی سەردەمی ئەرستۆ و ئەفلاتوونە. (بۆ وردەکارییەکانی ئەم خاڵەش خوێنەر دەتوانێت بۆ بەشی یەکەمی ئەم کتێبە بگەڕێتەوە). مرۆڤایەتی پێویستی بە سەدەها ساڵ خەبات و تێکۆشان بوو تا بتوانێت ببێت بە خاوەنی خەیاڵێکی کۆمەڵایەتی و ئینسانیی نوێ، کە تیایدا بکرێت یەکسانیی نێوان مرۆڤەکان وێنا بکرێت. تا دەر کەوێت شتێک هەیە ناوی کەرامەتی ئینسانییە و ئەمەش وا لە مرۆڤەکان بکات یەکتری وەک بوونەوەری یەکسان ببینن. مامەڵەکردنی مرۆڤە جیاوازەکان وەک مرۆڤی یەکسان لەگەڵ یەکدا سەرەتای هەرە سەرەتاکانە، بەڵام ئەم سەرەتایە هەزاران ساڵ نائامادە و غائیب بووە.

## هیگڵ و مەسەلەی دانپیانان

لە سەرەتاکانی دروستبوونی دونیای مۆدێرندا کەس وەک فەیلەسووفی ئەڵمانی هیگڵ بە مەسەلەی دانپیانانەوە سەرقاڵ نەبووە. دیالێکتیکی ئاغا و کۆیلە لای ئەم فەیلەسووفە، کە بەشێکی گرنگی فیکری ئەوە، قسە لە کێشەی دانپیانان دەکات. لای هیگڵ غیابی دانپیانانێکی ڕاستەقینە لەنێوان ئاغا و کۆیلەدا بۆشاییەکی وجودیی گەورە دروست دەکات، بەڵام ئەم بۆشاییە لە نایەکسانیی نێوان مرۆڤەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەم نایەکسانییە وا دەکات کەسی بەهێز لە داننانی کەسی لاوازدا بە مرۆڤبوونی ئەودا وەک کەسێکی بەهێز، وەک ئاغا و سەروەرێک، دڵنیا نەبێت و لە بۆشاییەکی وجودیدا بژی. کەسی لاوازیش باوەڕی بە داننانی کەسی بەهێز بە مرۆڤبوونی ئەودا نەبێت، چونکە ئەو سەروەر و باڵادەستە. بە بۆچوونی من، مەسەلەی داننانی مرۆڤەکان بە یەکتریدا لای ئەم فەیلەسووفە، بەتوندی بە بوونی پێگەی دەسەڵاتی نایەکسانی نێوان مرۆڤەکانەوە گرێ دراوە. بۆ دەرچوون لەم بۆشاییە وجودییە، دروستکردنی کۆمەڵگەیەک پێویستە کە داننان بە یەکسانیی نێوان مرۆڤەکاندا بکات بە ژێرخانە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقییەکەی خۆی. لە هیگڵ بەدواوە، کە باس لە دانپیانان دەکرێت باس لە دانپیانانێکی دوولایەنە دەکرێت، باس لە دانپیانان و ڕێزی دوولایەنەی مرۆڤەکان بۆ یەکتری وەک بوونەوەری دەگمەن و جیاواز و یەکسان لەگەڵ

یەکدا دەکرێت، نەک داننانی کۆیلەیەک بە ئاغاکەیدا و داننای ئاغایەکیش بە کۆیلەکەیدا.[1] لەم دیدە نوێیەدا هەموو مرۆڤێک مرۆڤێکی تایبەت و دەگمەنە و لە کەسەکانی دەوروبەری جیاوازە، بەڵام ئەم جیاوازبوونە مانای ئەوە نییە کە نایەکسانە، هەروەها هۆکارێکیش نییە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی هەڵاوێردن و پەراوێزخستن ببێتەوە. بە پێچەوانەوە، جیاوازبوونی مرۆڤ لە مرۆڤەکانی تر، لە دەوروبەر و ژینگەکەی، بەشێکە لەسەر زەمینی یەکسانبوونی لەگەڵ ئەوانی تردا. لێرەدا جیاوازبوون بەشێکە لە دۆخی پلورالبوونی مرۆڤەکان، ئەمەش بە هیچ مانایەک نابێتە ئامرازی دروستکردنی نایەکسانی و نایەکسانیش ڕەوایەتی وەر ناگرێت بە ناوی جیاوازبوونەوە. (بۆ مەسەلەی پلورالبوونی مرۆڤ و کۆمەڵگەکان بڕوانە بەشی سێهەمی ئەم کتێبە). بەم مانایە، دانپیانان چەمکێکە هەم جیاوازیی مرۆڤ و دەگمەنبوونی دەسەلمێنێت، هەم یەکسانبوونی لەگەڵ کەسەکانی تردا. ئەم تێگەیشتنەیە وا دەکات مەسەلەی دانپیانان ببێت بە یەکێک لە چەمکە سەرەکییەکانی تێگەیشتنمان لە مەسەلەی کەرامەت. مرۆڤ لەڕێگەی بەدەستهێنانی دانپیانانەوە بە بوونی خۆیدا وەک مرۆڤ، لە ڕێگەی پاراستنی مرۆڤبوونی خۆیەوە وەک مرۆڤ، هەستکردنی بە خودی خۆی وەک خودێکی تایبەت و وەک کەسێکی تەندروست و خاوەنتوانا لەلا دروست دەبێت، ئەمەش هاریکاریی مرۆڤ دەکات بۆ ئەوەی بتوانێت ئازادانە و بە هەموو تواناکانییەوە لە کۆمەڵگەدا بەشدار ببێت.

---

[1] بڕوانە: Honneth, A 2001. 'Recognition or redistribution?: Changing perspectives on the moral order of society'. Theory, Culture & Society no.18 pp.45.

## چارلس تایلەر و چەمکی کەرامەت

چارلس تایلەر یەکێکە لە فەیلەسووفە گرنگەکانی دونیای ئەمرۆ، بە ڕەگەز کەنەدییە و کارەکانی زیاد لە بوارێکی گرتۆتەوە، لە چەند ساڵی ڕابردوودا کۆمەڵێک کتێبی گرنگی لەسەر ڕووکارە گرفتئامێزەکانی مۆدێرنە، لەسەر مەسەلەی شووناس و خود، مەسەلەی عەلمانیەت، مەسەلەی کولتوور و کۆمەڵگەی فرەکلولتووری نووسیوە. ڕوانینی تایلەر بۆ چەمکی کەرامەت یەکێکە لە ڕوانینە گرنگەکان و ئەوەی ئەم پیاوە لەسەر ئەم بابەتەی دەڵێت، لای بەشی هەرە زۆری ئەوانەی لەسەر ئەم چەمکە کار دەکەن، بە شێوازی جیاواز دووبارە دەبێتەوە. من لێرەدا هەوڵ ئەدەم زۆر بەکورتی پوختەی دیدی ئەم فەیلەسووفە کەنەدییە سەبارەت بە کەرامەت بە خوێنەران بناسێنم و ئەو خاڵە دەستنیشان بکەم کە چارەسەرکردنی کێشەی کەرامەت لە چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکانی دیکە جیا دەکاتەوە. تایلەر چەمکی کەرامەت بە چەمکی شووناسی تاکەکەسی و بە ڕێزگرتن لەو وێنانەوە دەبەستێتەوە کە مرۆڤ بە وێنەی ڕاستەقینەی خۆی دەزانێت، وەک چۆن هاوکات ئەو وێنانە وەک قووڵکردنەوەیەک بۆ ڕووبەر و ماناکانی ئازادیی خۆی وێنا دەکات (Taylor ١٩٩٤.) واتە کەرامەت پەیوەندیی بە شووناسی تاکەکەسەوە هەیە، پەیوەندیی بەو وێنانەوە هەیە کە تاکەکەس دەخوازێت بۆ خۆی دروست بکات و بە وێنەی

ڕاستەقینەی خۆی بزانێت لەناو کۆمەڵگەدا. ئەم ڕوانینە بۆ کەرامەت، لای چارلس تایلەر، کەرامەت دەکاتە چەمکێکی فیکری و سیاسیی مۆدێرن، هەڵگری ڕەهەندێکی گەردوونی و ڕەهەندێکی یەکسانخواز، کراوە لە بەردەم هەموو شووناسێک و هەموو تاکەکەسێکدا. لای ئەم پیاوە، کەرامەت شتێک نییە پابەست بێت بە جۆرێکی تایبەت لە مرۆڤبوونەوە، یان تەنها لەناو ئەم یان ئەو کولتوور و کۆمەڵگە و ناوچەی تایبەتی دونیادا بوونی هەبێت و گرنگ بێت، بەڵکو چەمکێکە پابەستی دروستبوونی مانا مۆدێرنەکانی مرۆڤبوون و پابەستی دروستبوونی تێگەیشتنە مۆدێرنەکانە بۆ کۆمەڵگە بەگشتی و بۆ تاکەکەس بەتایبەتی. بەستنەوەی چەمکی کەرامەت بە ڕێزگرتن و ئازادییەوە چەمکەکە لەوە دەر دەکات تەنها چەمکێکی کولتووری یان تیۆریی بێت، بەڵکو وا دەکات ئەم چەمکە هاوکات چەمکێکی سیاسیی گرنگیش بێت و بەتوندی بە شێوازێکی دیاریکراوی ڕێکخستنی کۆمەڵگەوە و بە شێوازێکی تایبەتیی مامەڵەکردنی تاکەکەسەوە، بەسترابێتەوە. ڕەهەندە فیکرییەکانی ئەم چەمکە، کەرامەت وەک پێدراوێکی گەردوونی پێناسە و پێشنیار دەکەن، بەڵام ڕەهەندە سیاسییەکانی دەیبەستنەوە بەو پرۆژە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەوە کە هەم ئازادیی تاکەکەسی و هەم ڕێزگرتنی مرۆڤ وەک مرۆڤ، دەستەبەر دەکەن. لای چارلس تایلەر، هەردوو دەرکەوتەکەی چەمکی کەرامەت، دەرکەوتی مۆدێرنن و لەگەڵ گەشەکردنی دونیای مۆدێرندا دێنە کایەوە.[1]

---

1_Taylor, Charles (1994). 'The Politics of Recognition'. Multiculturalism: Examining the Politics of Recognition. Ed.

وەک پێشتریش وتم، لە کۆمەڵگەکانی بەر لە دونیای مۆدێرندا، ڕیزبەستی مرۆڤەکان ڕیزبەستێکی هەرەمی بوو، ئەوانەی لە سەرەوەی کۆمەڵگەدا نیشتەجێ بوون، نەک تەنها ماف و ڕێز و دەسکەوتی ماددیی زیاتریان هەبوو، بەڵکو وەک بوونەوەری خاوەنکەرامەتی زیاتریش وێنا دەکران. بە بۆچوونی تایلەر، لە هەرەمیەتی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگە تەقلیدییەکاندا، مرۆڤەکان نە یەکسانن بە یەک، نە هەمان مافیان هەیە، نە هەمووشیان خاوەنی هەمان شەرەف و هەمان بڕ لە کەرامەتن. ئەوە هەڵوەشاندنەوەی ئەم هەرەمیەتە کۆمەڵایەتییە لە دونیای مۆدێرندا و بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و لەدایکبوونی بیرۆکەی مافی یەکسان و مەسەلەی هاووڵاتیبوونە، وا دەکەن چەمکی کەرامەت ببێت بە یەکێک لە چەمکە هەرە سەرەکییەکانی ناو ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقیی دونیای مۆدێرن.[1] خاڵی سەرەکی لە چەمکی کەرامەتدا، پێداگرتنە لەسەر ئەوەی مرۆڤەکان هەمان نرخ و بەها و قورساییان هەیە، هیچ مرۆڤێک لەوی تر بەنرختر یان کەمنرختر نییە، ئەمەش مەحاڵە بەبێ هەڵوەشاندنەوەی سەرجەمی بونیادە بنەڕەتییەکانی دونیای کۆن و شوێنگرتنەوەیان بە بونیادە بنەڕەتییەکانی دونیای مۆدێرن. بەم مانایە، چەمکی کەرامەت ئەو بنەما ئەخلاقی و فەلسەفییە تایبەتەیە کە سیستەمی سیاسیی دیموکراسیەتی نوێی لەسەر دروست کراوە، خاڵی سەرەکی لەم سیستەمەدا، ئەو سەرەتا گرنگەیە کە مرۆڤەکان وەک هاووڵاتیی یەکسان

---

Amy Gutmann. Princeton: Princeton University Press. 25-73س

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو.

وێنـا دەکات و هەمـان بڕ لـە کەرامـەت بـە مرۆڤبوونـی ئـەو مرۆڤانـەوە گـرێ ئـەدات. چەمکـی کەرامـەت لێـرەدا دەچێتـە شوێنی چەمکی "شـەرەف." چەمکی شـەرەف بنەمای سـەرەکیی سیستمە ئەخلاقییەکەی دونیای بەر لـە دونیای مۆدێرنـە، لـەو دونیایـەدا هەندێک کـەس و لایـەن و هێزی کۆمەڵایەتی خاوەنی شـەرەفی زیاتـرن و پێگـە ئەخلاقـی و شـەرەفمەندییەکەیان بەرزتـر و قورسـترە لەوانـی تـر. گۆڕانـی چەمکـی "شـەرەف" بۆ چەمکـی "کەرامـەت،" مانـای هەڵوەشـاندنەوەی ئـەو دونیـا ڕەمزییـەی شـەرعیەتی بـە هەرەمیەتـە کۆمەڵایەتییەکـەی نـاو کۆمەڵگە تەقلیدییەکان ئەبەخشی و جێگرتنـەوەی بە دونیایەکی نـوێ، کـە کەرامـەت ژێرخانـە ئەخلاقییەکەیـتی. کەرامەتیش وەک وتـم، وەک شووناسـێکی تاکەکەسـیی تایبـەت و وەک ڕێزگرتنی کۆمەڵێک وێنە و مانا کە تاکەکەس بە ژیانی خۆی لەنـاو کۆمەڵگـەدا دەبەخشـێت. شـووناس لێـرەدا هێمایـە بـۆ ئینتیمـای تاکەکەسـەکان بۆ خۆیان و بۆ ئـەو شـێوازە لـە بوون کە لەناو بوونی کۆمەڵایەتی و دەستەجەمعیدا هەڵی دەبژێرن و پیـادەی دەکـەن. شووناسـیش شـێواز و دەرکەوتـی فرەجـۆر و فرەچەشـنی پـڕ گـۆڕان و تازەبوونـەوەی بەردەوامـی هەیـە، لـە شووناسـی ئەتنـی و نەتەوەیـی و نیشـتیمانییەوە بیگـرە، بۆ شووناسـی ئایدیۆلـۆژی و جێنـدەر و شـێوەژیانی سێکسـی و ئینتیمـای کولتـووری و دینـی و ڕەمـزی، هتـد... دابینکـردن و ڕێزگرتنی ئـەم شووناسـانەش، ئـەو پێشـمەرجەیە کـە سیسـتمی دیموکراسـیی مۆدێرنـی لەسـەر بونیـاد نـراوە. بەکورتـی، ئـەو جیاکارییـەی تایلـەر لەنێـوان چەمکـی "شـەرەف" و چەمکـی "کەرامـەت"دا دەیـکات، هەمـان ئـەو جیاکارییەیـە کـە لەنێوان

کۆمەڵگەی تەقلیدی و کۆمەڵگەی مۆدێرنیشدا دەیکات. لای تایلەر، چەمکی کەرامەت چەمکی ناو سیستمی دیموکراسییە و هێما بۆ یەکسانبوونی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا دەکات، بەڵام چەمکی شەرەف چەمکی کۆمەڵگە تەقلیدییەکانە و هێما بۆ نایەکسانیی مرۆڤەکان دەکات.[1]

یەکێک لە خاڵە سەرەکییەکانی چارلس تایلەر ئەوەیە، کە ئەم جێگۆڕکێیە لەنێوان شەرەف و کەرامەتدا، ئەم جێگرتنەوەیەی چەمکی کەرامەت بۆ چەمکی شەرەف وەک ڕوانینێکی گەردوونی و هەڵگر بۆ مانای یەکسانبوونی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتریدا، وا دەکات تێگەیشتنی نوێ و مانای نوێ بۆ "شووناسی تاکەکەسی" بێتە کایەوە. مرۆڤ کە باس لە شووناسی تایبەتی خۆی دەکات، باس لەو هەست و هۆشیاربوونە بە خود بکات کە وای لێ دەکات خۆی وەک کەسێکی تایبەت و دەگمەن ببینێت، کەسێک خۆی دروستکەری ناوەڕۆکی مرۆڤبوونی خۆیەتی و خۆی نووسەری ژیان و ئەخلاق و ئاکارەکانی خۆیەتی. ئەم مرۆڤە بەشێکە لە مرۆڤایەتی، لە کۆمەڵگە، لەو گروپە کۆمەڵایەتییانەی لەگەڵیاندا دەژی، بەڵام هاوکات سەربەخۆ و جیاواز و خاوەنی تایبەتمەندیی خۆشیەتی. لای چارلس تایلەر، ئەم تایبەتمەندی و دەگمەنبوونە ئینسانییە مانای ئەوەیە ئینسان بتوانێت و هەلومەرجی ئەوەی بۆ ڕەخسێندرابێت لەگەڵ بوونی خۆی و لەگەڵ شێوازی تایبەتی ئامادەبوونی لەناو دونیادا ڕاستگۆ بێت.[2] ئەمەش مانای ئەوەیە، مرۆڤ ناچار

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٨.

نەکرێت شووناسی درۆزنانە و شێوەژیانی ساختەکارانە و بوونێکی هەڵە هەڵبژێرێت، ببێت و بکرێت بەو کەسەی کە خۆی نایەوێت ببێت و ناچار بکرێت بەو شێوەیە بژی کە خۆی ناخوازێت بژی. تایلەر لێرەدا ڕەهەندێکی سیاسیی گرنگ بە چەمکی کەرامەت دەبەخشێت و ڕاستەوخۆ دەیبەستێتەوە بە دروستکردنی کۆمەڵگەیەکەوە، بتوانێت مەرجی دەستەبەرکردنی ئەم جۆرە تێگەیشتنە بۆ کەرامەت بۆ مرۆڤەکانی برەخسێنێت. لەم ڕوانینەدا بۆ کەرامەت، ئەو بیرۆکەیە بالادەستە کە مرۆڤ نەک تەنها بوونەوەرێکی دەگمەن و جیاواز و ناوازەیە، بەڵکو پێویستی بەوەشە دان بەم دەگمەنبوون و ناوازەیی و لەویترنەچوونەدا بنرێت. تایلەر باس لە کۆمەڵێک بزووتنەوەی کۆمەلایەتیی ناو دونیای ئەمڕۆ دەکات، کە لە ئێستادا بەشێکن لە بزووتنەوە سیاسییەکانی دونیا، کە بۆ دانپیانانی کۆمەلایەتی تێدەکۆشن. لەوانەش بزووتنەوەی ئافرەتان، بزووتنەوەی داواکاریی فرەکولتووری، پێداگرتن لەسەر شووناسی تاکەکەسی و دەستەجەمعی، پێداگرتن لەسەر ئازادیی هەبوونی شێوەژیانی تایبەت، هتد... تایلەر بەرگریکردن لە داواکارییەکانی ئەم بزووتنەوانە و بەدەستهێنانی ئەو داواکارییانە وەک بەشێکی گرنگ لە کردەی دەوڵەمەندکردن و قووڵترکردنەوەی دیموکراسیەت لە ولاتە خۆرئاواییەکاندا دەبینێت و وەک گەشەدانێکی گرنگ بە لیبراڵیزمی سیاسی و فەرهەنگی و وەک قووڵکردنەوەی زیاتری چەمکی ئازادی نمایشی دەکات.

بە بۆچوونی من، پێداگرتن لەسەر کەرامەت و لەسەر مەسەلەی دانانان بە مرۆڤدا وەک مرۆڤ، وەک کەسێک کە

پێویستی بەوەیە بەو جۆرە ببینرێت کە دەیەوێت ببینرێت و ئەو وێنەیە بە خۆی و بە ژینگە و کۆمەڵگەکەی ببەخشێت کە بە وێنەی ڕاستەقینەی خۆی دەزانێت، مەسەلەیەکی هێجگار گرنگە لە دونیای ئەمڕۆدا، بە دونیای ئێمەشەوە. لای ئێمە زەحمەتە هیچ پرۆژەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بە ئاکارێکی دیموکراسییانەی ڕاستەقینەوە دروست ببێت، بەبێ دەستپێکردن لەم خاڵە سەرەتاییەوە، مەبەستم لە خاڵی بینینی مرۆڤەوە وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت، وەک بوونەوەرێکی دەگمەن و داننراو بە تایبەتمەندی و جیاوازییەکانیدا، وەک خاوەنی شووناسێک، کە خۆی دروستکەر و بوونیادنەرەکەی بێت. بەبێ بەخشینی ئەو مانایەی لە سەرەوە بە چەمکی کەرامەت درا و بەبێ وێناکردنی مرۆڤ وەک بوونەوەرێک کە پێداویستییەکی گەورە و سەرەکیی بەوە هەیە دان بە مرۆڤبوونیدا بنرێت، هیچ پرۆژەیەکی سیاسی لە وڵاتی ئێمەدا مانای نابێت. ئەمە کاتێک قابیلی ڕوودانە، کە لە چەمکی شەرەفەوە بپەڕینەوە بۆ چەمکی کەرامەت، شەرەف وەک مانایەکی ڕەمزیی نایەکسان و سەپاو بگۆڕینەوە بە چەمکی کەرامەت وەک مانایەکی کراوە و یەکسان و ئازاد.

مرۆڤ لە دونیای ئێمەدا بە شێوازی جیاواز بێکەرامەت دەکرێت و بە کۆمەڵێک نایەکسانی و جیاوازیی ترسناکیشەوە لەدایک دەبێت، هەموو هەوڵدانێکی ڕاستەقینە بۆ دەستکاریکردنی دونیای ئێمە بە دەستکاریکردنێکی هەمەلایەنی ئەم وێنانەی مرۆڤ دەست پێدەکات. مەسەلەی سەرەکی لە بینینی مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت

و لە داننان بە مرۆڤدا وەک کەسێکی خاوەنکەرامەت، پەیوەستە بە تێگەیشتن لە مەسەلەی شووناس، شووناسێک، وەک تایلەر دەڵێت، ئاماژە بۆ "تێگەیشتنی کەسەکان بکات لەوەی ئەوان خۆیان چین و کێن و ئاماژە بۆ تێگەیشتنیشیان بکات لە بنەڕەتیترین ئاکاری ئەوان وەک مرۆڤ."[١] تایلەر پێی وایە بەشێکی گرنگی شووناس بە هۆی دانپیانان یان بێبەشکردنەوە لە دانپیانان دروست دەبێت، بۆیە "دانپیانەنان یان دانپیانانی هەڵە،" واتە بەخشین یان سەپاندنی کۆمەڵێک ئاکار و مانا بەسەر کەسێکدا، کە ئەو کەسە بە هی خۆی نەزانێت، نەک تەنها مرۆڤ تووشی ئازارچەشتن و ناڕەحەتی و نامۆبوون دەکات، بەڵکو مرۆڤبوونیشی بەقووڵی بریندار و پرخەوش دەکات. ئەمەش جگە لەوەی جۆرێکە لە بریندارکردن و چەوساندنەوەی مرۆڤ، هاوکات دیلکردنی کەسێکە لەناو هەندێک وێنەدا، کە ئەو کەسە بە وێنەی ڕاستەقینەی خۆی نازانێت، یان وەک تایلەر دەڵێت، "زیندانیکردنی مرۆڤە لەناو شێوازێک لە بووندا، کە ساختە و شێواو و بەرتەسکە."[٢] لە دونیای ئێمەدا، گەڕاندنەوەی کەرامەت بەم مانایە بۆ مرۆڤی ئێمە، سەرەتای سەرەتاکان و ئەو پێوەرەیە کە پێویستە بەو هۆیە بتوانین باش لە خراپ و دەشێت لە ناشێی کۆمەڵایەتی و سیاسی و دینی و ئەخلاقی و فەرهەنگی جیا بکەینەوە، گوێنەدان بەم لایەنە گرنگەی ژیانی مرۆڤ لە دونیای ئێمەدا، بەردەوامیدانە بە شکاندنی کەرامەتی ئەو مرۆڤە.

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٥

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٥.

## کەرامەت و دیالۆگ

ئەگەر کەرامەت بەشێکی هێجگار گرنگ بێت لە شووناسی مرۆڤ وەک مرۆڤ و لە ڕوانین بۆ مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەننرخ، ئەودەم ئەو خاڵەی گرنگە پێی لەسەر دابگرین، ئەو ڕاستییەیە کە ئەو شووناسەی مرۆڤ بۆ خۆی دروست دەکات، ئەو ڕوانینەی مرۆڤ بۆ مرۆڤ دروستی دەکات، چ لە ئاستی ڕوانینی مرۆڤ بۆ خودی خۆی، یان لە ئاستی ڕوانینی مرۆڤەکانی تردا بۆ ئەو، ڕووداوێک نییە بەتەنهایی و لە بۆشاییدا دروست ببێت. بەرهەمهێنانی شووناس و گەلاڵەکردنی ڕوانین بۆ مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت، یاخود مامەڵەکردنی کەرامەت وەک بەشێکی دانەبڕاو لە شووناسی مرۆڤ، لە پرۆسەیەکی دیالۆگیی گەورەی ناو کۆمەڵگادا دروستدەبێت. شوناس شتێکە لە پەیوەندیدا بەوانی ترەوە، بەو کەسانەوە کە لەگەڵیاندا دەژین و لەگەڵیاندا ژیان و بوونمان دابەش دەکەین، دروست دەبێت، شووناس بەتەنهایی و بەدابڕاوی لەوانی تر و لە کۆمەڵگە دروست نابێت. کردەی دانپیانان هەمیشە کردەیەکی دیالۆگییە، لە پەیوەندیدا بەوانی ترەوە دروست دەبێت و هەر ئەوانی تریش دەتوانن نکووڵی لێ بکەن و دانی پێدا نەنێن. ئەم ڕاستییە سادەیە لە ئاستە فەلسەفییەکەیدا لە سەردەمی هیگڵەوە تیۆریزە کراوە و بووە بە بەشێک لە فیکر و مەعریفەی مۆدێرن. لە ڕوانینە هیگڵییەکەدا، شووناسی مرۆڤ

هەمیشە شووناسێکی دیالۆگییە، ڕێکەوتن و داڕشتنەوە و دەستکاریکردن و تازەکردنەوە و گۆڕانی شووناس، بەشێکی سەرەکیی ئەو دیالۆگە و کردەی سەرەکیی دروستکردنی ئەو شووناسەیە. کارکردنمان لەگەڵ یەک و کارلێککردنمان لەسەر یەکتری، پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتیمان، شێوازی ڕێکخستن و مانابەخشین بە پەیوەندییەکانمان، کەوتنەپەیوەندییەوە لەگەڵ ئەو ژینگەیەدا کە تیایدا دەژین، هێنانی دونیا بۆ ناو خودی خۆمان و بردنی ئەم خودە بۆ ناو دونیا، ئەمانە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی شووناسی مرۆڤن، هیچ یەکێکیش لەمانە بەتەنها و بەبێ ئەوانی تر و بەدابڕاوی لەو ژینگەیەی مرۆڤی تیادا دەژی، ڕوو نادات. شووناسی مرۆڤ کەمتر پێدراوێکی سایکۆلۆژی و زیاتر پێدراوێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییە. داننان بە مرۆڤیشدا وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت، کۆڵەکەی سەرەکیی ناو ئەو دونیا کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەیە و گەر ئەم دانپیانانە بوونی نەبوو، ئەوا دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤ بۆی لەناو دونیای دەروونیی ئەم یان ئەو تاکەکەسی تەنها و دابڕاودا، مانایەکی ئەوتۆی نابێت. تایلەر تا ئەو شوێنە دەڕوات کە بڵێت داننان بە مرۆڤدا وەک مرۆڤ و وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت "یەکێکە لە سەرەکیترین و بنەڕەتیترین پێداویستییەکانی مرۆڤ."[1] واتە مرۆڤ وەک چۆن پێویستی بە خۆراک و پۆشاک و ژینگەیەک هەیە بۆ پاراستنی، ئاواش پێویستی بە پاراستنی کەرامەت هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت وەک مرۆڤ بژی. بۆ ئەوەی مرۆڤیش وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٦.

ببینرێت، پێویستی بەوەیە ئەو گشتە گەورەیە لە پەیوەندی و لە شێوازی ڕێکخستن و مانابەخشین کە بەدەوری مرۆڤدا دروست دەبێت، کەرامەت وەک بەشێکی گرنگی شووناسی مرۆڤەکان ببینێت. پەیوەندیی بەو گشتە گەورەیەوە وا دەکات شووناس ڕەهەندێکی سیاسیی هێجگار گرنگی هەبێت. مرۆڤ بۆ ئەوەی وەک مرۆڤێکی خاوەنکەرامەت ببینرێت، دەبێت چوارچێوە سەرەکییەکانی داننان بە مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت ئامادە بن، ئیتر لە چوارچێوە یاساییەکانەوە بیگرە بۆ چوارچێوە سەرەکییەکانی پەروەردە و فێرکردن و نرخاندن و لەوانیشەوە بۆ پەیوەندیی نێوان دەسەڵات و کۆمەڵگە و تاکەکەس و دەزگاکان و مرۆڤەکان بەیەکەوە.

خاڵێکی دیکە کە لە پەیوەندیدا بە مەسەلەی کەرامەتەوە گرنگە ئاماژەیەکی خێرای پێ بکەین، ئەوەیە کە مرۆڤ بوونەوەرێک نییە "جەوهەر"ێکی شاراوە یان "بۆشاییەک" لەناویدا بێت و کاری ئەو لە ژیانیدا ئەوە بێت ئەو "جەوهەر"ە شاراوەیە بدۆزرێتەوە. ئەم دیدە بۆ شووناس و بۆ مرۆڤبوون دیدێکی جەوهەرگەراییە و لەسەر وێناکردنێکی هەڵەی مرۆڤبوون دروست بووە. ئەم دیدە مرۆڤ وا وێنا دەکات، وەک ئەوەی هەڵگری خودێکی "ڕاستەقینە" و "شاراوە" بێت، کە گوایە لە "قووڵایی"یەکی گریمانکراوی ناو "ڕۆح"، یان "کەسایەتی"دا نیشتەجێیە و تەپوتۆز و سەرقاڵییەکانی ژیانی ڕۆژانە ناهێڵێت ئەو خودە "ڕاستەقینە" شاراوەیە ببینرێت و بدۆزرێتەوە. ئەم ڕوانینە مێتافیزیکیی و زۆر جار ئینشاییە، ڕوانینی باڵادەستە بۆ مرۆڤبوون لای برێکی زۆر

لـە شـاعیران و هونەرمەنـدان و نووسـەران، هەروەهـا لای ئـەو کەسـانەی دیدێکـی جەوهەرگەرایـان بـۆ ئینسـان هەیـە. ڕاسـتییەکەی ئەوەیـە مـرۆڤ جەوهەرێکـی نەگـۆڕی نییـە، شـتێک نییـە "جەوهـەر" و خودێکـی "شـاراوە" و "بـزر" لـە "قوولاییـدا" و کاری مـرۆڤ ئـەوە بێـت بیدۆزێتـەوە و دەری بهێنێـت، ئـەوەی لـە بنەڕەتیشـەوە هەیـە "دۆزینـەوە"ی خـود نییـە، بەڵکـو "دروسـتکردنێکی بـەردەوام"ی خـودە، داڕشـتنەوە و دەسـتکاریکردن و داهێنانـی بەردەوامـی خـودە، خـود هەرگیز نادۆزرێتـەوە، بەڵکـو بـەردەوام دروسـت دەکرێـت، لـە قوولایـی و بۆشـاییەکی گریمانکـراوی نـاو مرۆڤـدا بەشـاراوەیی ئامـادە نییـە، بەڵکـو لەنـاو کـردەی ڕۆژانـەی لەگـەڵ ئەوانیتربـوون و لەنـاو دونیادابـوون و لەنـاو پێکەوەبوونـدا دروسـت دەکرێـت. مـرۆڤ خـودی شـاراوەی خـۆی نادۆزێتـەوە، بەڵکـو خـودی خـۆی بەبەردەوامـی دروسـت دەکات و دای دەهێنێـت و دای دەڕێژێتـەوە. ئەمـەش لـە تەنهاییدا نـاکات، تەنها لـە ڕێگەی کتێب و نووسینیشـەوە ئەنجامـی نـادات، بـە موناجـات لەگـەڵ خـود خۆیـدا دروسـت نابێـت، بەڵکـو لـە ڕێگـەی پەیوەندیـی بەوانـی ترەوە، لـە ڕێگەی کارلێککردنی فرەجەمسـەرییەوە و لـە ڕێگـەی ئامادەگیـی چـڕ و هەمەلایەنـەوە لەنـاو شـێوازە جیاوازەکانـی پێکەوەبوونـی کۆمەڵایەتیدا ئەنجام ئەدرێت. لە کردەی دیالۆگدا لەگـەڵ ئـەم گشـتە ئاڵۆزەدایە مـرۆڤ وێنەیەکی تایبـەت بۆ خۆی و مانایەکی تایبـەت بـە ژیانـی خـۆی دەبەخشـێت، بەبێ ئـەوەی ئـەو وێنـە و مانایـە وەک وێنـە و مانـای ئەبـەدی ببینرێـن. ئـەم ئامادەبـوون و دیالۆگەشـە پرۆسـەیەکی بێکۆتاییـە، برانـەوەی نییـە و هەمیشـە هەیـە و بەڕێوەیـە، ئەگـەر شـتێک هەبێـت لـەم

گشتەدا نەگۆڕ بێت، ئەوا خودی دیالۆگە کۆمەڵایەتییەکان و شێوازە جیاوازەکانی پەیوەندی و پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتییە. بەڵام کە باس لە ئامادەبوونی مرۆڤ لەناو دونیادا و لەگەڵ ئەوانی تردا دەکەم، ناکرێت ئامادەبوون کورت بکرێتەوە تەنها بۆ ئامادەبوونە جەستەیی و فیزیاییەکانی مرۆڤ لەناو دونیادا، بەڵکو سەرجەمی ئەو ئامادەبوونە خەیاڵی و ڕەمزییانەش دەگرێتەوە کە مرۆڤ بەوانی تر و بە دەوروبەرەکەیەوە گرێ ئەدات. دانپیانانی ئەوانی تر بە ئێمەدا وەک کەسێکی خاوەنکەرامەت و هیی ئێمەش بەوانی تردا بە هەمان ناوەڕۆک، بەشێکی گرنگ و سەرەکیی ئەم دۆخە کۆمەڵایەتییەیە، گەر ئەم دانپیانانە نەبوو، مرۆڤ ناتوانێت ببێت بە مرۆڤ و ناتوانێت مرۆڤبوونی خۆی بە شێوازە ئازاد و تەندروستەکەی بژی. ئەم پێداگرتنە گەورەیە لەسەر دانپیانان، ئاکاری سەرەکیی بیرکردنەوەی چارلس تایلەرە لە چەمکی کەرامەت. ئەمەش دەرەنجامێکی گرنگی بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی هەیە. ڕێزگرتنی مرۆڤ و پاراستنی کەرامەتی تەنها لە ڕێگەی سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سەروەت و سامانی نیشتیمانی و دەستەبەرکردنی ژیانێکی ماددییەوە نابێت کە مرۆڤ لە زەلیلبوون بپارێزێت، بەڵکو پێویستی بە سیاسەتێکی دانپیانانیش هەیە، ئەو ڕووبەرە ئازادە بە مرۆڤ ببەخشێت، بتوانێت بە هۆیەوە بەو شێوەیە بژی کە لەگەڵ وێنەکانی مرۆڤ لەسەر خۆی و تێگەیشتنەکانیدا بۆ خۆی وەک مرۆڤ، دەگونجێت. دانپیانان جیاوازە لە سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سەروەت و سامانی ماددی، بەگژاچوونەوەی هەژاری مەسەلەیەکە جیاوازە لە دەستەبەرکردنی داننان بە

کەرامەتـی مرۆڤەکانـدا. ئەگەرچـی چارلـس تایلـەر وەک کانـت بـاس لـەوە نـاکات کـە مـرۆڤ بـە کەرامەتـەوە لەدایـک دەبێت، بەڵکو کەرامـەت وەک دروسـتکراوێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویـی دەبینێت، بەڵام لـەو خاڵـەدا لەگـەڵ کانتدا یـەک دەگرێتـەوە، کە مرۆڤ پێویسـتە دونیایـەک دروسـت بـکات، تیایدا بتوانێت وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامـەت لەدایـک ببێت و بژی. دونیایـەک، دانپیانـان بـە مرۆڤـدا وەک بوونەوەرێکـی خاوەنکەرامـەت، ژێرخانـە ئەخلاقـی و بەهاییەکـەی بێـت.

## چەمکی کەرامەت لای ئالێکس هۆنێس

ئالێکس هۆنێـس فەیلەسـووفێکی ئەڵمانییـە و سـەر بـە نـەوەی سـێهەمی قوتابخانـەی فرانکفۆرتـە. ئـەم فەیلەسـووفەش کاتێک بـاس لـە مەسـەلەی کەرامـەت دەکات، وەک چارلـس تایلـەر، لەپاڵ چەمکی دانپیانانـدا باسـی دەکات و لـە هەمـان ئـەو ڕەوتە تیۆرییـەدا جێگیری دەکات کە چارلس تایلـەر جێگیری دەکات. لای هۆنێسـیش دانپیانـان یەکێکـە لـە پێداویسـتییە ئینسـانییە گرنگـەکان و بەشـێکی سـەرەکی و بنەڕەتییـە لـە مەسـەلەی وەدیهێنانـی ئینسـان بۆ خـود و ئینسـانیەتی خـۆی و بۆ بـوون بەو شـتەی کـە مـرۆڤ دەخوازێـت و حـەز دەکات ببێـت پێـی. هۆنێـس لـە دوو کتێبـدا کـە یەکێکیـان لـە سـاڵی ١٩٩٥دا و ئـەوی تریـان لـە سـاڵی ٢٠٠٧دا بـڵاوی دەکاتـەوە، بەدرێـژی لەسـەر مەسـەلەی دانپیانـان دەوەسـتێت و گرنگییەکانـی لـە

ژیانی مرۆڤی ئەمرۆدا ڕوون دەکاتەوە.[1]

چەمکی دانپیانان لای هۆنێس چەمکێکی ئاڵۆزترە لەوەی لای چارلس تایلەر بینیمان، هۆنێس سێ شێوازی جیاوازی دانپیانان لە یەکتری جیا دەکاتەوە و هەریەکێکیشیان دەخاتە ناو فەزایەکی تایبەتی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و ئینسانییەوە. ئەو سێ شێوازە جیاوازەی دانپیانانیش بریتین لە: یەکەم، خۆشەویستی. دووهەم، بوونی ماف. سێیەم، هاریکاری و بەدەمەوەچوونی ئینسانی و کۆمەڵایەتی.

خۆشەویستی و مافداری و هاریکاریی ئینسانی لای هۆنێس دەرکەوتی سێ شێوازی جیاوازی دانپیانانن بە مرۆڤەکاندا. هەریەکێک لەم سێ شێوازە تایبەتەی پەیوەندیی ئینسانی و کۆمەڵایەتی ئاماژە بۆ جۆرێکی تایبەت و جیاواز لە دانپیانان دەکات. بە بۆچوونی هۆنێس، مرۆڤ تەنها لە دۆخی بەدەستهێنانی ئەو سێ شێوازە جیاوازانەی دانپیاناندا دەتوانێت پەیوەندییەکی پۆزەتیڤ و دەوڵەمەندی بە خۆیەوە هەبێت و تەنها لە ڕێگەی ئەو سێ شێوازەوە لە دانپیانان دەتوانێت ببێت بەو مرۆڤەی کە دەیەوێت ببێت. ئەوەی هۆنێس دەیەوێت لێرەدا پێی لەسەر دابگرێت، گرنگیی پەیوەندییە ئینسانییەکانە بۆ دروستکردن و پاراستنی شووناسی تاکەکەسیی مرۆڤەکان وەک مرۆڤ. نوقسانی لە هەریەکێک لەو دانپیانان و پەیوەندییانەدا نوقسانییەک

1_ئەو دوو کتێبەش بریتین لە:

Honneth, A.,(1995). The Struggle for Recognition: The Moral Grammar of Social Conflicts. Cambridge: The MIT Press

Honneth, A., (2007). Disrespect: The Normative Foundations of Critical Thyheory. Cambridge: Polity Press

لە مرۆڤبوونی مرۆڤدا دروست دەکات. هەریەکێک لەم دانپیانانە ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی مرۆڤبوون بەهێز و قووڵ دەکەنەوە، کە بەسەریەکەوە مرۆڤێک دروست دەکەن، بەر لە هەموو شتێک پەیوەندیی لەگەڵ خودی خۆیدا پەیوەندییەکی هاوسەنگ و گونجاو بێت. هۆنێس لە ڕێگەی لێکترجیاکردنەوەی ئەم سێ شێوازە لە دانپیانانی ئینسانی و کۆمەڵایەتییەوە، دەیەوێت تیۆرییەک گەشە پێ بدات دەربارەی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی، گۆڕانکارییەکی پۆزەتیڤ کە لە ڕێگەی خۆشەویستی و ماف و بەدەمەوەچوونی ئینسانییەوە دروست ببێت و ببێت بە بەشێک لە پەیوەندی و لە کارلێککردنی چەندجەمسەرەی مرۆڤەکان لە یەکتری. هەروەها ببێت بە بەشێک لە کردەی بەدەستهێنانی هەستی باوەڕکردن بە خۆ و خۆدۆزینەوە لەناو دونیایەکدا کە کەرامەت و شووناسی ئەو کەسە وەک مرۆڤ بپارێزێت. بە مانەیەکی دیکە، تیۆرەی دانپیانان لای هۆنێس، تیۆرەیەکی سایکۆلۆژیی نییە، موناجات و ڕۆحانیەتێکی دینی و نادینی نییە، بەڵکو تیۆرەیەکە دەربارەی چۆنێتیی ئیشکردنی کۆمەڵگە، بەتایبەتی کۆمەڵگەیەک، بیەوێت بە مرۆڤ کەرامەت وەک بەهایەکی ئینسانی و کۆمەڵایەتیی گرنگ ببەخشێت. لای هونێس، دروستکردنی شووناس لای مرۆڤ بەبێ ئامادەگیی ئەم سێ شێوازە لە دانپیانان مەحاڵە، چونکە هەم سەربەخۆبوون و ئۆتۆنۆمبوونی مرۆڤ و هەم تاکێتیی تاکەکەسەکان، بە شێوەیەکی حەتمی تەحەدا دەکرێن گەر هات و ڕێز لە مرۆڤ نەگیرا و نرخ بۆ مرۆڤبوونی دانەنرا. دانپیانان لای هۆنێس پێچەوانەی ئەو دیدە داروینییەیە کە

باس لە "کۆشش لەپێناوی مانەوەدا" دەکات، لای هۆنێس، دانپیانان بریتییە لە "کۆشش لەپێناوی دروستکردنی پەیوەندیی دانپیانانی دووجەمسەرەدا." واتە مەسەلەکە هەر لە بنەڕەتەوە پەیوەندیی بە ململانێوە لەسەر دەسەڵات و لەسەر سەروەربوون و کۆیلەبوون نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە شێوازە جیاوازەکانی هاریکاریی کۆمەڵایەتییەوە هەیە کە مرۆڤ لەناویاندا دەبێت بە هەڵگری خود و ئینسانیەتێکی تایبەت. لە دیدی هۆنێسەوە، حەز و ئارەزووی مرۆڤ بۆ دانپیانان بە ڕادەیەک بنەڕەتی و گرنگە بۆ دروستکردن و وەدیهێنانی خود، وەک ئەو هێزە وێنای دەکات کە لەپشتی گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییەوە ئامادەیە.[١]

خۆشەویستی وەک شێوازی یەکەم لە دانپیانان، بەرجەستەکەری ئەو جۆرەیە لە پەیوەندی کە لەناو مەجالی تایبەت و لەناو پەیوەندییە کەسی و تایبەتەکانی مرۆڤدا دروست دەبێت، لەوانە لە پەیوەندییەکانی ناو خێزاندا و لە پەیوەندیی هاوڕێیەتی و لە پەیوەندیی خۆشەویستیدا. لێرەدا هەستێکی بەهێز و قووڵی مرۆڤەکان بەرامبەر بە یەکتری دروست دەبێت، خۆشەویستی دەبێت بە بەشێک لەو پەیوەندییانەی کەسەکان لەم مەجالە تایبەتەدا بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە، بەڵام ئەم شێوازە لە پەیوەندی، شێوازێکی تەواو سنووردار و بەرتەسکە، مەودای کۆبوونەوەکان و ژمارەی ئەوانەی دەچنە پەیوەندیی قووڵ و چڕی لەو بابەتەوە، مەوادیەکی بەرتەسک و ژمارەیەکی بچووکە. مرۆڤ

---

١_Honneth, A.,(1995). The Struggle for Recognition: The Moral Grammar of Social Conflicts. Cambridge: The MIT Press

تەنها ژمارەیەکی کەم لە مرۆڤەکانی خۆش دەوێت و ئەو خۆشەویستییەش دەربڕی پێداویستییەکی تایبەتی مرۆڤەکانە. هۆنێس ئەم جۆرە لە دانپیانان وەک پێداویستییەکی فیزیایی دەبینێت، پێی وایە مرۆڤ وەک چۆن پێویستی بە نان و ئاو و هەوا هەیە، ئاواش پێویستی بە خۆشەویستی هەیە. خۆشەویستی لێرەدا تەنها دەربڕینی هەستێکی تایبەت نییە بەرامبەر بە کەسێک، بەڵکو شێوازی یەکەمی دانپیانانە بە مرۆڤبوونی مرۆڤدا، بە مرۆڤدا بەو شێوەیەی کە هەیە و بەو جۆرەی کە حەز دەکات هەبێت. دانپیانان لێرەدا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە مشوورخواردنەوە بۆ یەکتری هەیە، مشوورخواردن بۆ مرۆڤبوونی یەکتری. ئەم دانپیانان و مشوورخواردنەش بێمەرج و بێبەرامبەرە. شێوە هەرە دیارەکەشی خۆشەویستیی نێوان منداڵان و دایک و باوکیانە، خۆشەویستییەکە کە کەسەکان بەئازادانە و بەبێ چاوەڕوانی ئەنجامی ئەدەن و لەگەڵیدا دەژین. دانپیانان بە مرۆڤ لەم ئاستەدا هەستی باوەڕبوونی مرۆڤ بە خودی خۆی و هەستی دڵنیابوون لە خودی خۆی دروست دەکات، وا دەکات ئینسان لەوە نەترسێت باسی ئارەزوو و پێداویستییەکانی خۆی بکات و ترسی ئەوەی نەبێت ئەو کەسانەی خۆشیان دەوێت و ئەم خۆشی دەوێن لێی دوور بکەونەوە و بەتەنها جێی بهێڵن. بە بۆچوونی هۆنێس، ئەم شێوازە لە دانپیانان لە پێش دوو شێوازەکەی ترەوەیە.[1]

شێوازی دووهەمی دانپیانان، شێوازی بوون و دابینکردنی مافە. ئەگەر خۆشەویستی لەناو خێزان و

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٠٧.

پەیوەندییە شەخسییەکاندا ڕوو بدات، ئەوا داننان بە مافدا لەناو کۆمەڵگەدا ڕوو دەدات. ئەگەر لە خۆشەویستیدا هەست و سۆزێکی چڕ و قووڵ ئاراستەی پەیوەندییەکان و ئینتیماکان بکات، لە بوونی مافدا تێگەیشتن و بیرکردنەوەی عەقڵانیی بناغەی پەیوەندییەکان و ئینتیماکان دادەڕێژێت. کەسەکان لێرەدا لە پەیوەندییەکی بەرپرسیار و ئەخلاقیی دووچەمسەردان لەگەڵ یەکدا و لەناو کۆمەڵگەدا. لێرەدا گرنگ نییە مرۆڤەکان لەناو چ جۆرە پەیوەندیی خێزانی و گرووپیی تایبەتەوە هاتوون، ئەوەی گرنگە ئەوەیە وەک کەسێکی خاوەنماف ببینرێن و لەناو دابەشکردنێکی مافپەروەرانەی مافدا نیشتەجێ بن. ماف لێرەدا پەیوەندیی بە ئاکاری تایبەتی کەسەکانەوە نییە، بۆ نموونە گرنگ نییە ئەو کەسە درێژە یان کورت، لە خێزانێکی دەوڵەمەند و پڕ خۆشەویستییەوە هاتووە یان لە خێزانێکی هەژار و نەدارەوە، خاوەنی ئەم یان ئەو چاکەکاری و لێزانییە یان نا، ماف لێرەدا دانپیانانێکی یاساییە کە پێویستە بە هەموو کەسێکی ناو کۆمەڵگە بنرێت، ماف لەم ڕوانینەدا بەستراوەتەوە بە سیستمێکی یاساییەوە کە دەربڕی حەز و ئارەزوو و گرنگیپێدانە گشتییەکانی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگەیە وەک کەسانی یەکسان بە یەکتری.[1]

مرۆڤ لێرەدا و لەپاڵ ئەم مافانەدا دەبێتە بوونەوەرێکی خاوەنهەست و بەبەرپرسیاریەت، دەبێت بە کەسێک، کە هەستێکی ئەخلاقیی بەرپرسیاری تێدا دروست دەبێت، لە کۆمەڵگەیەکدا یاسا و دادپەروەری کۆڵەکە سەرەکییەکانیەتی.

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٠٩.

لەم ئاستەدا مرۆڤ پەیوەندییەکی ئەخلاقی و بەرپرسیارانە بە ئەوانی تر و بە دەوروبەرەکەیەوە گەشە پێ ئەدات، چونکە ئەم جۆرە پەیوەندییانە پێویستن بۆ هێشتنەوە و گەشەدان بەو کۆمەڵگەیە وەک کۆمەڵگەیەکی دادپەروەر. مرۆڤەکان لێرەدا دان بە بوونی یەکتریدا دەنێن وەک کەسانی یەکسان و خاوەنماف، داننانەکانیش داننانی دووجەمسەرین، واتە هەم من دان بە مافی ئەوانی تردا دەنێم و وەک کەسانی خاوەنماف و یەکسان مامەڵەیان دەکەم، هەم ئەوانیش من بە هەمان شێوە دەبینن و مامەڵە دەکەن. مرۆڤەکان لێرەدا فێر دەبن یەکتری لە چاوی ئەوی ترەوە ببینن، واتە من خۆم دەبینم بەو شێوەیەی ئەوی تر وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و یەکسان تەماشام دەکات، هەم ئەویش فێر دەبێت خۆی لە دیدی منەوە ببینێت وەک کەسێکی خاوەنمافی یەکسان. هەر نکوولیکردنێک لەو مافانە و هەر شێوازێکی نەسەلماندن و ڕێزنەگرتنیان دەبێتە هۆی تێکچوونی پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان، وا دەکات ئەوانەی مافەکانیان لێ دەسەنرێتەوە یان نکوولی لە مافەکانیان دەکرێت، جا چ لە ڕێگەی یاساوە بێت یان لە هەر ڕێگەیەکی دیکەوە، هەستی ئەوەیان لا دروست ببێت کە کەسانی یەکسان بە کەسەکانی تر نین و بە هەمان ڕادە ڕێزیان ناگیرێت و هەمان ئەو نرخەیان بۆ دانانرێت کە بۆ ئەوانی تر دادەنرێت. ئەمەش هەم هەستێکی بەهێزیان بە بێڕێزیکردن و هەم هەستی بریندارکردنی کەرامەتیان لا دروست دەکات و وا لەو کەسانە دەکات خۆیان بە ئەندامی ئەو کۆمەڵگەیە نەزانن و بکەونە دەرەوەی سنووره ڕەمزی و ئەخلاقی

و یاساییەکانی ئەو کۆمەڵگەیەوە. دیوێکی گرنگی تری هەبوونی ماف وەک شێوازی دووهەمی دانپیانان ئەوەیە، ڕێزی سەربەخۆبوونی کەسەکان بگیرێت و وەک کەسی سەربەخۆ مامەڵە بکرێن. ئەمەش مانای سەربەخۆبوونیان لە بڕیاردانەدا و دەرچوونیان لەژێر کۆنترۆڵی ئەوانی تردا، کۆنترۆڵێک، کە دەشێت لە ڕێگەی میکانیزمی جیاوازەوە بەسەر کەسەکاندا بسەپێندرێت. بەکورتی، داننان بە مافدا بەشێکی سەرەکیی دروستکردنی ژیانێکی هاوبەشە، کە مەرج نییە مرۆڤەکان یەکتریان خۆش بوێت وەک لە مەجالی تایبەتدا یەکتریان خۆش دەوێت، بەڵام مەرجە ڕێزی یەکتری بگرن و مافەکانی یەکتری بسەلمێنن. داننان بە مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی خاوەن بەشێکە لە دروستکردنی ئەو ژیانە گشتییە کە هەمووان بە ژیانی خۆیانی بزانن. خاڵی سەرەکی لێرەدا، بوونی کۆمەڵێک یاسایە کە ئەم ژیانە بە شێوە مافپەروەرەکەی ڕێک بخات.

شێوازی سێهەمی دانپیانان شێوازی هاریکاری و بەدەمەوەچوونی کۆمەڵایەتییە. بەلای هۆنیسەوە مرۆڤ تەنها بە خۆشەویستیی کەسە نزیکەکانی و تەنها لە ڕێگەی هەبوونی مافی یاساییەوە ناژی، بەڵکو پێویستی بە هاریکاریی کەسانی تریش هەیە. چونکە کەسەکان لێرەدا لە ڕێگەی کردەی هاریکارییەوە هەم پەیوەندییەکی پۆزەتیف لەگەڵ خۆیان و هەم لەگەڵ دەوروبەرەکەیاندا دروست دەکەن. هاریکاریکردن هەستی ئەوە لە مرۆڤدا دروست دەکات کە کەسێکە قابیل و شایستەی هاریکاریکردنە، قابیلی ئەوەیە کەسانی تر مشووری بخۆن و بەدەمیەوە بچن. هاریکاری

وەک داننـان بـە توانـای کەسـێک و وەک پۆزەتیڤنرخاندنـی کەسـایەتیی ئـەو کەسـە وێنا دەکرێت. هاریکاریکردنـی یەکتـر مانـای داننـان بـە ئـاکار و تواناکانـی یەکتریـدا، داننـان بـەو ڕەهەنـدە تاکەکەسـییانەدا کـە کەسـێک دەکات بـە کەسـێکی تایبـەت و بـە شایسـتەی هاریکاریی ئەوانی تر. نەبوونی ئەم شـێوازە لـە دانپیانـان کێشـەی گـەورە بـۆ کەسـی دانپیانەنراو دروسـت دەکات. بـە بۆچوونـی هۆنێـس، نکوولێکـردن لـە هاریکاری و بەدەمەوەچوون، مانـای داننەنـان بـەو کەسـەدا کە هاریـکاری ناکرێت و داننەنـان بـەو توانـا و بەهـا و نرخانەشـدا کـە هەڵگریەتـی. هاریـکاری و بەدەمەوەچوونـی کۆمەڵایەتـی وێنـەی کەسـەکە لـە بەردەمـی خـۆی و لـە بەردەمـی گـروپ و کۆمەڵگەکەیـدا وەک وێنـەی کەسـێک دەنەخشـێنێت کـە بەشـێکە لە گشـتێکی گەورەتر، لـە گروپ و کۆمەڵگەیـەک، کە پێکـەوە و لەگەڵیانـدا ئاسـۆیەکەی هاوبەشـی لـە بەهـا و نرخـی کۆمەڵایەتـی هەیـە، شـتێکیان لەگەڵـدا بـەش دەکات و شـتێک بەیەکـەوە کۆیـان دەکاتـەوە. ئـەم شـێوازە لـە دانپیانـان، تەنهـا لـە ڕێگـەی هاریـکاری و مشـوورخواردنی کۆمەڵایەتییـەوە دروسـت دەبێـت، نەبوونـی ئـەم شـێوازە لـە هاریکاریـی کۆمەڵایەتـی، وا دەکات مرۆڤ هەسـت بە بچووکی و بێڕێزی و کەمنرخیی خـۆی بکات، وەدیهێنانـی خـود لێرەدا پەیوەسـتە بـە هاریکاریـی دەسـتەجەمعیی کۆمەڵگـەوە.[1]

لای هۆنێس، ئـەوەی سیسـتمە سیاسـییەکان و شـێوازەکانی تێکۆشـان و خەباتکردنیـش لـە یەکتـری جیـا دەکاتـەوە، ئـەوە

---

[1]_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٥٢.

نییە ئایا ئەو سیستمە لیبراڵە یان سۆسیالیستییە یان هەر شتێکی دیکە، بەڵکو ئەوەیە ئایا بڕ و ڕادە و فراوانیی یان سنووردارێتیی ڕووبەری دانپیانانەکانی بە مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت چەندە؟ ئەو شێوازانە لە کۆشش و خەباتی کۆمەڵایەتی کە ڕووبەر و شێوازەکانی دانپیانان گەورە و فراوانتر دەکەن کۆشش و خەباتێکی پێشکەوتنخوازانەی پۆزەتیڤن و ئەوەشی ئەو ڕووبەرانە بچووک بکاتەوە، کۆنەپارێز و داخراوە. ئەو سیستمەی هاریکاریی مرۆڤ دەکات و ئەگەری وەدیهێنانی خودی کەسەکە و سەلماندنی تواناکانی و وەدیهێنانی ئارەزووەکانی و بەدەمەوەچوونی حەزەکانی هەڵگرتووە، سیستمێکە دەبێت خەباتی بۆ بکرێت، ئەوەشی پێچەوانەی ئەمەیە، دەبێت خەباتی دژ بکرێت. بەم جۆرە هۆنێسیش لە یەک کاتدا لە هەستێکی ناوەکییەوە بە خۆشەویستی و لە دانپیانانێکی مافدارانە و یاساییەوە دەست پێ دەکات و لەوانیشەوە بە پێداگرتن لەسەر گرنگیی هاریکاری و مشوورخواردنی کۆمەڵایەتی دەگات. بەم جۆرە ئەمیش لە جیهانی ناوەکیی تاکەکەسەکانەوە دەست پێ دەکات، بۆ ئەوەی دواتر بمانهێنێتەوە ناو ئەو کردە مێژووییانەی پێویستن بۆ گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و ئەو ئاراستانەش دەستنیشان دەکات کە پێویستە کۆشش و خەباتی کۆمەڵایەتی بەرەو ڕوویان بڕوات. لای هۆنێس، ڕێزگرتنی کەرامەتی مرۆڤ لەو سێ ئاستەدا ئەو پێوەرە سەرەکییەیە کە کۆمەڵگەکان و سیستمە سیاسییەکان لە یەکتری جیا دەکاتەوە.

## کەرامەت و فیکری سیاسیی مۆدێرن

لە دونیای ئەمڕۆدا چەمکی کەرامەت بووە بە یەکێک لە چەمکە سەرەکییەکانی ناو فیکر و تیۆرەی سیاسیی هاوچەرخ و زیاد لە زانایەکی کۆمەڵایەتی و زیاد لە تیۆریست و فەیلەسووفێکی سیاسی سەرقاڵی تیۆریزەکردنین. لە لاپەڕەکانی پێشوودا من هەندێک لەو هەوڵانەم بە خوێنەران ناساند، لەم بەشەدا هەوڵ ئەدەم زۆر بەکورتی قسە لەسەر دەرکەوتە سیاسییەکانی چەمکی کەرامەت و "سیاسەتی دانپیانانی یەکسان" بکەم. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە، جارێکی دیکە بۆ هەندێک لە بۆچوونەکانی فەیلەسووفی کەنەدی: چارلس تایلەر دەگەڕێمەوە. تایلەر باس لە دوو شێواز لە سیاسەتی پاراستنی کەرامەت و دانپیانانی یەکسان بە کەرامەتی مرۆڤەکاندا دەکات.

یەکەمیان ئەو جۆرەیە لە سیاسەت کە باس لە بوونێکی گەردوونیی کەرامەتی یەکسان دەکات، کەرامەتێک کە لای هەموو کەسێک لە جیهاندا بە هەمان بڕ و ڕادە ئامادەیە. ئەم سیاسەتە پابەستە بە بوونی وێنەیەکی گەردوونییەوە بۆ مرۆڤ، کە تیایدا ئینسانی هەموو کۆمەڵگەکان و هەموو ناوچەکانی دونیا، بەبێ گوێدانە دین و کولتوور و بەها سیاسی و ئەخلاقییە تایبەتەکانیان، وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەتی یەکسان دەبینێت و نمایش دەکات. دەرکەوتە سیاسییەکەی ئەم وێنە گەردوونییە، پێداگرتنە لەسەر بوونی مافی یەکسان

بۆ هەرکەسێک لە هەر شوێنێکی دونیادا، پێداگرتنیش لەسەر هاوولاتیبوونی یەکسان و ئەندامبوون لە یەک مرۆڤایەتیدا، بنەما سیاسی و ئەخلاقییەکانی تری ئەم ڕوانینەیە.

جۆری دووهەمیان سیاسەتی دانانە بە جیاوازیی نێوان مرۆڤ و کولتوور و کۆمەڵگەکاندا بە شێوەیەک، هەر تاکەکەس و گروپ و کۆمەڵگەیەک بتوانێت جیاوازبوونی خۆی بەو شێوەیە بژی کە خۆی بە بەشێکی گرنگ و سەرەکیی شووناسی خۆی دەزانێت. ئەم سیاسەتە لەسەر پێداگرتن لەسەر نەبوونی مۆدێلێکی گەردوونی بۆ مرۆڤبوون کار دەکات، کە بیەوێت خۆی وەک جۆری هەرە ڕاست و هەرە تەواو و هەرە کامڵی مرۆڤبوون وێنا بکات و لە ڕێگەی بەراوردکردنیش بە خۆیەوە شێواز و دەرکەوتەکانی تری مرۆڤبوون بپێوێت. واتە ئەم جۆرە سیاسەتە لەسەر نەفیکردنی بوونی وێنەیەکی گەردوونیی یەکگرتوو و هاوشێوە بۆ مرۆڤ کار دەکات، کە وەک وێنەیەکی پێوانەیی ئامادە بێت و بە پێوانەی دووری و نزیکی لەو وێنەیەوە دووری و نزیکی لە مرۆڤبوونەوە بپێورێت. ئەم ڕوانینە لەو دیدەوە سەرچاوە دەگرێت، کە پێی وایە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا جۆرێک لە کولتوور و دین و سیستمی بەها و شێوازی ڕوانین باڵادەست و خاوەن هەیمەنەیە، کە بەسەر یەکەوە وێنەیەکی تایبەتی مرۆڤبوون باڵادەست دەکەن تایبەت بەو کۆمەڵگەیە. ئەم وێنەیە دەشێت جیاواز بێت لە وێنەی مرۆڤبوون لە کۆمەڵگەیەکی دیکەدا، بەڵام ئەم جیاوازبوونە نابێت ببێتە هۆی بێڕێزیکردن بەرامبەر بە کەرامەتی ئینسان. ئەوەی لەم سیاسەتەدا باڵادەستە، ڕێزگرتنی شێوازە

جیاوازەکانی مرۆڤبوونە لە کۆمەڵگە جیاوازەکاندا، پاراستنی کەرامەتی ئەو فۆرمانەی مرۆڤبوونە کە لەگەڵ شێوازی تری مرۆڤبوون و پێناسەی تری کەرامەت لە کۆمەڵگەیەکی دیکەدا یەک ناگرێتەوە.

ئەم دیدە بۆ جیاوازی لەسەر ڕوانینێک بۆ کۆمەڵگە و هەیمەنە دروست بووە کە هەم خودی کۆمەڵگە و هەم دیاردەی هەیمەنە لەو کۆمەڵگەیەدا وەک دوو پێدراوی ناجێگیر و پرجووڵە و پڕئەگەر و توانای گۆڕانکاری وێنا دەکات. ئەوەی لە سەردەمێکدا باڵادەستە، مەرج نییە لە سەردەمێکی تردا باڵادەست بێت، ئەوەی ئەمڕۆ لەو کۆمەڵگەیەدا وەک شێوازی باڵادەستی مرۆڤبوون و پێناسەی سەرەکیی کەرامەت دەر دەکەوێت، مەرج نییە سبەینێ بە هەمان ماناوە ئامادە بێت. بۆیە دۆخی تەندروست ئەو دۆخەیە کە مۆدێلی ڕەها و شێوازی ڕەهای مرۆڤبوونی تیادا دروست نابێت و شێوازە جیاوازەکانی مرۆڤبوون وەک شێوازی شاز و نەشیاو مامەڵە ناکات. لەم دۆخەدا ناهێڵدرێت شێوازێکی باڵادەستی مرۆڤبوون ببێت بە ئامرازێک بۆ بێدەنگکردن و پەراوێزخستن و لەناوبردنی شێوازەکانی تری مرۆڤبوون. پێناسە باڵادەستەکەی کەرامەت نابێتە هۆی لەناوبردنی ڕوانینی تر بۆ کەرامەت کە لەگەڵ ئەو پێناسە باڵادەستەدا یەکانگیر نییە. لەم ڕوانینەدا هیچ دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی مرۆڤبوون وەک دەرکەوتی ساختە و ناڕاست و بێمانا مامەڵە ناکرێت، هیچ مرۆڤێک وەک مرۆڤی هەڵە و ناڕاست و نەشیاو نابینرێت، مرۆڤبوونی هیچ کەسێک وەک مرۆڤبوونێکی نوقسان نانرخێندرێت و مامەڵە ناکرێت.

ئەمە ئەو مەرجانەیە کە پێویستە کەرامەت وەک چەمکێک دەستەبەریان بکات و بەرگرییشیان لێ بکات.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە، با سەرنجێکی خێرا لە کۆمەڵگەی خۆمان بدەین، بە بۆچوونی من، لە کۆمەڵگەی ئێمەدا زۆر جار تەنها وێنەیەک بۆ مرۆڤبوون باڵادەستە و شێوازەکانی تری مرۆڤبوون لە پەیوەندیدا بەو وێنە پێوانەییەوە دەپێورێت و دەنرخێندرێت. دووری و نزیکی لەو وێنە پێوانەییەوە دەستنیشانی جۆرە شیاو و نەشیاوەکانی مرۆڤبوون دەکات. با لە ڕێگەی ڕوانین بۆ ژنەوە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، ئەم خاڵە و ئەو وێنە پێوانەییە ڕوون بکەینەوە کە باسی دەکەم. لە کۆمەڵگەی ئێمەدا و لە زۆرێک لەو کۆمەڵگەیانەشدا کە لە کۆمەڵگەی ئێمە دەچن، زۆر جار ژن وەک سێبەری پیاو، یان وەک پیاوێکی نوقسان، یان شتێک کەمتر لە پیاو وێنا دەکرێت. وێناکردنی باڵادەست بۆ مرۆڤبوون وێناکردنی پیاوە و ئەوەی پیاو نەبووە مرۆڤبوونی نوقسانی و شەبەقێکی گەورە یان بچووکی تێدایە. مرۆڤبوونی ژن لەم دۆخەدا وەک ئەو جۆرە لە مرۆڤبوون دەبینرێت کە کەمترە لە مرۆڤبوونی پیاو. واتە هەر لە بنەڕەتەوە دیدێکی پێوانەیی و هەرەمی بۆ ڕیزبەستی نایەکسانیی شێوازە جیاوازەکانی مرۆڤبوون هەیە. شێوازی باڵادەستی مرۆڤبوون تەنها یەک جۆر مرۆڤبوون دەکاتە پێوەری هەموو جۆرەکانی تری مرۆڤبوون، کە مرۆڤبوونی پیاوە. لەم دۆخەدا هەموو شێوازەکانی تری مرۆڤبوون، بە حوکمی ئەوەی مرۆڤبوونی نوقسان و کەمن، خاوەنی کەرامەتی کەمتریشن.

بەکورتی، سیاسەتی بەرگریکردن لە مرۆڤبوونی

جیاواز، سیاسەتێکە تەنها کاتێک دەکرێت ببێتە بنەمایەک بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی پڕکەرامەت، کە پێشتر چوارچێوەیەکی یاسایی و دەزگایی و ئەخلاقی و کولتووری هەبێت، بتوانێت و بیەوێت جیاوازییەکان نەک تەنها بپارێزێت، بەڵکو هەموویان بە هەمان شێوە مامەڵە بکات و بە هەموویان لە خاڵی سەرەتادا یەک نرخ ببەخشێت. بەکورتی، سیاسەتی جیاوازی کاتێک دەتوانێت بێمەترسی و بێزیان بێت، کە پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان ماف و جیاوازیدا دروست بکات.

## "بەهاری عەرەبی" و مەسەلەی کەرامەت

هیچ ڕووداوێک لەو ناوچەیەی ئێمەدا بە ئەندازەی "بەهاری عەرەبی" چەمکی کەرامەتی بە شێوەیەکی بەرفراوان نەهێنایە ناو کردە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکانەوە و کەرامەتی نەکرد بە بەشێک لەو زمانە سیاسییە کە مرۆڤی ئەم ناوچەیە بەکاری دەهێنێت بۆ داڕشتنی داواکارییە سیاسییەکانی. کە سەرەتای ساڵی ٢٠١١ مرۆڤە توورەکانی دونیای عەرەب چوونە سەر شەقامەکان و بە ڕووی دەسەڵاتدارانی وڵاتەکانیاندا تەقینەوە، زۆرینەیان هەڵگری درووشمێک بوون، کە سێ داواکاریی سەرەکیی لە خۆی دەگرت، داواکاریی دابینکردنی "نان و ئازادی و کەرامەت،" کە لە داڕشتنەوە سیاسییەکەیدا مانای دابینکردنی "دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و ئازادی و کەرامەت." ئەمە یەکەم جار بوو ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی ناوچەکە درووشمی پاراستنی

کەرامەت بەو شێوە ئاشکرایە بەرز بکەنەوە، یەکەم جار بوو کەرامەت ببێتە داواکارییەک لەپاڵ ئازادی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتیدا. لە پەیوەندیدا بەم نووسینەوە، هەوڵ ئەدەم زۆر بەکورتی لەسەر داواکاریی دووهەم و سێهەم بوەستم، واتە لەسەر مەسەلەی دابینکردنی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و کەرامەت بۆ مرۆڤەکان و قسەکردن لەسەر مەسەلەی ئازادی هەڵدەگرم بۆ دەرفەتێکی تر.

ئاشکرایە مەسەلەی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی لەو ناوچەیەی ئێمەدا، بە پلەی یەکەم، مەسەلەیەکە پەیوەست بە چەوساندنەوەیەکی قووڵ و فرەلایەنی ئابوورییەوە، ئەو نارێکی و نایەکسانی و نادادپەروەرییە گەورەیە بەرجەستە دەکات کە لە دابەشکردنی سەروەت و سامانی نیشتیمانیدا ئامادەیە و بە هۆیەوە ژیانی بەشێکی زۆری دانیشتووانی ئەم وڵاتانەی کردووە بە دۆزەخێکی ڕاستەقینە. مرۆڤی ئەم ناوچەیە زۆر جار توانای دابینکردنی سێ ژەم خۆراکی لە ڕۆژێکدا نییە، داهاتی ڕۆژانەی هەندێک جار تەنها دوو دۆلاری ئەمەریکییە، لە خانوویەکی یەکژووریدا دەژی کە هەندێک جار هەشت تا دە کەسی تێدایە. ڕۆژی ئیشکردنی ئەم جۆرە کەسە هەندێک جار نزیکەی ١٦ کاتژمێرە. لەپشتی بەرزکردنەوەی درووشمی دادپەروەریی کۆمەڵایەتییەوە تەنها پێداگرتن لەسەر نارێکییەکی ترسناک لە دابەشکردنی سامانی نەتەوەییدا ئامادە نییە، بەڵکو ئاماژەش بۆ غیابێکی پڕ مەترسیی چەمکی هاووڵاتیی یەکسان و خاوەنماف دەکات، کە لەناو سیستمێکی حوکمڕانیدا کە نە ڕێزی یاسا دەگرێت و نە ڕێزی ماف و نە ڕێزی مرۆڤ خۆشی. لەناو ئەم

جۆره سیستمەدا هەموو ئەو شتانە ڕوو دەدەن کە قابیلی ڕوودان نین و هەموو ئەو خراپەکارییانە ئەنجام ئەدرێن کە مرۆڤ باوەڕ ناکات ڕوو بدەن.[1] غیابی دادپەروەری، ڕووی ئەودیوی دونیایەکی گەندەڵی پڕ دزی و جەردەیی و فێڵ و گزی و فزیی ئاشکرا و نهێنییە، جۆرێکە لە ئابووریی مافیایی، کە بەردەوام هەژاریی زیاتر و مرۆڤی تێکشکاوی زیاتر بەرهەم دەهێنێت. بەم مانایە، بەرزکردنەوەی درووشمی دادپەروەری ئاماژە بۆ چەوساندنەوەیەک دەکات کە زیاترە لە چەوساندنەوەیەکی ئابووریی بەتەنها، ئەگەرچی ئەو چەوساندنەوە ئابوورییەی لە دونیای عەرەبی و ناوچەکەدا ئامادەیە، بێوێنەیە لە دونیادا. وەک ئابووریناسی فەرەنسی تۆماس پیکێتی دەڵێت، نایەکسانی لە هیچ شوێنێکی دونیادا بە ڕادەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست گەورە نییە، ئەم ناوچەیە خراپترین ناوچەی دونیایە لە مەسەلەی یەکسانیی نێوان بەشە جیاوازەکانی دانیشتوواندا.[2] بەشێکی گرنگی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە نەک تەنها بێئیشن، بەڵکو بڕێکی زۆری ئەوانەشی کە ئیشیان هەیە، ئەوەی پەیدای دەکەن،

---

١_بۆ وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵگەی میسری لە سەردەمی حوکمڕانیی موبارەکدا، بڕوانە ئەم کتێبەی نووسەری میسری جەلال ئەمین، بەتایبەتی بەشی یەکەمی کتێبەکە (ل١١-٧٨) کە باسێکی درێژە لەسەر ئەخلاقیات و کاروکردەوەکانی نوخبەی بالادەست لەو ولاتەدا: جلال امين. مادا حدث للتوره المصريه؟ اسباب توره ٢٥ يناير و دواعي الامل و القلق و افاق المستقبل. دار الشروق.

٢_بڕوانە ئەم وتارە بە زمانی ئینگلیزی کە ئەم ڕوانینەی تۆماس پیکێتی بەرجەستە دەکات: https://www.washingtonpost.com/news/wonk/wp/2015/11/30/why-inequality-is-to-blame-for-thc-rise-of-thc-islamic-statc/?postshare=7731448995247434&tid=ss_fb

بەشی دابینکردنی پێداویستییە هەرە سەرەتاییەکان و هەرە بنەڕەتییەکانی ژیانیان ناکات.

ئامارەکانیش ئاماژە بۆ دۆخێکی قەیراناویی زەحمەت دەکەن، بۆ ئەوەی بکرێت هاریکاریی گەنجانی ئەم وڵاتانە بکرێت بۆ ئەوەی ببنە خاوەن کار پێویستە تا ساڵی ٢٠٢٠ دروستکردنی ٥٠ ملیۆن هەلی کار دروست بکرێت، ئەمە لەناو ئابوورییەکدا کە بەشێکە لە ئابووریی نیولیبراڵی بەجیهانیبوو کە لەسەر بازرگانی، زۆر جار قاچاغ و نایاسایی، بەندە و بە لۆژیکی بەدەستهێنانی قازانجی خێرا بۆ نوخبەیەکی بازرگانیی سیاسیی سەربازیی بچووک کار دەکات. ئەم دۆخە وای کردووە لە سەددا چلی ئەوانەی لە دونیای عەرەبدا بڕوانامەی دواناوەندی و زانکۆیان هەیە، بێکار بن.[1] ئەمە جگە لەوەی کە داهاتی ڕۆژانەی بڕێکی بەرچاوی خەڵکی ئەو ناوچەیە لەنێوان دوو بۆ سێ دۆلارە لە ڕۆژێکدا، لە کاتێکدا ژمارەیەکی کەم لە ملیۆنێر و ملیارلێردەکانی ئەم ناوچەیە تا دێت سەرمایەکانیان گەورەتر و توانا ئابوورییەکانیان قەبەتر دەبێت. بەرزکردنەوەی درووشمی دابینکردنی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، هەوڵدانە بۆ دەرچوون لەو دۆخە نائینسانییە و سڕینەوەی بڕێک لەو جیاوازییە مادديیە گەورانەی گروپە لاواز و هەژارەکانی ئەو کۆمەڵگەیانەی لە گروپە بەهێز و دەوڵەمەندەکان جیا کردۆتەوە. وەڵام بەم دۆخە بریتییە لە پیادەکردنی سیاسەتێکی نوێ کە خۆی لە سەرلەنوێ دابەشکردنەوەیەکی دادپەروەرانەی سەروەت

1_Filiu, Jean-Pierre (2011). **The Arab Revolution: Ten Lessons from the Democratic Uprising.** Oxford University Press. P32-33.

و سامانی نیشتیمانیدا بەرجەستە بکات، دابەشکردنێک، ڕێ لە گەورەبوونی بۆشاییی نێوان هەژاران و دەوڵەمەندانی وڵاتەکان بگرێت و کۆتایی بهێنێت بەو میکانیزمانەی هەژاران هەژارتر و دەوڵەمەندان دەوڵەمەندتر دەکەن. ئەگەر سەرلەنوێ دابەشکردنەوەیەکی دادپەروەرانەی سەروەت و سامانی نیشتیمانی وەڵام بێت بە مەسەلەی غیابی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی لە ئاستە ئابووری و ماددییەکەیدا، ئەی باشە مەسەلەی کەرامەت چۆن چارەسەر دەکرێت؟ ئایا دابەشکردنەوەیەکی دادپەروەرانەی سەروەت و سامانی نیشتیمانی مانای دەستەبەرکردن و پاراستنی کەرامەتی مرۆڤەکان دەگەیەنێت؟ وردتر بدوێین، ئایا ئەم سەرلەنوێ دابەشکردنەوەیەی سەروەت و سامانی نیشتیمانی بەسە بۆ ئەوەی چارەسەری کێشەی بێکەرامەتکردنی مرۆڤی ئەم ناوچەیە بکات؟

بە گەڕانەوە بۆ چەمکی دانپیانان چ لای چارلس تەیلەر و چ لای هۆنێکس، دەکرێت وەڵامی ئەو پرسیارە بە نەخێر بدەینەوە. نەخێر چارەسەرکردنی مەسەلەی کەرامەت لە دونیای ئێمەدا تەنها بە سەرلەنوێ دابەشکردنەوەیەکی دادپەروەرانەی سەروەت و سامانی نیشتیمانی جێبەجێ نابێت، ئەگەرچی ئەم دابەشکردنە هەنگاوێکی گرنگە بەو ئاراستەیەدا. وەڵام بە کێشەی بریندارکردن و پێشێلکردنی کەرامەتی مرۆڤەکانی ئەم ناوچەیە تەنها بە سیاسەتێکی ئابووریی نوێ جێبەجێ ناکرێت، تەنها بەوە نابێت کار بۆ خەڵک بدۆزرێتەوە و مووچەی مانگانەیان زیاتر بکرێت، بەڵکو پێویستی بە سیاسەتێکی نوێی دانپیانانیش هەیە،

سیاسەتێک، کە دان بە مرۆڤبوونی مرۆڤەکاندا بنێت بەو شێوەیەی کە هەن و بەو شێوەیەی دەیانەوێت ببن. واتە مرۆڤەکان وەک بوونەوەری خاوەنڕێز و خاوەنماف و خاوەنبەها و خاوەننرخی تایبەت، مامەڵە بکات. ئیشکردن لەسەر گەورەکردنی ڕێزی مرۆڤ بۆ خۆی و ڕێزی کۆمەڵگە و دەزگاکان بۆ مرۆڤ، بەشێکی سەرەکیی ئەو سیاسەتی دانپیانانەیە کە ئەم ناوچەیە پێویستی پێیەتی. بە وتەی فەیلەسووفی ئیسرائیلی، ئەڤیشای مارگەلیت، پاراستنی کەرامەت لە ڕێگەی دروستکردنی کۆمەڵگەیەکەوە دەبێت، کە ئەو ناوی "کۆمەڵگەی بەحورمەت"ی لێ دەنێت- The decent society. لای ئەم فەیلەسووفە، "کۆمەڵگەی بەحورمەت" کۆمەڵگەیەک نییە تیایدا دادپەروەری و یەکسانی بەرقەرار کراوە، یەکسانی و دادپەروەری ئەو پێوەرانە نین کە کۆمەڵگەی بەحورمەت لە کۆمەڵگە بێحورمەتەکان جیا دەکاتەوە. ئەوەی ئەم کارە دەکات، چۆنێتیی هەڵسوکەوتی دەزگاکانە، لە کۆمەڵگەی بەحورمەتدا دەزگا گرنگەکانی کۆمەڵگە ناتوانن سووکایەتی بە مرۆڤەکان بکەن و ناتوانن ئیهانە و بێڕێزییان بەرامبەر بکەن و وەک مرۆڤی بچووک و بێبایەخ مامەڵەیان بکەن.[1] مارگەلیت "کۆمەڵگەی دادپەروەر" بە کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتووتر و ئینسانیتر دەزانێت لە "کۆمەڵگەی بەحورمەت،" مرۆڤ بۆ ئەوەی بە کۆمەڵگەیەکی دادپەروەر بگات، پێویستە سەرەتا کۆمەڵگەیەکی بەحورمەتی دروست کردبێت. بۆیە ئەگەر

1_Margalit, Avishai (1998). The decent society. USA: Harvard University Press.

نەکرێت ڕاستەوخۆ کۆمەڵگەیەکی دادپەروەر دروست بکرێت، ئەوا پێویستە هەوڵە کۆمەڵایەتی و سیاسی و یاساییەکان چڕ بکرێنەوە بۆ دروستکردنی "کۆمەڵگەیەکی بەحورمەت." کۆمەڵگەیەک دروست بکرێت، تیایدا بەهێز لاواز و دەزگاکان خەڵک وەک بوونەوەری بێنرخ و بچووک مامەڵە نەکەن. وەک وتم، "کۆمەڵگەی دادپەروەر،" قۆناغێکی پێشکەوتووترە لە کۆمەڵگەی بەحورمەت لە ڕووی گەشەی کۆمەڵایەتییەوە، ئەو قۆناغەیە کە تیایدا "کۆمەڵگەی بەحورمەت" گەشەی زیاتر دەکات و دەگۆڕێت بۆ "کۆمەڵگەی دادپەروەر." من لێرەدا سەروکارم لەسەر ئەم تەقسیمبەندییەی مارگەلیت نییە و باس لەوە ناکەم ئایا ئەو جیاکارییە لەنێوان ئەو شێوازە لە کۆمەڵگەدا ڕاستە یان نا، ئەوەی لە بۆچوونەکانی ئەم فەیلەسووفە جوولەکەیەدا بەلامەوە گرنگە، پێداگرتنیەتی لەسەر "حورمەت" یان ڕێز وەک دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی کەرامەت و پاراستنی ئەم کەرامەتەش لە ڕێگەی دروستکردنی کۆمەڵگەیەکەوە، دەزگا ڕەسمییەکان تیایدا نەتوانن و بۆیان نەبێت بێڕێزی و سووکایەتی بەرامبەر بە مرۆڤەکان بکەن. لەوانە بۆ نموونە، دەزگانی پۆلیس و لەشکر و ئاسایش و دەزگا ئیدارییەکان و دەزگاکانی حوکمڕانی و دەزگا بیرۆکراسییەکان بۆیان نەبێت ئیهانە بە مرۆڤ بکەن، وەک شتێکی بێنرخ و بێمانا مامەڵەیان بکەن. کۆمەڵگە دەکرێت هەژار بێت و توانای دابینکردنی ژیانێکی ئینسانیی تەواوی بۆ هەموو تاکەکەسەکان نەبێت، بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە نەتوانێت کۆمەڵگایەک بێت، سەرەڕای هەژارییەکەی، کەرامەتی

مرۆڤەکانی نەپارێزێت و دەزگاکانی مرۆڤ وەک دەعبا و نەخۆشییەک مامەڵە بکەن. دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی لەو باباتە، بەوە دەبێت مەسەلەی ڕێز و کەرامەت گۆڕابن بۆ مەسەلە سەرەکییەکانی ئەو کۆمەڵگەیە و سیاسەتێک و سیستمێک لە دەزگا ئەو کۆمەڵگەیە بەڕێوە ببات، پاراستنی کەرامەت و ڕێزگرتنی مرۆڤ بنەما ئەخلاقی و بەهایی و یاساییەکەی بێت.

ئەوەی لە دونیای عەرەب و دونیای ئێمەشدا غائیبی ژمارە یەکە، سیاسەتی پاراستنی کەرامەتی مرۆڤەکانی ئەو دونیایەیە، نائامادەگیی سیاسەتی دانپیانانە بە مرۆڤبوونی مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی بایەخدار و مانادار، غیابی وێناکردنی ڕێزگرتنی مرۆڤە وەک ماف، نەبوونی سیاسەتی دانانی ڕێزە بۆ دانیشتووان، بوون و ئامادەگیی دەیەها دەزگایە کە دەتوانن هەموو جۆرە سووکایەتییەک بە مرۆڤ بکەن. سەپاندنی بەزۆری شووناس و شێوەزمان و زەوق و چێژ و دین و تەنانەت جلوبەرگە بەسەر ئەو کۆمەڵگەیانەدا کە لەناو خۆیاندا پڕن لە جیاوازی. ئامادەگیی سیاسەتێکی لێپرسینەوەی پڕ سووکایەتیکردن بەرامبەر بەوانەی ئەو کۆدە سەرەکییانە پەیڕەو ناکەن، بەشێکی بەرچاوە لەو سیاسەتی بێڕێزی و بێحورمەتیکردنە بەردەوام و ڕۆژانەییەی بەرامبەر بە خەڵک و کۆمەڵگەکانی ئەم ناوچەیە پیادە دەکرێن. دونیای عەرەبیی کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم، دونیایەکە پڕ لە جیاوازی، پڕ لە هێز و گرووپی کۆمەڵایەتیی جیاواز، دینی جیاواز، نادین و دونیاگەراییی جیاواز، گرووپی ئەتنیی جیاواز، چین و توێژی کۆمەڵایەتیی جیاواز، زمان و دیالێکتی جیاواز، زەوق و حەز و

چاوەڕوانیی جیاواز، هتد... نەبوونی سیاسەتێک بۆ داننان بەم جیاوازییانەدا و پێداگرتن لەسەر کۆکردنەوەی بەزۆریان لەناو سیستمێکی ئەخلاقی و فەرهەنگیی بەزۆر سەپێندراو و لەناو چوارچێوەیەکی سیاسیی و دەزگاییی ئیهانەکار، ژێرخانی ئەو سیاسەتی بێڕێزی و شکاندنی کەرامەتە بەربڵاوەیە کە لە دونیای عەرەبیدا ئامادەیە. داننان بەو جیاوازییانەدا بەشێکی گرنگی داننانە بە مرۆڤبوونی ئەو ژمارە زۆرەی مرۆڤدا کە لەو ناوچەیەدا دەژین. ئەم داننانەش مانای داننان بە حەز و ویست و چێژ و خەون و کولتوور و شێوەژیان و سروتە تایبەتەکانی ئەواندا و ڕێزگرتن و نرخاندنی ئەو جیاوازییانە وەک بەشێکی گرنگ لە شووناسی ئەو کەسانە. داننان بەم جیاوازییانەدا بەوە نابێت سەروەت و سامانی نیشتیمانی بە شێوەیەکی دادپەروەرانە سەرلەنوێ دابەش بکرێتەوە، بەوەش نابێت کار بدۆزرێتەوە بۆ بێکارەکان و مووچە بۆ موچەدارەکان زیاد بکرێت، بەڵکو بەوە دەبێت، دان بەو جیاوازییانەدا بنرێت و ڕێزیان لێ بگیرێت و وەک بەشێک لە شووناسی مرۆڤەکان تەماشا بکرێت. ئەو جیاوازییانە نەک نەچەپێندرێن، بەڵکو وەک دەرکەوتێک لە دەرکەوتە زۆرکانی مرۆڤبوون و شێوە جیاوازەکانی "بوون لەناو ژیان" و "بوون لەناو دونیا" و "بوون لەناو کۆمەڵگە"دا تەماشا بکرێن. وەک دەبینین، ئەوەی پێویستە تەنها سیاسەتی سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سەروەت و سامانی نیشتیمانی نییە، بەڵکو داهێنانی سیاسەتێکی نوێی دانپیانانی کۆمەڵایەتیشە. بەتایبەتی لە دونیایەکدا، کە تا دێت ڕووبەری جیاوازییە کولتووری و شووناسی و شێوەژیانەکانی ناوی، تا دێت ئاڵۆزتر دەبێت، دونیایەک پڕ لە کەناڵی پەیوەندیی

هەمەجۆر بە بەشەکانی تری دونیاوە و پڕ لە وێنەی نوێ و شێوەژیانی نوێ و حەز و زەوق و چێژی نوێ، دونیایەک پڕ لە شووناسی نوێ. ئەوەی پێویستە سیاسەتی داننانە بەم شووناسە تازانەدا و بەو شێوازانە لە مرۆڤبووندا، کە لەگەڵ شێوازە باڵادەستەکاندا ناگونجێت. ئەمە جگە لە ناچارکردنی دەزگا گرنگ و گەورەکان بەوەی پەیڕەوی کۆمەڵێک کۆدی ئەخلاقی و یاسایی بکەن، کە نەتوانن و بۆیان نەبێت مرۆڤەکان ئیهانە و بریندار بکەن.

لەم گۆشەنیگایەوە مەسەلەی کەرامەت تەنها پەیوەندیی بە بواری ئابوورییەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە بواری یاسایی و کولتووری و سیاسەتی ڕەمزییشەوە هەیە، کەرامەت لێرەدا کەمتر پابەستە بە پارە و سەرمایەوە و زیاتر پەیوەستە بە دانپیانانی یاسایی و کۆمەڵایەتییەوە. کە ئەمە دەڵێم، نامەوێت نکووڵی لەو ڕاستییە سادەیە بکەم، کە دابینکردنی کار و بژێوی بۆ مرۆڤەکان، سەرەتای سەرەتاکانە و لە نەبوونی ئەوانەدا کەرامەتی مرۆڤ بە شێوەیەکی بوونیادی بریندارە. ئەوەی دەمەوێت بەرگری لێ بکەم، ئەوەیە کە کەرامەت کورت ناکرێتەوە بۆ ڕەهەندە ئابوورییەکەی بەتەنها، چونکە پاراستنی کەرامەت پەیوەندییەکی بەهێزیشی بە مەسەلەی ڕێزگرتن لە بەها و نرخ و کولتوور شێوەژیانی تاکەکان و گروپەکانەوە هەیە. ئەمەش مانای ئەوەیە، پاراستنی کەرامەت کەمتر مەسەلەی چەوساندنەوەی ئابووری و زیاتر مەسەلەی چەوساندنەوەی کولتووری و بەهایی و ئەخلاقییە. ئەم شێوازەش لە چەوساندنەوە، بە مانای ڕێزنەگرتنی دین و نادین و بەها و چێژ و ئەخلاق و شووناس و شێوەژیانی

ئەو گروپانەی کە یان کەمینەن، یان جیاوازن لە کولتووری زۆرینە، یان لا دەدەن لە داخوازییەکانی کولتووری باڵادەست لە کۆمەڵگەدا. ئەم خاڵەیە وا لە من دەکات بەرگری لەو تێزە بکەم کە مەسەلەی سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سەروەت و سامانی نیشتیمانی بەتەنها ناتوانێت چارەسەری کێشەی کەرامەت بکات. چارەسەری ئەم کێشەیە پەیوەستە بە داهێنانی سیاسەتێکی نوێی دانپیانانی کۆمەڵایەتییەوە، سیاسەتێک دان بە ماف و بوونی ئەو بەها و نرخ و شێوەژیان و شووناسە ڕەمزییە جیاوازانەدا بنێت، کە دەشێت بەشێک نەبن لە ژیان و کولتووری باڵادەست. ئەمەش مانای داهێنانی سیاسەتێک لەباتی کوشتنی جیاوازی و لەناوبردنی، جیاوازییەکان بپارێزێت و بەرگرییان لێ بکات و دانیان پیا بنێت. بەکورتی، ئەگەر بۆ چارەسەرکردنی نادادپەروەریی کۆمەڵایەتی سیاسەتی نەهێشتنی جیاوازیی ئابووری و سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سەروەت و سامانی نیشتیمانی پێویست بێت، ئەوا بۆ چارەسەری کێشەی کەرامەت پاراستن و هێشتنەوەی جیاوازی و سیاسەتی داننان بە جیاوازییەکاندا پێویستە.

## دەرەنجام

کەرامەتی ئینسان مەسەلەیەکی بنەڕەتیی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و سیاسی و کولتوورییە و ئاماژە بۆ ئەو نرخ و بەها و شێوازی ڕێزگرتنە دەکات کە لە کۆمەڵگەدا بۆ مرۆڤەکان وەک مرۆڤ ئامادەیە. لەپشتی چەمکی کەرامەتەوە

داخوازیی ڕێزگرتن لە مرۆڤ و داننان بە مرۆڤبوونی مرۆڤدا وەک بەهایەکی گەورە و پاراستن و پۆزەتیڤ نرخاندنی جیاوازییەکان ئامادەیە. لەم وێناکردنەی مرۆڤدا دوو مەسەلە سەرەکی و بنەڕەتین لە پێناسەکردنی کەرامەتی مرۆڤدا.

یەکەمیان ڕێزگرتنە لە مرۆڤ وەک مرۆڤ، وەک بەهایەکی موجەرەد و ئەبستراکت، وەک بوونەوەرێک، دابڕا و لە ئینتیمای دینی و ئەتنی و نەتەوەیی و چینایەتی و کولتووری، مرۆڤ لە ڕووتبوونی وجودییانەی خۆیدا، مرۆڤ وەک شووناسێکی تایبەت، کە دەربڕی پەیوەندیی مرۆڤە بە مرۆڤبوون خۆیەوە، نەک پەیوەندیی بەم یان بەو هێزی کۆمەڵایەتی و گروپی ئەتنی و دینی و نەتەوەییەوە. ماناکانی کەرامەت لێرەدا لەو مانا "کانتی"یانەوە نزیکە کە من لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسم کردن، کەرامەت وەک بەشێک لە پێکهاتەی ناوەکیی ئینسان و وەک دەرکەوتێک لە دەرکەوتە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی مرۆڤبوون. لەم ئاستەدا چەمکی کەرامەت چەمکی بەرگریکردنە لە مرۆڤ و وەک چۆن چەمکی سەلماندنی مانا پۆزەتیڤ و ڕووە پۆزەتیڤەکانی نرخاندنی مرۆڤ و مرۆڤبوونە. واتە لەناو دەستەواژەی مرۆڤ خۆیدا بیرۆکەی ڕێزگرتنی مرۆڤ و داننان بە مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی بەهادار و ئەبستراکت ئامادەیە. ئەم ڕوانینە وا دەکات کەرامەت وەک بەشێک لە مرۆڤبوونی هەموو مرۆڤێک ببینین و مامەڵە بکەین، مرۆڤ وەک ئامانج، مرۆڤ بەدوور لە هەموو بەکارهێنانێکی ئامرازییانە، مرۆڤ وەک سەرەتایەکی ڕەها.

دووهەمیان مەسەلەی دابینکردنی ئاستێکی تایبەتی ڕێز و دانپیانانی کۆمەڵایەتی و ژیانی ماددییە، ئینسان بتوانێت لە

ڕێگەیانەوە هەم باوەڕی بە خۆی وەک مرۆڤ بەهێز بێت، هەم ڕێزگرتنی بۆ خۆی وەک مرۆڤ لە ئاستێکی بەرزدا بێت، هەم بشتوانێت پێداویستییە سەرەکییەکانی دابینکردنی ژیانێکی مرۆڤانە مەیسەر بکات. هەموو ئەمانە بەبێ ئەوەی ناچار بکرێت سازش لەسەر ویست و حەز و خواست و خەون و ئارەزووەکانی بکات. بەم مانایە کەرامەت مانای بوونی ماف، بوونی ڕێز، بوونی ئاساییشی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی، بوونی شانسی یەکسانیی پێشکەوتن، ڕێگرتن لە هەڵاوێردن و پەراوێزخستنی بەئەنقەست، مامەڵەنەکردنی مرۆڤ بە شێوەیەکی توندوتیژ و تێوەگلاو لە سووکایەتیپێکردن و ئیهانەکردن و هتد... ئەوەی ئینسانە جیاوازەکانی ناو بەشە جیاوازەکانی جیهان دەکات بە بەشێک لەو گشتە گەورەیەی ناوی مرۆڤایەتییە، بوونی ئەو شتەیە کە ناوی کەرامەتی مرۆڤیان لێناوە، کەرامەتێک بۆ هەمووان و لە هەموو شوێنێکدا وەک یەکە. هەموو هەڵسوکەوتێک بەرامبەر بە ئینسان بە مەبەستی هەژارکردنی، یان بچووککردنی، یاخود بێڕێزکردنی، یان ناچارکردنی، یان نانبڕین وماڵوێرانکردنی، خستنەژێرپێیەکی ڕاستەوخۆ و ترسناکی کەرامەتی مرۆڤە، مامەڵەنەکردنیەتی وەک ئینسان، ژێرپێخستنی ئەو بەشەیە لە بوونی ئینسانی کە ئینسان دەکات بە ئینسان.

لەگەڵ لەدایکبوونی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤدا لە ساڵی ١٩٤٥دا، ئیتر مەسەلەی پاراستنی کەرامەتی ئینسان دەبێت بە بابەتێکی گەردوونی و کەرامەت خۆشی دەبێت بە شتێک ئینسان لەگەڵ لەدایکبوونیدا هەڵگریەتی. لەو جاڕنامەیەدا مرۆڤ لەگەڵ لەدایکبوونیدا وەک مرۆڤێکی یەکسان و

خاوەنکەرامـەت لەدایـک دەبێت، وەک بوونەوەرێـک کـە پلـە و ڕادە و ئاستێکی دیاریکراوی نرخ و بەها و مشوورخواردن داوا دەکات و دابینکردنیشـیان وەک بەشـێک لـە کـردەی پاراسـتنی مرۆڤبوونـی مـرۆڤ و وەک مـاف وێنادەکرێت. ئینسـان لەنـاو جاڕنامەکـەدا بوونەوەرێکە بـە کەرامەتـی ئینسـانیانەوە لەدایک دەبێت، هـەم مافـی ئـەوەی هەیـە ڕێـزی لـێ بگیرێـت و هـەم مافی ئەوەشی ژیانێکی شایسـتە بـە مرۆڤی بۆ دابین بکرێت. هـاوکات جاڕنامەکـە پـێ لەسـەر ئـەو خاڵـە دادەگرێـت، کـە مرۆڤـەکان یەکسـانن لـە بـڕ و ڕادە و بوونـی کەرامەتـدا، هیـچ مرۆڤێک کەرامەتـی لـە مرۆڤێکی دیکە زیاتـر یـان کەمتـر نییـە. وەک لـەم نووسـینەدا نیشـانم دا، ئـەم وێناکردنـە بۆ مـرۆڤ و بۆ کەرامـەت، وێناکردنێکی نوێیـە و بەشـێکە لـەو فیکـر و ڕوانیـن و فەلسـەفە ئەخلاقی و سیاسییانەی لـە دونیـای مۆدێرنـدا دێنـە کایـەوە. لـە سـەردەمە کۆنەکانـدا نـە مرۆڤـەکان لەگـەڵ یەکتـردا یەکسـان بوون و نـە کەرامـەت لـە ڕێگـەی لەدایکبوونـەوە شـتێک بـووە هیـی هەمـووان، هەندێـک مـرۆڤ لەوانـی تـر مرۆڤتـر و هەندێکیش خاوەنـی کەرامەتتر و زۆرانێکیش بێکەرامەت بوون. کۆیلەکانـی دونیـای کـۆن، وەک کەسـانێکی خاوەنکەرامـەت وێنـا نەکـراون، لـە ڕاسـتیدا ئـەوان نـەک تەنهـا وەک خاوەنـی کەرامـەت مامەڵـە نەکـراون، بەڵکـو خاوەنـی خۆشـیان نەبـوون، خۆیـان موڵکـی کەسـانی تـر بـوون. لەگـەڵ دروسـتبوونی دونیـای نوێـدا و لەگـەڵ هاتنەکایـەی فیکـری سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و ئەخلاقیـی نوێـدا، ئینسـان، هەمـوو ئینسـانێک، وەک بوونەوەرێکـی خاوەنکەرامـەت وێنـا دەکرێـت. بـەڵام ئـەم بینینـە مانـای ئـەوە نییـە ئیتـر لـە سـەدەی حەڤدەهـەم یـان

هەژدەهەمەوە مرۆڤ لە هەموو شوێنێکدا وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت مامەڵە کراوە. لەنێوان بینینی مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت و لەنێوان مامەڵەکردنیدا وەک بوونەوەرێکی خاوەنکەرامەت، مێژووی سێ سەدە کۆشش و خەبات و یاخیبوونی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی ئامادەیە. تەنانەت لە شوێنێکی وەک ئەمەریکادا، کە یەکێکە لە شوێنە گرنگەکانی لەدایکبوونی دونیای نوێ و دیموکراسیەت و بیرۆکەی ماف و کەرامەت، تا سالانی شەستی سەدەی بیستەم، ڕەشپێستەکان وەک بوونەوەری پلەدوو لەو وڵاتەدا تەماشا و مامەڵە دەکران.

لەو کۆمەڵگەیانەشدا کە لە کۆمەڵگەی ئێمە دەچن و پڕن لە بێدادیی کۆمەڵایەتی و پێشێلکاریی یاسایی و چەوساندنەوەی سیاسی، پڕن لە فشار و چەپاندنی ئەخلاقی و فەرهەنگی و ڕەمزی، لەو کۆمەڵگەیانەدا بریندارکردن و پێشێلکردنی کەرامەتی مرۆڤ یاسایە نەک ڕێکەوت، بەشێکە لە ئاکاری باڵادەست، نەک ڕووداوێکی لاوەکی، لەناو دەزگا باڵادەستەکانەوە دێن نەک شتێک لە پەراوێزەکاندا. کێشەی سەرەکیی کەرامەت لە دونیای ئێمەدا تەنها ئەوە نییە کە بەردەوام بریندار دەکرێت و دەشکێندرێت، بەڵکو ئەوەشە کە زمانێکی سەربەخۆشی نییە بۆ باسکردنی خۆی. مرۆڤی ئێمە، بە ڕۆشنبیرانیشەوە، تا ئەمڕۆ ئەو زمانەیان دروست نەکردووە کە زمانی باسکردن و ڕاڤەکردن و تێگەیشتن بێت لە کەرامەت. ئەوەی هەیە دەنگەدەنگ و هات و هاوار و هەندێک چرپەی بیستراو و نەبیستراوە، بەر لە بوون و گۆڕینیان بۆ زمان و بۆ گووتار. لەمەش

بترازێت، ڕادەی بریندارکردنی کەرامەتی مرۆڤی ئێمە تەنها سیاسەت و دەزگاکانی حوکمڕانی و ئەو سیستمە ئەخلاقیی و فەرهەنگییە سوننەتییە لێی بەرپرسیار نییە کە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا باڵادەستن، بەڵکو برێکی بەرچاوی ئەو زمانەش لێی بەرپرسیارە کە زمانی ڕۆشنبیریی ئێمەیە، زمانێک، لێوانلێوە لە سووکایەتیکردن بە مرۆڤ و پڕە لە شێوازە جیاوازەکانی توندوتیژیی ڕەمزی و لە نارسیسمێکی فەرهەنگیی مەترسیدار. ڕۆحی خۆ بە "گراندایزەر" و "سوپەرمان" زانین، ڕۆحێک نییە تەنها لەناو سیاسەتی کوردیدا ئامادە بێت، بەڵکو بەشێکی بەرچاوی بەشێک لەو سیستمە ڕەمزییەشە کە ژمارەیەک لە ڕۆشنبیران لە دونیای ئێمەدا دروستیان کردوە. زمانی ڕۆشنبیران پڕیەتی لە دەستەواژەی بە گەمژە و جاهیل و گاگەلکردنی کۆمەڵگە و مرۆڤەکان.

کەرامەت بەر لە هەموو شتێک پەیوەندییە، پەیوەندیی مرۆڤە بە مرۆڤەکانی تر و پەیوەندییەتی بە خودی خۆیەوە. پەیوەندییەکە تیایدا نرخ و بەها و قورسایی مرۆڤ وەک مرۆڤ پارێزراوە، مشوورخواردن و گوێپێدان و حیساببۆکردن و دانپیانان بەها سەرەکییەکانیەتی. کەرامەت تەنها نیشاندانی ڕێز نییە، کورت نابێتەوە بۆ ڕێزگرتن بەتەنها، بەڵکو مشوورخواردنێکی بەردەوامیشە بۆ مرۆڤبوونی مرۆڤ، مامەڵەکردنی مرۆڤبوونی مرۆڤە وەک ماتریالێکی ناسک و قابیلی شکاندن و وێرانکردنی خێرا. گرنگیی ڕێز و مشوورخواردن بۆ مرۆڤ لەبەر ئەوە نییە کەسێک نووسەر یان هونەرمەند، یان یاریزان یان دارتاش، یان فیتەر یان سیاسییەکی باش یان خراپە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە هەموو

ئەمانە مرۆڤن، مرۆڤن وەک پێدراوێکی ئەبستراکت، مرۆڤن بەر لە دروستبوونی زمانی باشە و خراپە، بەر لە ناونانی شتەکان. پاراستنی کەرامەت دەشێت بەشێک بێت لە هەموو پەیوەندییەک، بکرێت لەنێوان مرۆڤەکاندا دروست ببێت، چ لەگەڵ یەک و چ لەگەڵ دەزگا سەرەکییەکانی ناو کۆمەڵگەدا، بەڵام دەشێت بێکەرامەتی، شکاندنی کەرامەت، بێنرخکردن و بەسووک تەماشاکردنی مرۆڤ، بەشێک بێت لە پێکهاتی ئەو پەیوەندییانە. بێکەرامەتکردن مەرج نییە تەنها بەشێک بێت لە پەیوەندییە سیاسییەکان، بەڵکو دەشێت بەشێکیش بێت لە پەیوەندییە دینی و ڕۆشنبیری و فیکرییەکانیش، مەرج نییە تەنها ئاکاری ناو کایەی سیاسەت بێت، بەڵکو دەشێت ئاکاری ناو کایەی دین و فیکر و نووسینیش بێت. ئەمەیە وا دەکات مەسەلەی بەرگریکردن لە کەرامەت مەسەلەی ژمارە یەکی ناو هەر کۆمەڵگەیەک و هەر کایەیەک بێت، بەتایبەتی لە کۆمەڵگەیەکی وەک کۆمەڵگەی ئێمەدا، کە وەک وتم، شکاندن و بریندارکردنی کەرامەت یاسایە نەک ڕێکەوت، زمانە نەک چرپە و دەنگەدەنگێکی تێکەڵ. بەرگریکردنیش لە کەرامەت یەک ناوونیشانی هەیە: لەناوبردنی ویستی بێڕێزی و ویستی کۆنترۆڵ و ئاراستەکردنی ئەوانی تر، پاککردنەوەی زمان لەو دەستەواژە و زاراوانەی ڕوانین بۆ مرۆڤبوونی مرۆڤ وەک شتێکی کەمنرخ و کەمبەها مەیسەر دەکەن، لەناوبردنی ئەو جۆرانە لە غرور کە دونیای دەرەوەی ئەو غرورە وەک شتێکی کەم و بچووک و بێمانا و هەڵە وێنا دەکات، سنووردارکردنی نەرجسیەتێک، ڕووی لە قەبەکردنێکی بەردەوامی خود بێت لەسەر حیسابی بچووک

و کەمنرخکردنی هەموو شتێکی دەرەوەی ئەو خودە. ڕێگرتن لە هەڵاوێردەکردنی کۆمەڵایەتی و هەوڵدان بۆ بوونیادنان و دروستکردنی دونیایەکی بەتاڵ لە زەلیلی. داننان بە توانا و بە بەشداریی کەسەکانی تردا و بەرزنرخاندنی ماندووبوون و تەقەلاکانیان لەناو ژیانی کۆمەڵایەتیدا، هەروەها داننان بە تواناکانی بیرکرنەوەیاندا، دەستەبەرکردنی ئاسایشی تاکەکەسی و دەستەجەمعی بۆ هەمووان، بەڕادەیەک، هەرکەسێک بتوانێت بەئاسانی و بەئازادی بدوێت و ئەوەی بە ڕاستی دەزانێت بێ ترس و بێ سانسۆرکردن باسی بکات و بەرگری لێ بکات. ئەمە سەرەڕای وێناکردنی مرۆڤ وەک بێتاوان و شوێنی برواپێکردن تا ئەو کاتەی پێچەوانەکەی دەر دەکەوێت و دەسەلمێت. هەموو ئەمانە ڕەگەزە جیاوازەکانی ناو سیاسەتی کەرامەت و ڕێزگرتنی مرۆڤن. هاریکاریی مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت ژیانی خۆی بهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و وەک بوونەوەرێکی سەربەخۆ و ئازاد بجووڵێتەوە و بیر بکاتەوە، هەم باوەڕی بە خۆی بێت هەم بەو دونیایەی تیایدا دەژی، بتوانێت خەون ببینێت و ئومێدی بە دونیایەک هەبێت، مرۆڤانەتر و جوانتر لەوەی لە ئێستادا هەیە، ئەمانەش بەشێکی تری ئەو سیاسەتی ئومێد و کەرامەتەن کە پێویستن. ئامادەبوون بۆ داوای لێبووردنکردن و بۆ بینینی هەڵەکانی مرۆڤ خۆشی، بەشێکی گرنگی مەیسەرکردنی زەمینەیەکە، مرۆڤ بتوانێت بە شێوەیەک مامەڵەی دونیا و مرڤەکانی تر بکات، کە نەبێتە هۆی برینداركردنی کەرامەتیان.

بەکورتی، کەرامەت مانای پاراستنی مرۆڤەکەی ناومان لە هەموو ئەو ڕق و بوغز و تەماح و هەستی خۆبەگەورەزانینانەی

مرۆڤێک لەناو خۆی و لەناو ئەوانی تردا دروستی دەکات، مانای بەهێزکردنی توانای گوێگرتن و بینینی حەز و ویست و خەون و ئەزموون و خەم و خۆشیی مرۆڤەکانی تر و ئامادەگی بۆ داننانپیایاندا. ئەوەی بەر لە هەموو شتێک لە کۆمەڵگەیەکی وەک کۆمەڵگەی ئێمەدا پێویستی بە گۆڕین و داڕشتنەوەیە، ئەو دۆخی بێکەرامەتی و بچووکتەماشاکردنەی مرۆڤە کە ڕۆژانە بە شێوازی جیاواز و لە ڕێگەی جیاوازەوە دەیانبینین. ئەمەش شتێک نییە تەنها سیاسییەکان لە پەرلەمان و لە دەرەوەی پەرلەماندا ئەنجامی بدەن، تەنها دەزگا گەورەکانی کۆمەڵگە بەرامبەر بە تاکەکەسەکان ئەنجامی بدەن، بەڵکو بڕێکی گەورەی کۆمەڵگەی ئێمە، بە بڕێک لە ڕۆشنبیرانیشەوە، لە بنی پێیانەوە تا تەوقی سەریان لەناو ئەم سیاسەتی بێڕێزیکردنەدا بەرامبەر بە مرۆڤ، نوقمن. ئەوەی ئەمڕۆ بەر لە هەموو شتێک پێویستی بە بەرگریلێکردنە، کەرامەتی مرۆڤی ئێمەیە.

# سەرچاوەكان

Curtis, Micael (2008). The great political theories. New York, HarperPerennial.

Fanon,F. (1982). The wretched of the earth. New York: Grove.

Filiu, Jean-Pierre (2011). The Arab Revolution: Ten Lessons from the Democratic Uprising. Oxford University Press. P 32-33.

Fischer, Johannes (2010). The social recognition of human dignity. ESKA 1 Journal International de Bioethique. Vol. 21, 3 PP. 43-49.

Forst, Rainer (2011). 'The Grounds of Critique: on the Concept of Human Dignity in Social Orders of Justification'. Normative Orders Working Paper 01/2011. Institut für Politikwissenschaft, Robert-Mayer-Straße 5, 60325 Frankfurt am Main.

Giesinger, Johannes (2012). Kant on dignity and education. Educational Theory Vol 62, nr 6, pp 609-620.

Hicks, Donna (2011). Dignity: Its Essential Role in Resolving Conflict. Yale University Press. P. xii.

Honneth, A.,(1995). The Struggle for Recognition: The Moral Grammar of Social Conflicts,Cambridge: The MIT Press.

Honneth, A., (2007). Disrespect: The Normative Foundations of Critical Thyheory, Cambridge: Polity Press.

Honneth, A 2001. 'Recognition or redistribution?: Changing perspectives on the moral order of society'. Theory, Culture & Society no.18 pp.43- 55.

Honneth, The Struggle for Recognition, Cambridge 1996; idem, Unsichtbarkeit, Frankfurt am Main 2003.

Margalit, Avishai (1998). The decent society. USA: Harvard University Press.

McCurdden, C (2008). Human dignity and jiudical intrepretation of human rights. The European Journal of International Law 19(4): 655-724.

Taylor, Charles (1994). 'The Politics of Recognition'. Multiculturalism: Examining the Politics of Recognition. Ed. Amy Gutmann. Princeton: Princeton University Press. 25-73.

-Sulmasy, F. P. (2007). Human dignity and human

worth. In J. Malps, & N. Lickiss (Eds.), Perspectives on human dignity: Aconversation (pp. 9-18). Dorderecht, The Netherlands: Springer.

Waldron, Jeremy (2012). How law protects dignity. The Cambridge law journal,Vol 71, Issu 1, March 2012, pp 200-222.

## سەرەتا

هیچ تەحەدایەک لە مێژووی کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا بە ڕادەی تەحەدای ڕێکخستنی جیاوازییە سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووری و ڕەمزییەکان گرنگ نییە. کۆکردنەوەی ئایدیۆلۆژیا و دونیابینی و چوارچێوە ئەخلاقی و ڕۆحانییە جیاوازەکان لەناو یەکەیەکی هاوبەشی گەورەتردا، کێشەی پلورالیزمی دینی و نادینی و کێشەی پلورالیزمی دونیابینییە جیاوازەکان، کێشەی ژمارە یەکی دونیای مۆدێرنە. ڕێکخستنی جیاوازییش لە هەر کۆمەڵگەیەکدا لە چوارچێوەیەکی پلورالدا، تەنها ڕێکخستنی ئەو جیاوازییانە نییە کە لە ڕابردووەوە بۆ ئەو کۆمەڵگەیە ماونەتەوە، بەڵکو ڕێکخستنی ئەو جیاوازییانەشە کە لە ئێستا و ئەمڕۆ و سبەینێشدا دروست دەبن. مۆدێرنە خۆشی ماشینێکی گەورەی بەرهەمهێانی جیاوازییە و هیچ کۆمەڵگەیەک لە دونیادا نەماوە کە بەردەوام جیاوازی بەرهەم نەهێنێت. ئەگەر لە قۆناغەکانی بەر لە مۆدێرنەدا جیاوازیی ئایینی جیاوازیی ژمارەیەکی نێوان گروپ و کۆمەڵگەکان بووبێت، ئەوا لە سەردەمی مۆدێرنەدا ڕووبەری جیاوازییەکان بە ڕادەیەکی گەورە فراوانتر دەبێت و دەیان شێوازی نوێ دەگرێتە خۆی، لە جیاوازیی شار و لادێوە بیگرە، بۆ

جیاوازیی چینەکان و پیشەکان و کایەکان و دونیابینییەکان و شێوەژیانەکان و شووناسە جیاوازەکان، جیاوازیی نەتەوەکان و کولتوورەکان و کەلەپوورە کۆن و نوێیەکان، جیاوازیی ڕوانینە ئەخلاقییەکان و بەهاکان و داوەریکردنەکان. هەموو ئەمانە بەشێکی بنەڕەتیی ئەو هەندەسە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەن، کە دونیای ئەمڕۆ دروست دەکات. ئەم جیاوازییانە لە دونیای مۆدێرندا دەبن بە بەشێکی بنەڕەتی و سەرەکیی ژیان. بۆیە پرسیاری ئەوەی چی لەو فرەڕەنگییە ئینسانی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ڕەمزییانە بکەین؟ چی لە پلورالیزم بکەین؟ چۆن جیاوازییەکان ڕێک بخەین؟ چ چوارچێوەیەکیان بۆ بدۆزینەوە؟ دەبنە ئەو پرسیارە سەرەکی و بنەڕەتییانەی لە زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵگە و فەرهەنگە جیاوازەکاندا دێنە کایەوە، بەتایبەتی لەو بەشانەی دونیادا کە پرۆسەی تازەبوونەوە کۆمەڵگەکانی ڕووبەڕووی چەندەها تەحەدا و کێشەی گەورە کردۆتەوە، نەک تەنها گیرخواردن بەدەست جیاوازییە کۆنەکانی ناو کەلەپوورە جیاوازەکانی خۆیانەوە، بەڵکو بەدەست ئەو جیاوازییانەشەوە کە پرۆسەی تازەبوونەوە و لە دونیای ئەمڕۆشدا پرۆسە جیاوازییەکانی بەجیهانیبوون بەرهەمیان دەهێنێت.

ئەم نووسینە هەوڵدانە بۆ خوێندنەوەی دیاردەی پلورالیزم وەک تەحەدایەک بۆ فیکری فەلسەفی و سیاسی و دینی. سەرەتاش لە ناساندنێکی گشتیی دیاردەی پلورالیزمەوە لای فەیلەسووفی ئەمەریکایی ویلیم جەیمس دەست پێ دەکات، بۆ ئەوەی دواتر چەمکی پلورالیزم لای فەیلەسووفی ئەڵمانی هانا ئارێنت و فەیلەسووفی ئیتالی جیانی ڤاتیمۆ

و فەیلەسووفی ئیسلامی فارابی بخوێنێتەوە. لای ئارێنت، پلورالیزم بنەمایەکی ئەنترۆپۆلۆژیی هەیە کە پەیوەستە بەو ڕاستییەوە کە مرۆڤ هەمەجۆرە و هەموو تاکەکەسێکیش کە دێتە ناو جیهان، لەگەڵ خۆیدا ئەگەری سەرەتایەکی تازە و جیاواز دێنێتە کایەوە. لای ڤاتیمو، پلورالیزم بنەمایەکی سۆسیۆلۆژی و ئەستمۆلۆژیی هەیە و بەوەوە پەیوەستە کە کەسێک یان تێزێک یان تیۆرەیەک بەتەنها توانای ڕاڤەکردنی دونیای نییە، واتە شتێک لە مەعریفەدا بە ناوی "چاوێکی خودایی"ەوە بوونی نییە، کە بتوانێت هەموو شتەکان و دیاردەکان و دەرکەوتەکان ببینێت. فارابیش لە دیدێک نزیک لە دیدی کۆمەڵناسییەوە دەدوێت و پێی وایە ناکرێت بیر لەوە بکەینەوە کە جیهان وەک یەک جیهان ببینین و هەموو شارەکان و کۆمەڵگەکانی دونیا یەک دین و یەک شێواز لە حوکمڕانی و یەک جۆر مەعریفەیان هەبێت.

مەسەلەی پلورالیزم یەکێک لە مەسەلە هەرە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی ئەو ناوچەیەیە کە کۆمەڵگەی ئێمەی تێدا دەژی. لە شەست ساڵی ڕابردوودا، واتە لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالیزمدا، ئەو ناوچەیە ڕووبەڕووی دوو شێواز لە فیکر و دوو شێواز لە حوکمڕانی و دوو شێواز لە ڕێکخستنی جیاوازی بۆتەوە، کە لەسەر کوشتن و سڕینەوەی پلورالیزم کار دەکەن. یەکەمیان سەرجەمی ئەو ئایدیۆلۆژیا عەلمانییە نادینییانەیە کە بە ناوی قازانجی نەتەوە و قازانجی چینی کرێکار و خەباتی دژە ئیمپریالیزمەوە کاریان بۆ سەپاندنی یەک دید و یەک ڕوانین و یەک سیاسەت و یەک پارت و یەک

سەرۆک و یەک جۆر ڕۆشنبیر بەسەر کۆمەڵگەکاندا دەکرد. ئەویتریان سەرجەمی ئەو ئایدیۆلۆژییە دینییە ئیسلامییانەیە کە نەخشەی ئیسلامی سیاسی لە ناوچەکەدا دروست دەکەن و ئەمانیش لە دیدێکی هەقیقەتگەرا و ڕەسەنخواز و شووناسگەری دینییەوە، هەموو شتێکی دەرەوەی خۆیان نەفی دەکەن. ئەگەر سەید قوتب دونیای دەرەوەی ئیسلام و بەشێکی زۆری دونیای ئیسلامیش وەک جاهیلیەت ناو ببات، ئەوا ئایدیۆلۆژییەکانی دیکەش بە ناوی شارستانیەتی بۆرژوازی و دیموکراسیەتی دۆرزنانە و لیبراڵیزمی ڕیاکارەوە خەتێکی ڕاست و چەپ بەسەر بەشێکی گەورەی ئەزموونە سیاسی و فەرهەنگی و فیکرییەکانی دونیادا دەهێنن. هەوادارانی هەردوو بەرەکە، تا ئەمڕۆش لە ناوچەکەدا و لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ئامادەن و زۆریان شەرابە کۆنەکان لە پەرداخێکی تازەدا دەفرۆشنەوە. لەمەشدا هەرچی شتێک لەو دیدە ئایدیۆلۆژییە داخراوانە نەچێت و بەشێک نەبێت لەو دونیابینییە تەسکبینە، یان وەک جەهل و گەمژەیی دەبینن، یاخود وەک کوفر و زەندەقە و جاهیلیەت وێنای دەکەن. گرەوی سەرەکیی ئەو ناوچەیە لە تێپەڕاندنی لۆژیک و بیرکردنەوە و کردەی مێژوویی هەردوو بەرەکەدایە.

بەڵام با بەر لە باسکردنی پلورالیزم، لە ئاستە فەلسەفی و ئەپستمۆلۆژی و دینییەکەیدا، چەند سەرنجێک لەسەر ئەو چوارچێوە سەرەکییە دەر ببڕین کە لە دونیای مۆدێرندا بۆ ڕێکخستن و ئیدارەدانی جیاوازی دروست کراوە، کە چوارچێوەی دەوڵەتی نەتەوەییە.

## دەوڵەتی نەتەوە

لە سەدەی هەژدەهەمەوە ئەو چوارچێوەیەی بۆ نیشتەجێکردن و پاراستنی پلورالیزم دروست کراوە، چوارچێوەی دەوڵەتی نەتەوەییی مۆدێرنە کە خۆی وەک یەکەیەکی گشتیی هاوبەش و بێلایەن نمایش دەکات و وای نیشان ئەدات لەسەرووی جیاوازییە کولتووری و دینی و کۆمەلایەتی و ڕەمزییەکانەوەیە. دەوڵەتی مۆدێرن خۆی دەبێت بەو چوارچێوە گشتییە کە جێگەی دین و دونیابینییەکانی دیکە دەگرێتەوە، بە ئایدیۆلۆژیا گەورەکانی سەردەمی مۆدێرنە خۆشیەوە. واتە دەوڵەت خۆی وەک دەوڵەتێکی دینی یان ئایدیۆلۆژی یان ڕۆحانی نمایش ناکات، بەڵکو خۆی وەک هاوبەشێکی گشتی، وەک جیهانبینییەکی نوێ نمایش دەکات کە جێگەی هەموو جیهانبینییەکانی تر دەگرێتەوە و شوێنیش بۆ هەموویان دەکاتەوە. نەتەوە لێرەدا دەبێتە ئەو چوارچێوە گشتییەی جیاوازییەکان لە هەناوی خۆیدا جێ دەکاتەوە و هەر خۆشی دەبێت بەو یەکە تازەیەی کە دەکەوێتە سەرووی هەموو یەکە کۆمەلایەتییەکانی ترەوە. نەتەوە تەنها وەک چوارچێوەیەکی سیاسیی هاوبەش دەر ناکەوێت، بەڵکو دەبێت بە چوارچێوەیەکی ئەخلاقیی هاوبەشیش، دەوڵەت خۆشی تەنها وەک چوارچێوەیەکی یاسایی ئامادە نییە، بەڵکو چوارچێوەیەکی ئەخلاقی و دەروونیی هاوبەشیشە. نەتەوە و دەوڵەت لەم ڕوانینەدا یەکەیەکی گەورەی بێلایەنن بەرامبەر بە

ئایدیۆلۆژیاکان و دینەکان و دونیابینییەکان، یەکەیەکن دەتوانن جێگە بە جیاوازییەکان ببەخشن بەبێ ئەوەی خۆیان ببن بە قسەکەر یان نوێنەری هیچ یەکێکیان. بەلام گۆڕانی نەتەوە بۆ ئەم چوارچێوە گشتییە بەبێ دابینکردنی دوو پێداویستیی سەرەکی مەحاڵە، یەکەمیان یەکسانبوونی تاکەکەس و گروپەکانە بە یەکتری لەناو چوارچێوەی نەتەوەدا، دووهەمیان لێبووردەییی نەتەوەیە بەرامبەر بە هەموو جیاوازییەکانی ناو هەناوی. تەنها لە دۆخی دابینکردنی ئەم دوو مەرجەدا هەم نەتەوە و هەم دەوڵەت دەتوانن ببنە ئەو چوارچێوە گشتییەی کە هێزە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگە بە چوارچێوەی خۆیانی بزانن و وەک شووناسێکی هاوبەش مامەڵەی بکەن. چەمکی یەکسانی، کە لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەدرێژی باسمان کرد و چەمکی لێبووردنیش دەبن بە دوو چەمکی گرنگ و سەرەکیی ناو هەر سیاسەتێکی سەرکەوتووی ڕێکخستن و پاراستنی پلورالیزم لە دونیای مۆدێرندا، بەتایبەتی گەر نەتەوە یەکەی سەرەکیی کۆکردنەوەی جیاوازییەکان بێت بەیەکەوە. بێگومان ئەم ڕوانینە کون و کەلەبەر و نوقسانی زۆری تێدایە، کە خوێنەر بۆ شارەزابوون بە هەندێکیان دەتوانێت بۆ وتاری یەکەمی ناو ئەم کتێبە بگەڕێتەوە، بەتایبەتی بۆ ڕەخنەکانی مارکس و هانا ئارێنت لە چەمکی هاووڵاتیبوون و لە مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ لەناو چوارچێوەی دەوڵەتی نەتەوەدا. هەروەها دەتوانێت بۆ ئەو کەلەپوورە تیۆرییە تایبەتە بگەڕێتەوە کە بێلایەنبوونی دەوڵەت و نەتەوە دەخەنە ژێر پرسیار و گومانەوە. بەلام سەرجەمی ئەم ڕەخنانە لەو ڕاستییە ناگۆڕن کە دەوڵەتی نەتەوە ئەو چوارچێوە

باڵادەستەیە کە هەم مەسەلەی یەکسانی و هەم مەسەلەی پلورالیزم لە هەناویدا ڕێک دەخرێت.

ڕەخنەگرانی دونیای مۆدێرن لەسەر ئەو خاڵە تەبان کە لەگەڵ بوونی نەتەوەدا بە چوارچێوەی سەرەکیی کۆکردنەوەی جیاوازییەکان لەپاڵ یەکدا، چەندەها میکانیزمی ئامێزانبوون و دوورخستنەوە، قبوڵکردن و دەرکردن، نرخاندنی پۆزەتیڤ و پەراوێزخستن دێنە کایەوە و دەشبن بە بەشێک لە میکانیزمە سەرەکییەکانی ناو کۆمەڵگە مۆدێرنەکان. بۆ نموونە، گووتاری ڕاسیزم و گووتاری مافەکانی مرۆڤ بەتەنیشت یەکەوە ئامادەن. زۆرێک لە ڕەخنەگران نیشانی ئەدەن، نەتەوە وەک چوارچێوەی سەرەکیی کۆکردنەوەی جیاوازییەکان، هەندێک جیاوازی قبوڵ و هەندێک جیاوازیی تر قبوڵ ناکات، بۆ نموونە هەموو مرۆڤێک بکەوێتە دەرەوەی سنوورەکانی نەتەوە یان دەوڵەتی نەتەوەوە، خاوەنی هەر ئاکارێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیش بێت، ناتوانێت ببێت بە بەشێک لە نەتەوە و وەک هاووڵاتی مامەڵە ناکرێت. مەسەلەی بوون بە ئەندامیش لەناو نەتەوەیەکی دیکەشدا بەناو چەندان پرۆسەی یاسایی و فەرهەنگی و ڕەمزیی ئاڵۆزدا تێدەپەڕێت، کە پڕن لە بەربەست و سنوور و هێڵی ئەستووری جیاکردنەوەی مرۆڤەکان لە یەکتری.

ناچارکردنی مرۆڤ بۆ پەنابردن بۆ شووناسی لاوەکی و پەراوێزی، لە پەیوەندیدا بە شووناسی باڵادەستەوە، بەشێکە لە دیاردەکانی ناو دونیای مۆدێرن. کێشەی مامەڵەکردنی مرۆڤیش وەک بوونەوەرێکی پلەدوو و پلەسێ بە هۆی جیاوازیەکانییەوە، لە جیاوازیی دینییەوە بیگرە بۆ جیاوازیی

ئەتنی و فەرهەنگی و ڕەگەزی و کۆمەڵایەتی، تا ئێستاش لە کێشە هەرە بنەڕەتی و هەرە سەرەکییەکانی دونیای ئەمرۆن. نە نەتەوەی مۆدێرن و نە دەوڵەتی نەتەوەش لەوەدا سەرکەوتوو نەبوون، کە هەموو کێشەکانی پلورالیزمی سیاسی و کولتووری و ئەخلاقی و ڕەمزی چارەسەر بکەن. بەڵام هاوکات ڕێزگرتنی پلورالیزم یەکێکە لەو هەوڵانەی بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە هاتۆتە کایەوە، پلورالیزم لێرەدا تەنها مانای بوونی جیاوازی نییە، بەڵکو مانای دەرگیربوونە لەگەڵ ئەو جیاوازییانەدا، دۆزینەوەی ڕێگەچارەیە بۆ مامەڵەکردنی جیاوازییەکان بەبێ لەناوبردن و پەراوێزخستنی ئەمیان لەسەر حیسابی ئەوی تریان.

لە مێژوودا بە زۆر شێوە هەوڵی ڕێکخستنی پلورالیزم دراوە، بۆ نموونە جیاکردنەوەی چین و توێژ و دینەکان لە یەکتری و دروستکردنی بەربەست و دیوار لەنێوانیاندا، تا ئەو شوێنەی "گیتۆ"ی تایبەت بە هەریەکێک لەوانە دروست بکرێت و لە ڕووی کردەییەوە ڕێ لە تێکەڵبوونیان بگیرێت. ئەزموونە سیاسییە ترسناکەکانی سەدەی بیستەم، نیشانیان داین کە ئەم شێوازە لە مامەڵەکردنی پلورالیزم چەند شێوازێکی نامرۆڤانە و وێرانکەرانەیە و چۆن دەکرێت دابڕانی مرۆڤەکان لە یەکتری، هەنگاوی یەکەمی لەناوبردنی ئەم گروپ یان ئەوی تریان بێت. پلورالیزم تەنها مانای لێبووردن و چاوداخستن نییە بەرامبەر بە یەک، مانای ئەوە نییە مرۆڤەکان و گروپەکان یەکتری ببینن و کەسیان هەقی بەسەر ئەوی تریانەوە نەبێت. پلورالیزمی ڕاستەقینە، مانای دروستکردنی پەیوەندیی چالاک و فرەجۆرە لەنێوان

کەسـە جیاوازەکانـدا لەسـەر بنەمـای هاوبەشـێکی ئینسـانی و سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و ڕەمـزی. ڕاسـتە لێبووردن بەهایەکـی فەرهەنگی و سیاسـی و ڕەمزیی گرنگە، بەڵام بۆ ڕێکخسـتنێکی چالاکـی پلورالیـزم لێبـوردن بەتەنهـا بـەس نییـە. ئـەم ڕوانینـە وادەکات پلورالیـزم، یەکسـان نەکەیـن بـە ڕێژەگەرایـی، چونکـە لەپشـتی پلورالیزمـەوە، تەنهـا جیاوازییـەکان ئامـادە نیـن، بەڵکو هاوبەشـێکی ئینسـانی و فەرهەنگییش هەیـە، کـە هیـی هەمووانـە بـە هەمـوو ئـەو جیاوازییانـەوە کـە هەریەکێـک هەڵگریەتـی. لـەم دیـدەدا جیاوازییـەکان نـەک تەنهـا دەچنـە پەیوەندییـەوە لەگـەڵ یەکـدا، بەڵکـو خـودی ئـەو پەیوەندییانـە لەنـاو چوارچێوەیەکـی گشـتی و هاوبەشـدا ڕوودەدەن. ئـەم دۆخـەش بـەر لـە هەمـوو شـتێک، پێویسـتی بـە بوونـی زمانێکـی هاوبەشـە، زمانێـک کەسـەکان و گروپـەکان و کۆمەڵـەکان بتوانـن بـە هۆیـەوە لـە دیالـۆگ و گفتوگۆیەکـی بەردەوامـدا بـن، کـە بـە هۆیـەوە ڕەخنەگرتـن لـە خـۆ و ڕەخنەگرتـن لـەوی تـر بەشـێکی گرنـگ و بنەڕەتیـی ئـەو دیالۆگانـە بێـت. لـە هـەر شـوێنێکدا ئـەو زمانـە و ئـەو دیالۆگـە بوونـی نەبـوو، واتـە توانـای گوێگرتـن و قسـەکردن بوونـی نەمـا، شـتێک بـە نـاوی پلورالیزمـی ڕاسـتەقینەوە بوونـی نامێنێـت. بوونـی دیالۆگیـش مانـای ئـەوە نییـە کـە هەمـووان هەمیشـە هـاوڕای یـەک و بێناکۆکـی بـن، بەڵکـو مانـای ئەوەیـە، ئازادانـە لەگـەڵ یەکـدا لـە گۆڕینـەوەی بۆچوونـدا بـن و هـەم جیاوازییەکانیـان بـە یەکتـری نیشـان بـدەن و هـەم ئـەو زەمینـە هاوبەشـانەش لـە ئامێـز بگـرن، کـە پێویسـتە دروسـت بکرێـت. هەمـوو ئەمانـە وا دەکـەن تەحـەدای چۆنێتیـی ڕێکخسـتنی پلورالیـزم لـە دونیـای مۆدێرنـدا، نـەک تەنهـا تەحـەدای سـەرەکیی

ناو سیستم و ڕژێمە سیاسییەکانە، بەڵکو تەحەدای سەرەکیی ناو ئەخلاقی گشتی و ناو هۆشیاریی ئەم کۆمەڵگەیانەش بێت. وەک چۆن یەکێکە لە تەحەدا گەورەکانی ناو فیکر و بیرکردنەوەی تیۆرییش.

## پلورالیزم چییە؟

پلورالیزم دەشێت بەکوردی دەستەواژەی "فرەجۆری" یان "فرەڕەنگی" یان "فرەدەنگی"ی بۆ بەکار بهێنین، هەریەکێکیش لەم دەستەواژانە، ئاماژە بۆ ڕاستییەکی زۆر سادە دەکەن، ڕاستیی ئەوەی هەمیشە زیاد لە ڕوانین و دید و بۆچوونێک هەیە بەرامبەر بەوەی ئایا دونیا و دیاردەکانی، ژیان و بەها سەرەکییەکانی، مرۆڤ و خەون و خولیاکانی، چین و کامانەن. هەمیشە زیاد لە ڕێگەیەک هەیە بۆ سەیرکردنی دونیا، زیاد لە گۆشەنیگایەک هەیە بۆ بینین و لێکدانەوەی شتەکان، زیاد لە فیکرێک هەیە بۆ دەرگیربوون لەگەڵ پەیوەندییەکان و دیاردەکاندا، زیاد لە وێناکردنێک هەیە بەرامبەر بە شتەکان و زیاد لە زمانێک هەیە بۆ پەیوەندیکردن و دروستکردنی دونیا. وەک پیتەر بێرگەر دەڵێت، پلورالیزم مێژوویەکی درێژی لە فیکری تیۆری و فەلسەفیدا هەیە و مانا هەرە سادەکەشی ئەوەیە "کە زیاد لە ڕێگەیەک هەیە بۆ تەماشاکردنی واقیع."[1]

---

١_بڕوانە: Peter Berger (٢٠١٤). The many altars of modernity. Toward a paradigm for religion in a pluralist age. De Gruyter .Mouton. P1

پلورالیزم لەم ئاستەدا شتێکە پەیوەستە بە بوونی چەندەها جۆر لە تاکەکەس و گروپی لەیەکجیاواز لەناو کۆمەڵگەدا، ئەمانەش ڕوانین و خەون و چاوەڕوانیی جیاوازیان هەیە. بەڵام پلورالیزم تەنها شتێک نییە لە سەری تاکەکەسەکاندا بوونی هەبێت، شتێک نییە تەنها پەیوەندیی بە "ڕوانین" و "تەماشاکردن"ەوە هەبێت، بەڵکو پێدراوێکی کۆمەڵایەتیی بەرجەستەشە، لەناو کۆمەڵگەدا هێزی کۆمەڵایەتیی جیاواز هەیە، کە زۆر جار لە فۆرمی گروپ و توێژ و نوخبە و چینی کۆمەڵایەتیی جیاوازدا دەر دەکەون. پلورالیزم لە یەک کاتدا بەشێکە لە هۆشیاری و سایکۆلۆژیای تاکەکەسی و دەستەجەمعی، وەک چۆن بەشێکیشە لە پێکهاتی سۆسیۆلۆژیی کۆمەڵگە. ئەو خاڵەی گرنگە بیزانین، ئەوەیە لە پلورالیزمدا تەنها "ڕوانینەکان" جیاواز نین، بەڵکو "ڕاستییە کۆمەڵایەتی"یەکانیش جیاوازن، یانی "فاکت"ە کۆمەڵایەتییەکانیش جیاواز و هەمەجۆرن. کە باس لە "ڕاستیی کۆمەڵایەتی" دەکەم، بەو مانایە بەکاری دەهێنم، کە کۆمەڵناسی فەرەنسی، ئێمیلی دۆرکهایم بە "ڕاستییە کۆمەڵایەتییەکان" یان "فاکتە کۆمەڵایەتییەکان"ی دەبەخشێت.[1] لای دورکهایم، "ڕاستیی کۆمەڵایەتی" شتێکە لە دەرەوەی تاکەکەسەکاندایە، دیاردەیەکە لە دەرەوەی ڕوانین و هۆشداریی تاکەکەسدایە و پابەستە بە بوونی گروپ و چین و دەستەوتاقمی کۆمەڵایەتیی جیاوازەوە. ڕاستیی کۆمەڵایەتی

---

١ـ بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی "ڕاستیی کۆمەڵایەتی" لای دورکهایم، بڕوانە: **Rawls, Anne Warfield (2012).** Durkheim's theory of modernity: Self-regulating practices as constitutive orders of social and moral facts. Journal of Classical Sociology, 2012, Vol.12(3-4), pp.479-512

باوەڕێکی، کە لە دەرەوەی تاکەکەسەکاندا دروست دەبێت، ئەم باوەڕانەش بەسەر یەکەوە ئەو شتە دروست دەکەن کە ناوی "کۆمەڵگەیە." لەم ڕوانینەدا کۆمەڵگە یەکسان نییە بە کۆی تاکەکەسەکانی ناوی، بەڵکو یەکسانە بە کۆی گروپ و دەستە و کۆمەڵە و چینەکان بەسەر یەکەوە. ئەم شێوازە کۆییانەی بوونی کۆمەڵایەتی، هەڵگری فشاری جیاوازن بۆ سەر تاکەکەس، چ لە بیرکردنەوە و ڕوانینیاندا، چ لە شێوەژیان و خەون و گرفتەکانیاندا، چ لە بەکارهێنانی زمان و ڕیتۆریک و وێنەکاندا. لەم گۆشەنیگایەوە، "ڕاستیی کۆمەڵایەتی" ئەو شتەیە کە تاکەکەس ئەنجامی ئەدات وەک دەرەنجامی فشاری گروپ و یەکە کۆمەڵایەتییە دەستەجەمعییە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگە بۆ سەر ئەو تاکەکەسە. لێرەدا تاکەکەس خۆی شتەکان هەڵنابژێرێت، بەڵکو گروپ یان کۆمەڵە یان چین یان کۆمەڵگە وەک گشتێک بۆی هەڵدەبژێرێت، هەر گروپ و کۆمەڵە و چینێکیش هەڵبژاردنی جیاواز بەسەر تاکەکەسەکانی ناو هەناوی خۆی و ناو چوارچێوەکانیدا دەسەپێنێت.[1] بەم جۆرە، پلورالیزم لەم دیدەدا مانای فرەجۆری و فرەڕەنگیی تاکەکەسەکان نییە بەتەنها، بەڵکو مانای فرەجۆری و فرەڕەنگیی "ڕاستییە کۆمەڵایەتی"یەکانیشە، فرەجۆریی فاکتەکانە، کە بوونیان بە شێوەیەکی ئۆرگانی بە بوونی دەستەجەمعیی گروپ و کۆمەڵە و توێژ و چین و یەکە کۆییەکانی تری ناو کۆمەڵگەوە گرێ دراوە.

کە باس لە پلورالیزم دەکەم، باس لە ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی

---

١_بڕوانە: Collins, R., Makowsky, M. (red.), The Discovery of Society. (2010) New York: McGraw-Hill, pp. 92-104

ناکەم، کە پێ لەسەر پاراستنی جیاوازییەکان دابگرێت، بەڵکو باس لە دۆخێکی وجودی و کۆمەڵایەتی و ئینسانیی هاوبەش و باس لە بوونی مرۆڤ دەکەم لە مانا پلوراڵەکەیدا. بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم خاڵەش، با وەک سەرەتا لەسەر هەندێک لە بۆچوونەکانی هانا ئارێنێت بوەستین، بۆ ئەوەی دواتر لە ڕێگەی بۆچوونەکانی ڤاتیمۆ و فارابییەوە درێژە بە باسەکە بدەین. ئەم سێ فەیلەسووفە سیاسییە کۆمەڵێک بۆچوونی گرنگ لەسەر مەسەلەی پلورالیزم دەر دەبڕن، کە نزیکن لەو مەبەستەوە من لێرەدا بەرگری لێ دەکەم.

## پلورالیزم وەک بابەت

وەک پێشتریش وتم، پلورالیزم یەکێکە لە تیما گرنگەکانی ناو مێژووی فیکر و ناو مێژووی ژیانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسی، بەتایبەتی لە دونیای مۆدێرندا. گرنگیی ئەم بابەتە لە دونیای ئەمڕۆدا زۆر ئاشکراتر و بەرچاوترە لە سەردەمەکانی تری مێژووی مرۆڤایەتی، چونکە ئەم دونیایە نەک تەنها لە هەموو دونیاکانی بەر لە خۆی پلوراڵتر و فرەچەشنترە، بەڵکو هەر هەوڵدانێکیش بۆ تێگەیشتن لەم دونیایە، بەبێ چەمکی پلورالیزم، هەوڵدانێکی لاواز و نوقسان، ئەگەر نەڵێم نەزۆک و بێسەمەر دەبێت. ئەم ڕاستییە سادەیە، وا دەکات لەمڕۆدا مەسەلەی باسکردن و ڕاڤەکردنی پلورالیزم بەشێک بێت لە چالاکییەکانی ناو زیاد لە کایەیەکی فیکری و تیۆری، زەحمەتە ساتەوەختێکی دیکە لە مێژوودا بدۆزینەوە

بە ڕادەی ئەمڕۆ مرۆڤەکان وێنەی جیاوازیان بۆ واقیع و مێژوو و دونیا و مرۆڤ و خودا و گەردوون و بوون و دیاردەکانی دەوروبەریان هەبوو‌بێت.

ڕەنگە یەکەمین نووسەری مۆدێرن کە بابەتی پلورالیزمی کردبێتە بابەتی تێڕامان و خوێندنەوە تیۆرییەکانی، نووسەری ئەمەریکی ویلیەم جەیمس بێت، .William James، ئەم پیاوە لە ساڵی ۱۹۰۸دا لە زانکۆی ئۆکسفۆرد کۆمەڵێک وانە دەڵێتەوە، کە ساڵێک دواتر لە کتێبێکدا بە ناوی "گەردونێکی پلورالیست" چاپ دەکرێت، .A Pluralistic Universeی ویلیەم جەیمس لەم کتێبەدا زۆر بەوردی دیاردەی پالورالیزم لە دونیای مۆدێرندا شی، دەکاتەوە. کێشەی سەرەکیی ویلیەم جەیمس لەگەڵ ئەو شێوازە لە بیرکردنەوەی مێتافیزیکدایە، کە هەموو دیاردەکان و هەموو کێشەکان بۆ یەک پرنسیپی ڕەها، یان یەک تیۆرە، یان یەک چەمک دەگەڕێنێتەوە، ئەوەی ئەو بە "ئایدیالیزمێکی ڕەها و یەکلایەنە" ناوی دەبات. ئەم ئایدیالیزمەش وەک بیرکردنەوەیەکی ڕەها و یەکلایەن دەبینێت، هەم لە داوەریکردنی دیاردەکاندا و هەم لە ڕوانین و ڕاڤەکردنەکانیدا.[1] ئەم شێوازە لە بیرکردنەوە، هەم ڕەهایە لە حوکمدانەکانیدا، هەم یەکلایەنەشە لە لێکدانەوە ڕاڤەکردنەکانیدا. لەم دیدەدا جیهان هەمیشە یەک جیهانە، ئەگەرچی دەشێت وەهمی ئەوە بە کەسەکان ببەخشێت، کە گوایە زیاد لە یەک جیهانە. لەم ڕوانینە مێتافیزیکییەدا،

---

١_بۆ کتێبەکەی ویلیەم جەیمس بە زمانی ئینگلیزی، سەیری ئەم لینکە بکە:
http://hudsoncress.net/hudsoncress.org/html/library/western-philosophy/James,%20William%20-%20A%20Pluralistic%20 Universe.pdf

جیهان "یەک کوتلەی کەونی"یە و ئەو جیاوازییانەش کە هەن جیاوازیی ناو ئەم تاکە جیهانەن. بەلام ویلیەم جەیمس باوەڕی وا بوو کە جیهان زیاد لە جیهانێکە و هەموو شتەکانی ناویشی مێژوویان هەیە، مێژوویەک کە مێژووی گۆڕانی ئەو شتانەیە، بۆیە جیهان و شتەکانی ناوی بە هیچ شێوەیەک کورت ناکرێنەوە بۆ یەک شت. خۆ ئەگەر واشی دابنێین جیهان یەکە و فرە نییە، ئەوا یەکبوونی ئەم جیهانە هەمیشە یەکبوونێکی ناتەواو و بەشبەشە و بەردەوامیش لە دۆخی گۆڕان و ناجێگیریدایە. ویلیەم جەیمس لە یەکەمین وانەدا بەگژ ئەو دیدە فەلسەفییەدا دەچێتەوە کە "بەشێک" لە جیهان وەر دەگرێت بۆ تەفسیرکردنی "هەموو" جیهان، دواتریش لە ڕەخنەکردنی هیگڵدا، لە وانەی سێیەمدا، هەمان ڕەخنە دووبارە دەکاتەوە. بە بۆچوونی ویلیەم جەیمس، ڕاڤەکردنی "هەموو" لە ڕێگەی "بەش"ێک لە بەشەکانەوە، هەوڵدانە بۆ ئەوەی کۆتایی بەو هەموو ئەو شتانە بهێنرێت کە "سەیر" و "غەریب" و "نەناسراون"، بۆ ئەوەی وەک "هەموو"یەک نمایش بکرێت، کە هەموویەکی ناسراو و ناغەریب ناسەیرە. بەرەهاکردنی "بەش"ێک لە شوێنی بینینی هەموو جیاوازییەکانی ناو "گشت" یان "هەموو"، ئەو کێشەیەیە کە بیرکردنەوەی میتافیزیکیی دژ بە ناسینی جیاوازییەکان هەڵگریەتی. ئەم ڕەخنە فەلسەفییانەی ویلیەم جەیمس لە ئایدیالیزمی ئەڵمانی، پابەستی ئەوەیە ئەو شێوازە لە فیکر توانای خوێندنەوەی دونیای تازەیان نییە، دونیایەک لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا پڕ بوو لە جیاوازی و فرەچەشنی و هەمەجۆری. ئەوەی لەناو ئەم دونیا کۆمەڵایەتییە فرەچەشن و جیاوازەدا سەرنجی

ویلیەم جەیمس ڕادەکێشێت، گەشەکردنی دیاردەی کۆچکردن و زیادبوونی ژمارەی کۆچبەرانە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم لە ئەمەریکادا. لەو وانانەدا لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، ویلیەم جەیمس هەوڵ ئەدات کۆمەڵێک بنەمای فەلسەفی بۆ ئەم دیاردەی کۆچکردنە دابهێنێت، کە تێکەڵبوونێکی بەرفراوانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ڕەمزیی لێ دەکەوێتەوە. ئەم دیاردە تازەیەی کۆچکردنی بەرفراوان، دواتر لەلایەن یەکێک لە قوتابییەکانی ویلیەم جەیمسەوە ناوی "پلورالیزمی کولتووری"ی لێ دەنرێت.[1]

وەک وتم، بەرگریکردنی ویلیەم جەیمس لە پلورالیزم لە ئاستە فەلسەفییەکەیدا، پەیوەندیی بە بەگژاچوونەوەی ئەو بەشە لە فیکری فەلسەفییەوە هەیە کە ناوی "ئایدیالیزمی ئەڵمانییە"ە، فەلسەفەیەک کە یان بە ناوی "سیستەم"ێکەوە بۆ هەموو دونیا، یان بە ناوی "چاوێکی خودایی"یەوە دەدوێت، کە گوایە هەموو شتەکانی ناو مێژوو دەبینێت و دەشزانێت شوێنی "ڕاستەقینە"ی هەریەکێک لەو شتانە کامەیە. لەم ڕووەوە، ڕیشارد بێرنشتاین، Richard Bernstein دەنووسێت: "هەم لە ئێستادا و هەم بۆ هەمیشە، کۆمەڵێک دونیابینی هەن و دەبن، کە بە یەکدی ناکۆک دەبن و لەگەڵ یەکدا لە ململانێدا دەبن. بۆیە شتێک بوونی نییە ناوی ڕوانگەی 'چاوێکی خودایی' بێت، single God's- eye point of view، و ئینسان بتوانێت پێی بگات."[2] بە کوردییەکی سادەتر،

[1]_بۆ وردەکاریی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە، بڕوانە: Richard J. Bernstein (2015). Cultural Pluralism. Philosophy and Social Criticism.

[2]_هەمان سەرچاوەی پێشوو.

شتێک بوونی نییە ناوی "یەک" ڕوانین بێت بتوانێت هەموو دیاردەکانی دونیا لێک بداتەوە، وەک چۆن دونیا خۆشی لەناو یەک سیستمی گەورە یان بچووکدا کۆ ناکرێتەوە، هەمیشە زیاد لە ڕوانینێک و زیاد لە وێناکردنێک هەیە کە لەگەڵ یەکدا ناکۆک و ناتەبا و تەنانەت لە ململانێدان. پلورالیزم هەم داننانە بەم دۆخە تایبەتەدا، هەم چوارچێوەیەکە بۆ ڕێکخستنی ئەو جیاوازییانە لەگەڵ یەکدا.

بەڵام پلورالیزم تەنها هێما بۆ گۆڕانێک لە فیکر و گۆڕانێک لە واقیعدا ناکات لە ڕێگەی کۆچکردن و تێکەڵبوونی مرۆڤ و فەرهەنگ و بیرکردنەوە و ڕەمزە جیاوازەکانەوە بە یەکتری، بەڵکو هەمیشە گەشەیەکی ناوەکییش هەیە کە وا دەکات دونیا لە فۆرمێکی پلورالدا دەر بکەوێت. هەموو ئەوانەی لە بواری لێکۆڵینەوە لە دونیای کۆن و کلاسیکیدا شارەزان، باس لەوە دەکەن کە سەرلەبەری هێزە کۆمەڵایەتییەکانی ناو دونیای کۆن، سەرلەبەری چین و توێژە جیاوازەکان، یەکەی کۆمەڵایەتیی داخراو بوون. دونیای کۆن دونیای خێزانە دەسەڵاتدارە گەورە و داخراوەکان بووە، ئەوانەی پێیان وتراوە ئەشراف، ئەمانە سەرجەمی پلەوپایە و نازناوە کۆمەڵایەتییەکانیان لە ڕێگەی لەدایکبوونەوە بۆ ماوەتەوە و لەپاڵ ئەم نازناوانەشدا دەسەڵاتی سیاسی و ئایینی و داوەری و ئابوورییان پیادە کردووە بەسەر ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیی بچووکدا، کە زۆر جار بریتی بوون لە جووتیار و ڕاوچی و پیشەگەرە بچووکەکان.[1] ئەم مۆدێلە گەرچی ماوەیەکی درێژ

1_بڕوانە: فرانسوا شاتالی (١٩٨٤). تاريخ الافكار السياسيه. ترجمه د. خليل احمد خليل. بيروت. معهد الانما العربي. ل ١٣.

لە مێژوودا دەمێنێتەوە، بەڵام تەنانەت لەناو یۆنانی کۆن خۆیدا و لە ئەزموونی شار-دەوڵەتدا درزی گەورەی تێدەکەوێت و ڕێگە بۆ جۆرێک لە ئەزموونی سیاسی چۆڵ دەکات، کە کورت نابێتەوە بۆ ئەزموونی چەند خێزان و توێژێکی کۆمەڵایەتیی "داخراو." بیرۆکەی دروستبوون و هاتنەکایەی "دەستوور" لە یۆنانی کۆن خۆیدا، بەشێکە لەو هەوڵانەی لەباتی "داخران" هەوڵی "کرانەوە"ی کۆمەڵگە و دەوڵەت و دەزگا و پێکهاتەکان دەدات بە ڕووی ئەو جیاوازییانەی لەناو کۆمەڵگەدا هەیە. مەسەلەی سەرەکییش لەم دۆخە دەستوورییەدا ئەوەیە هەموو ئەندامێکی ناو ئەو شارانە خودشارەکان بە موڵکی خۆیان بزانن و مەسەلە گشتی و هاوبەشەکانی ژیانیان بەیەکەوە ڕێک بخەن و هەمووانیش ئامادە بن لە کاتی هێرش بۆ سەر شارەکەدا بەرگریی لێ بکەن. بێگومان ئەم ئەزموونانە پڕن لە کورتهێنانی گەورە و هەڵاوێردنی ئینسانی و چینایەتی و جێندەریی جیاواز، بەڵام دەشێت وەک سەرەتایەک بۆ هاتنەکایەی هەستکردن بە جیاوازی و هەستکردن بە پلورالیزم تەماشا بکرێن. ڕێکخستنی پلورالیزم ڕێکخستنی ململانێ و ناکۆکی و جیاوازییە گەورەکانی ناو ژیانی کۆمەڵایەتییە، بە ئاراستەیەک، زۆرینەی هەرە زۆری ئەو کۆمەڵگەیە ئەو ڕێکخستنە بە بەشێک لە بەرجەستەبوونی ئیرادەی خۆی بزانێت. ئەرکی ئەم چوارچێوە گشتییە پلوراڵە، وەک نووسەرێک دەڵێت، ئەوەیە "دوژمن"ەکان بگۆڕێت بە "ڕکابەر،"[1] دوژمنایەتی خۆشی بگۆڕێت بۆ ململانێیەکی هێمن

---

1_BERMAN, PAUL SCHIFF BERMAN (2013). Jurisgenerative Constitutionalism: Procedural Principles for Managing Global Legal Pluralism. Indiana Journal of Global Legal Studies Vol.

و یاسایی و دەستووری. بەڵام پلورالیزم هەمیشە کۆمەڵێک دوژمنی هەبووە، هەرگیز دۆخێکی مێژوویی نادۆزینەوە هێزگەلی دژەپلورالیزمی تێدا نەبێت، لەوانەش بۆ نموونە، دۆگماچییە هەقیقەتگەرەکان، سیستمخواز و ئایدیۆلۆژیستە داخراوەکان، پۆپۆلیستە دینی و نادینییەکان، ئەوانەش کە پێیان وایە هەڵگری چاوێکی خودایین و ئەمسەر و ئەوسەری جیهان و ئەمسەر و ئەوسەری مێژوو لە یەک نیگادا دەبینن. ئەمە جگە لە هەموو ئەو هێز و لایەن و فیکرانە کە فوو بە رۆحی فاشیزمدا دەکەن.

## هانا ئارێنت و پلورالیزم

ژنە فەیلەسووفی ئەڵمانی، هانا ئارێنت(١٩٠٦-١٩٧٥)، گرنگییەکی لەرادەبەدەر بە مەسەلەی پلورالیزم دەدات، ماناکانی ئەم گرنگیدانەش کاتێک بەباشی دەر دەکەوێت کە بزانین بەگژاچوونەوەی تۆتالیتاریزم سەرەکیترین ئەرکێکی گرنگە ئەم ژنە فەیلەسووفە دەیگرێتە ئەستۆی خۆی. هەموو پرۆژە فیکری و فەلسەفییەکەی هانا ئارێنت بەگژاچوونەوەی دیاردەی تۆتالیتاریزمە لە سەدەی بیستەمدا، لە هەموو ئاستەکاندا، بەتایبەتی لە ئاستی فیکری و فەلسەفیدا. هانا ئارێنت هەم خۆی وەک تاکەکەس و هەم ئەو کۆمەڵگەیەی تیایدا دەژیا، کۆمەڵگەی ئەڵمانی، قوربانییە راستەوخۆکانی تۆتالیتاریزم بوون. ئارێنت تۆتالیتاریزم وەک نەخۆشییە

---

20, Issue 2, P. 665.

سیاسییە هەرە ترسناکەکەی سەدەی بیستەم دەناسێنێت و وەک سیستمێکیش وێنای دەکات کە نەفییەکی تەواوی هەموو جۆرەکانی پلورالیزمە. لای ئارێنت، مانای هەرە سەرەکی و هەرە ترسناکی تۆتالیتاریزم لەوەدایە، کە سیستمێکە دژ بە پلورالیزم و جیاوازی، لەسەر لەناوبردنی هەموو ئەو مرۆڤ و گروپانە کار دەکات کە لەوانە ناچن کە فاشیزم بە کەسانی ڕەسەن و ڕاستەقینەیان دەزانێت. ئەگەر فاشیزم وەک شێوازی سەرەکیی تۆتالیتاریزم نەفیکردنێکی پەرگیر و بنەڕەتیی جیاوازییەکان بێت، ئەوا بەگژاچونەوە و ڕەتکردنەوەی تۆتالیتاریزم لە دیدی هانا ئارێنتدا بەبێ بەرگریکردنێکی سەرسەخت لە پلورالیزم بە کردەیەکی بێمانا دەزانێت. بۆ ئەنجامدانی ئەم کردەی بەگژاچوونەوەیەش، بەتایبەتی لە ئاستی تیۆرە و فەلسەفەی سیاسیدا، ڕەخنەیەکی گەورە و فراوان لە سەرجەمی ئەو کەلەپوورە تیۆریی و فەلسەفییە دەگرێت، کە لە ئەفلاتوونەوە دەست پێ دەکات و دەگاتە سەر مارتن هایدیگەر و کارل شمیت.[1] ئارێنت پێی وایە فەلسەفەی سیاسیی خۆرئاوا تا ڕادەیەکی زۆر لە دونیایەکی تەواو تیۆری و موجەرەددا سووڕاوەتەوە بەبێ گرنگیدان بە شێوازە کۆنکریتەکانی بوونی کۆمەڵایەتیی تاکەکەس و گروپەکان و بەبێ بەستنەوەی ئەم فیکرە بە شێوازە جیاوازەکانی کارکردنی کۆنکریتی مرۆڤەوە لەناو مێژوودا. بە مانایەکی دیکە، ئارێنت پێی وایە ئەم فەلسەفە سیاسییە ئەوەندەی گرنگی بە فیکری موجەرەد داوە، ئەوەندە گرنگیی

---

١_ بڕوانە: Hannah Arendt (2005). The Promise of Politics. Ed. Jerome Kohn. New York: Schocken.

بە دیاردەی سیاسەت نەداوە وەک چالاکیی دروستکردنی دونیایەکی هاوبەش بۆ مرۆڤەکان بەیەکەوە. ئارێنت پێی وایە کێشەیەکی تری فیکر لە خۆرئاوادا بەگشتی، ئیتر لە فەلسەفی و خوداناسییەوە بیگرە بۆ سایکۆلۆژیا و بایۆلۆژیا، لەوەدایە لە هەریەکێک لەم بوارانەدا بەبەردەوامی باس لە مرۆڤ دەکرێت بە مانا موجەرەد و تاکەکەسییەکەی، مرۆڤ وەک "یەک" تاکەکەس، وەک بوونەوەرێکی تەنها، مرۆڤێکی موجەرەد، لە کاتێکدا ئەوەی لە فیکر و فەلسەفەی سیاسیدا پێویستە، ئەوەیە بە کۆ باس لە مرۆڤ بکرێت، لەباتی باس لە "مرۆڤ" باس لە "مرۆڤەکان" بکرێت، کەی باسیش لە مرۆڤەکان بە کۆ کرا، ئەودەم باس لە پلورالبوونی مرۆڤەکان دەکرێت. چونکە مرۆڤەکان لە یەک جیاوازن و ئەوەشی دەیانکات بە مرۆڤ، ئەم دۆخی پلورالبوونەیە. لای ئارێنت، دۆخی پلورالبوون دۆخی سروشتیی مرۆڤەکانە و ئەوەی وا لە ئارێنتیش دەکات گرنگییەکی گەورە بە سیاسەت لە کارە تیۆرییەکانیدا بدات، ئەوەیە سیاسەت چالاکییەکە پەیوەستە بە ژیانی کۆیی و گشتیی مرۆڤەکانەوە و پێ لەسەر "پلورالبوونی مرۆڤ و پلورالبوونی مرۆڤایەتی دادەگرێت."[1]

بە مانایەکی دیکە، هەموو باسکردنێکی "مرۆڤ" بەموجەرەدی و بەگشتگیری، هەموو قسەکردنێک لەسەر "مرۆڤ" وەک شتێکی تاک و تەنها، بەشێکە لەو فیکرە تۆتالیتارییەی کە باز بەسەر پلورالبوونی مرۆڤەکاندا دەدات. خاڵی سەرەتا لای ئارێنت، ئەوەیە کە ناتوانێت هیچ جۆرە گشتگیرییەک سەبارەت بە مرۆڤ بکەیت، هەموو گشتگیرییەک

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو.

نەک تەنها هەڵەیە، بەڵکو تەواو ترسناکیشە، چونکە دەمانباتە بەردەم تۆتالیتاریزم، چ لە ئاستە فیکرییەکەیدا یان لە ئاستە سیاسییەکەیدا. تۆتالیتاریزم تەنها هێزێکی سیاسی نییە، بەڵکو جۆرێکی تایبەتیشە لە ڕوانین و بیرکردنەوە، فیکرێکە باز بەسەر دیاردە کۆنکریت و مرۆڤە کۆنکریت و کۆمەڵگە کۆنکریتەکاندا ئەدات، بۆ ئەوەی باسی "مرۆڤ" بە ڕەهایی و بە موجەرەدی بکات. لەم ڕووەوە بۆچوونێک کە هانا ئارێنت زۆر بەگژیدا دەچێتەوە، ئەو بۆچوونەیە کە پێی وایە مرۆڤ لەسەر وێنەی خودا دروست کراوە، چونکە لای ئارێنت، خودا یەکە و فرە نییە، تاکە و کۆ نییە، بۆیە شوبهاندنی مرۆڤ بە خودا، وێرانکردنی ئەو پلورالیزمەیە کە بەشێکی هەرە بنەڕەتیی ژیان و بەشێکی هەرە بنەڕەتیی بوونی مرۆڤەکانە.

بیرۆکەیەکی سەرەکی لای ئارێنت، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە پلورالیزمەوە هەیە، بیرۆکەی "سەرەتای تازە"یە. لای ئارێنت، گرنگترین ئاکاری دۆخی مرۆڤ و ئەو هەلومەرجەی مرۆڤ لەناویدا دەژی، تازەبوونەوە و دروستبوونی سەرەتای تازەیە. ئارێنت ئەم تێزە لە یەکەمین کتێبییەوە لەسەر چەمکی "خۆشەویستی لای ئۆگستینی قەشە" گەشە پێ ئەدات و لە کتێبی "هەلومەرجەکانی مرۆڤ"دا دەیکاتە یەکێک لە چەمکە سەرەکییەکانی ناو بیرکردنەوەی. بەشێک لە ئاکاری مرۆڤ وەک تاکەکەس و بەشێک لە ئاکاری کۆمەڵایەتیی دەستەجەمعیی مرۆڤەکان ئەوەیە کە دەتوانن لە خاڵێکدا ڕاوەستن و کۆتایی بە شتێک بهێنن بۆ ئەوەی "سەرەتایەکی نوێ" دەست پێ بکەن و شتێک ئەنجام بدەن، جیاواز لەوەی تا ئەو ساتە کردوویانە. دروستکردنی

سـەرەتای تـازە، هـەم بەشـێکە لـە ئـاکاری مرۆڤـەکان وەک تاکەکـەس و هـەم ئـاکاری کۆمەڵایەتیـی کۆمەڵگـەکان. ئەمـەش پابەسـتی ئـەو بۆچوونـەی ئارێنتە، کە پێی وایە مـرۆڤ بەتەنها یـەک جـار لەدایـک نابێـت، بەڵکـو دوو جـار لەدایـک دەبێـت. یەکەمیـان لەدایکبوونـی بایۆلۆژیـی ئینسـانە لەنـاو خێزانـدا، لەنـاو ئـەو فەزایـەدا کـە هانـا ئارێنـت نـاوی "فـەزای تایبەتـی"ی لـێ دەنێت. دووهەمیـان لەدایکبوونـەوەی مرۆڤـە لەنـاو "فـەزای گشـتی"دا، ئـەم لەدایکبوونـە ئـەو کاتـە ڕوو دەدات کـە مـرۆڤ دەچێتـە نـاو ئـەو "فـەزا گشـتیە"یەی ژیانـی پێکەوەبییـەوە کە لـە کۆمەڵگـەدا هەیـە، ئەمـەش فـەزای ژیانـی سیاسـی و کولتووری و ڕەمزیـی گشـتیی کۆمەڵگەیـە. ئەمـەش ئـەو جێگەیەیـە کـە مـرۆڤ دەتوانێـت تیایـدا شـتێکی نـوێ ببیسـتێت و خۆشـی شـتی نـوێ بڵێـت و ئەنجـام بـدات، زمانـی نوێـی گـوێ لـێ بێـت و هەبێـت و کاری نوێش ببینێت و ئەنجام بدات.[1] لەدایکبوونەوەی دووهەمی مـرۆڤ لەنـاو ژیـان و فـەزای گشـتیدا، پێداگرتنـی مرۆڤـە لەسـەر ئـەوەی کـە هەیـە و ئامادەیـە و کـە دەیەوێـت دەرەنجامەکانی ئەم هەبـوون و ئامادەبوونـەش بژی و هەردووکیشـیان و بگۆڕێـت بـە بەشـێک لـە بەرپرسـیاریەت بەرامبـەر بـە جیهـان. ئارێنـت تـا ئـەو شـوێنە دەڕوات کـە بڵێـت لەگـەڵ هـەر دەسـتکاریکردن و گۆڕانێکـی دونیـادا، مـرۆڤ جارێکـی دیکە لەدایـک دەبێتـەوە، بـەم لەدایکبوونەوەیـەش، مـرۆڤ دەگمەنبوونـی خـۆی وەک مـرۆڤ نیشـان ئـەدات. هـەم بـە خـۆی و هـەم بـە جیهانـی دەورووبـەری

---

١_ بۆ زانیاریی زیاتر لەسـەر ئەم تێزەی ئارێنت، بڕوانە: Hannah Arendt (1958). The human condition. Chicago: University of Chicago .Press. p 176-177

نیشان ئەدات، کە کەسێکە قابیلی ئەوە نییە بە هیچ کەسێکی دیکە بگۆڕدرێتەوە، هەروەها کەسێکە جیاوازییەکانی دەبن بە بەشێکی گرنگ لە بوونی ئەو. بەم جۆرە لەدایکبوونەوەی دووهەم لەدایکبوونەوەیەکی بەردەوامە و بەدرێژاییی ژیان لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەمێنێتەوە، چونکە لەدایکبوونەوەیەکە پەیوەستە بەوەوە مرۆڤ لەناو فەزا و ژیانی گشتیدا ئامادەیە.[1] بەم مانایە، مرۆڤ دەتوانێت بەردەوام دەسپێشخەریی تازەی هەبێت، بە ڕێگەی تردا بڕوات، پەنجەرەی تر بکاتەوە، شتی تازە پێشنیار بکات، زمانی تری هەبێت و بیر لە دونیای تر بکاتەوە. خاڵێک کە پێویستە ئاگامان لێی بێت، ئەوەیە کە ئارێنت باسی مرۆڤ وەک تاکەکەسێکی دابڕاو ناکات، مرۆڤبوون لای ئارێنت هەمیشە هاوشان و تێکەڵە بە مەسەلەی "لەگەڵ ئەویتردا بوون،" ژیان لای ئەم خانمە فەیلەسووفە، ژیانێکی پێکەوەییە، تیایدا ئەوانەی ئامادەن مرۆڤ نین لە دۆخی تاککەوتندا، بەڵکو مرۆڤن پێکەوە و لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا، مرۆڤن لەگەڵ یەکدا بە هەموو جیاوازییەکانیانەوە، بە بوونە پێکەوەییە هاوبەش و پلورالەکەیانەوە. هانا ئارێنت لە یەکێک لە دێرە هەرە جوانەکانی کتێبی "هەلومەرجی ئینسانی"دا دەنووسێت، "ئەوەی لەسەر زەوی دەژی، مرۆڤ نییە، بەڵکو مرۆڤەکانە،"[2] واتە مرۆڤ نییە بە تاک، بەڵکو مرۆڤە بە کۆ، مرۆڤە لەگەڵ یەک و لەپاڵ یەک و لەناو یەکدا.

لای ئارێنت، مرۆڤ هەر لە لەدایکبوونی یەکەمیدا بە کۆمەڵێک جیاوازییەوە دێتە ناو جیهانەوە، بە شووناسێکی

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٧٧

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٣٤

ڕەگەزیی تایبەتەوە، نێر یان مێ، بە شووناسێکی دینی و ئەتنی و نەتەوەییی تایبەتەوە. هەرکەسێک کە دێتە جیهانەوە، بە پەساپۆرتێکی ئەتنی و کولتووری و دینی و ڕەمزی و نەتەوەیی و ڕەگەزییەوە دێتە دونیاوە. بەڵام مرۆڤ هەمیشە زیاترە لە پەساپۆرتەکەی، لەو ئاکارانەی کە پێیانەوە هاتۆتە ناو دونیاوە. "ژیانی گشتی" ئەو جێگەیەیە کە مرۆڤ ئەم زیادبوونەی خۆی تێدا دروست دەکات و بە جیهانی نیشان ئەدات. مرۆڤ بۆ ئەوەی لە شووناسە جێگیرەکانی ڕزگاری ببێت، پێویستی بە ژیانی گشتییە. لەدایکبوونەوەی دووهەم لەناو فەزای گشتیدا لەدایکبوونی مرۆڤە بە شێوەیەک، جیاواز لەوەی لەسەر پەساپۆرتە ئەتنی و نەتەوەیی و دینی و فەرهەنگی و ڕەمزی و ڕەگەزییەکەی نووسراوە. ئەمە وا دەکات مرۆڤ هەرگیز نەتوانێت وەڵامی پرسیاری تۆ کێیت؟ یان پرسیاری مرۆڤ چییە؟ بەکامڵی بداتەوە، چونکە هەمیشە شتێک لە گۆڕانکاری لەناو مرۆڤدا هەیە، کە ناهێڵێت تەسلیمی ئەو زانیاری و ئاکارانە ببێت کە لەسەر شووناس و پەساپۆرتەکەی نووسراوە. وەڵامی بنبڕ بە پرسیاری "تۆ کێیت؟" بوونی نییە، هیچ پێناسێک ناتوانێت پێمان بڵێت مرۆڤ چییە و کێیە. ئەم نەزانینەش تەنها لەبەر ئەوە نییە کە مرۆڤ دەگۆڕێت و بیرکردنەوە و ئەزموون و ڕوانینی نوێی لا دروست دەبێت و لەپاڵ ئەمانەشدا وێنەی بۆ خۆی دەگۆڕێت و تازە دەبێتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەشە مرۆڤ هەمیشە لەگەڵ ئەوانی تردایە و لە بەردەمی ئەوانی تردا دەر دەکەوێت. ئەم لەگەڵئەوانیتردابوونەش، هەمیشە بارگاوییە بە بینین و ئەزموونکردنی شتی جیاواز. مرۆڤ

بەلای ئارێنتەوە، تەنها لەم دۆخی لەگەڵئەوانیتربوونەدا دەتوانێت دەگمەنبوون و تایبەتمەندبوونی خۆی نیشان بدات و بخاتە بواری کارکردنەوە. تەنها لەو کارکردنەشدا لەگەڵ ئەوانی تردا ئەم جیاوازبوونە بەوپەڕی هێزی خۆیەوە دەر دەکەوێت و قووڵاییەکانی ئاشکرا دەبێت. ئەوەی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا بەشی دەکەن، "لەدایکبوونی دووهەم"یانە، لەدایکبوونێکە کە هەم دەیانکاتە ئەندامی کۆمەڵگە و هەم هەموو جیاوازییەکانیشیان بەرجەستە دەکات.

لای ئارێنت، لەدایکبوونی یەکەم، خۆشی مانای هاتنی مرۆڤی نوێیە بۆ ناو جیهان، هاتنی کەسانێکە کە ئێمە نازانین دەبن بە چی و چ کار و دەستپێشخەری و پرۆژە و ئەزموونێک لەگەڵ خۆیاندا دەهێننە ناو دونیاوە. لە کتێبی "لەنێوان ڕابردوو و ئاییندەدا" ئارێنت بەم شێوەیە باس لە هاتنی منداڵە تازەکان بۆ ناو دونیا دەکات: "لەگەڵ لەدایکبووندا بەردەوام کەسانی تازە دێنە ناو دونیاوە، منداڵانی تازە دێن کە هیچ کەسێک لەوانەی لەو ساتەدا دەژین، ناتوانێت پێشبینیی ئەوە بکات ئەو منداڵانە چ کارێک لەناو جیهاندا ئەنجام ئەدەن."[1] لە دیدی ئارێنتدا، مرۆڤ بوونەوەرێکە لەدایک نابێت بۆ ئەوەی دواتر بمرێت، بەڵکو بوونەوەرێکە لەدایک دەبێت بۆ ئەوەی سەرەتایەکی نوێ دەست پێ بکات. ئەم توانای دەستپێکردنی سەرەتای تازەیەیە کە دەتوانێت جیهان ڕزگار بکات. لە کتێبی "هەلومەرجی ئینسانی"دا، هانا ئارێنت لەم بارەیەوە دەنووسێت: "ئەو موعجیزەیەی جیهان ڕزگار دەکات، بریتییە

---

١_بڕوانە: Hannah Arendt (1993). Between Past and Future. New York: Penguin Books. p 61.

لەو ڕاستییەی کە مرۆڤی تر لەدایک دەبن، لەدایکبوون کە لە ڕووی ئەنتۆلۆژییەوە بێشکەی هەموو تواناکانی جووڵانەوە و کردەی مێژووییە لای مرۆڤ."[1]

## خۆشویستنی جیهان وەک ئەرکی یەکەمی مرۆڤ

ئارێنت یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی کە باوەڕێکی گەورەی بە توانای مرۆڤ هەیە لە بەرەنگاربوونەوەی کێشە گەورەکانی دونیادا، بەتایبەتی ئەو کێشانەی کە لە ڕووکارە تاریک و مەترسیدارەکانی مۆدێرنەوە دێن. چەمکی "سەرەتای تازە" بەشێکە لە دیدی هانا ئارێنت بۆ مەسەلەی لەدایکبوون، کە لەگەڵ خۆیدا ئەگەری نوێ و توانای نوێ بۆ گۆڕانی دونیا دەهێنێت. ئارێنت پێی وایە لەگەڵ هەموو لەدایکبوونێکدا جۆرێک لە تواناش لەدایک دەبێت بۆ دروستکردنی سەرەتای نوێ، دەستپێکردنەوەیەکی تازە، دۆزینەوەی ڕێگەی تر. ئەگەر لای هایدگەر مردن یەکێک لە بیرۆکە هەرە سەرەکییەکانی ناو فیکر بێت، ئەوا لای ئارێنت پێچەوانەکەی مردن، واتە لەدایکبوون بیرۆکەی سەرەکییە. هایدیگەر مەسەلەی ئازادیی مرۆڤ بە مەسەلەی هۆشیاربوونی مرۆڤ بە مردنەوە گرێ ئەدات، بەڵام ئارێنت ئازادیی مرۆڤ بە مەسەلەی لەدایکبوون و سیحریبوون و هاتنەدونیاوە دەبەستێتەوە.[2] ئەگەر مردن لای

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٤٩

٢_بڕوانە: Siobhan Kattago (2013). Why the world matters: Hannah Arendt's philosophy of New beginnings. The European Legacy, Vol. 18, No. 2, p174

هایدیگەر بەسترابێتەوە بە مەسەلەی "بوون لەناو جیهاندا،" ئەوا مەسەلەی لەدایکبوون لای هانا ئارێنت بەستراوەتەوە بە بیرۆکەی بوون لەگەڵ ئەوانی تردا و بە بیرۆکەی "خۆشویستنی جیهان"ەوە، خۆشویستن وەک دیاردەیەکی تاکەکەسانە نا، یان وەک خۆشویستنی تاکەکەسێک بۆ تاکەکەسێکی تر بەتەنها نا، بەڵکو خۆشویستن وەک بەشێک لە هەستکردن بە بەرپرسیاربوون بەرامبەر بە ئەوانی تر و بەرامبەر بە جیهان.[1] خاڵی سەرەکییش لە خۆشویستنی جیهاندا مسۆگەرکردنی بەردەوامبوونی جیهان و ڕێگرتنە لە وێرانبوونی، لەپێش هەمووشیانەوە، وێرانبوونی فرەڕەنگی و فرەجیاوازی و پلورالبوونەکەی دونیا.

تا بەر لە هاتنی ئارێنت، فیکری فەلسەفی بە شێوەیەکی گشتی ئەوەندەی گرنگیی بە مردن و کۆتاییەکان ئەدا، هێندە گرنگیی بە لەدایکبوون و سەرەتاکان نەئەدا. لە سەردەمی هیگڵەوە ئێمە گوێمان لە کۆتاییی مێژوو، کۆتاییی ئایدیۆلۆژیا، مردنی خودا و مردنی مرۆڤ و مردنی هونەر و مردنی فەلسەفە و چەندان شتی دیکەی لەو بابەتە دەبێت: ژمارەی ئەو لاپەڕانەی لە مێژووی فەلسەفەدا لەسەر نائومێدی و مردن و کۆتاییەکان نووسراوە، لە ژمارە نایەن، بەدەگمەن نەبێت لەدایکبوون و سەرەتای تازە و ئومێد بەشێک نەبوون لە بیرکردنەوەی فەلسەفی. لەم ڕووەوە، هانا ئارێنت فەیلەسووفێکی دەگمەن و ناوازەیە. لەناو ئەو گروپە بچووکەدایە کە لە کەسانی وەک نیتشە و بێرجسۆن و ئێرنست بلۆخ پێک دێت. فەلسەفە لە خۆرئاوادا،

---

١_ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٤

وەک هانا ئارێنت دەڵێت، بەتوندی بە مەسەلەی مەرگەوە گرێ دراوە، مەیلێکی گەورەی بۆ مردن هەیە، تەواو بە مەرگەوە سەرقاڵە، ئەمەش وای کردووە گرنگییەکی ئەوتۆ بە وردەکارییەکانی ژیان و بە خودی ژیان خۆی نەدات. بەتایبەتی ژیان لەگەڵ ئەوانی تردا، ژیانی گشتی، ژیانێک مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا دابەشی بکات. ئەم مەیل و داشکانەش بەلای مەرگدا لە ئەفلاتوون خۆیەوە دەست پێ دەکات، ئەوەتا ئەفلاتوون کاتێک باس لە فەلسەفە دەکات، وەک "مەشقێک بۆ مردن" ناوی دەبات. ئەم ئیهمالکردنەی دونیا و گرنگینەدان بە ژیانی پێکەوەیی و لەگەڵئەویتربووندا وا لە هایدیگەر دەکات ساڵانێکی درێژ ئەندامی پارتەکەی هیتلەر بێت و بەبێ گوێدانە ئەو هەموو ئازار و تاوانانەی ئەم پارتە و ئەزموونی فاشیزم لە ژیانی ڕۆژانەدا بەرهەمی دەهێنا. لەم ڕووەوە، هانا ئارێنت سڵ لەوە ناکاتەوە هایدیگەر بە "گەمژەیەکی سیاسی" ناو ببات.

بە پێداگرتن لەسەر مەسەلەی لەدایکبوون و لەسەر مەسەلەی دونیاییبوون، هانا ئارێنت وێنەیەکی جیهانمان بۆ دەکێشێت، کە لەسەر لەیادچوونەوە و لەبیرکردنی جیهان و بوون کار ناکات، بەڵکو لەسەر دەرەنجامە ئەخلاقی و سیاسییەکانی بوون لەناو جیهاندا کار دەکات، لەسەر مەسەلەی بەسەرەکیکردن و بە سێنترالکردنی خودی جیهان خۆی و خودی کردە و جووڵەی مرۆڤ لەناویدا و مەسەلەی ئازادی و خۆ بەجیهانەوە گرێدان، کار دەکات. جیهانیش لەم ڕوانینە ئارێنتییەدا، جیهانێکە پڕ پەیوەندی و کارلێک و کارلێکی پێچەوانە، پڕ زمان و یادەوەری و

کولتوور و کەلەپوور و مێژووی جیاواز. خاڵی سەرەکییش لە بوونی مرۆڤ لەناو جیهانێکی لەو بابەتەدا، لە نووسان و خۆگرێدانەوە بەو جیهانەوە، بریتییە لە خاڵی لەگەڵئەوانیتردابوون، پێکەوەبوون لەگەڵ کەسانی تردا، بوونە بە دراوسێبوون لەناو جیهاندا، ژیان لەناو زمان و لەپاڵ زمانی تر و جیاوازدا. ئەم بەیەکەوەبوونەش لەگەڵ ئەوانی تردا، ئەگەری کردەی مێژوویی تاکەکەسی و دەستەجەمعی دەخولقێنێت و ئەم کردەیەش دەکات بە بەشێک لە ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵەکان. جیهانێک بەتەواوی مانا فرەڕەنگ و پلورال، کە پاراستنی سەرەکیترین بەرپرسیارێتیی مرۆڤەکانە لەناویدا.

وەک وتم، لای ئارێنت، لەگەڵ لەدایکبوونی هەر منداڵێکدا، یان لەناو کردەی لەدایکبوون خۆیدا، هەمیشە ئەگەری دەستپێکردنەوەیەکی نوێ و ئەگەری ئەنجامدانی شتگەلێکی نوێ، کە تا ئەو ساتە لە دونیادا بوونی نەبێت، ئامادەیە. ئارێنت پێی وایە مرۆڤ توانایەکی گەورەی لەسەر خۆشویستنی جیهان هەیە و هەر ئەمەشە هەم جیهان و هەم مرۆڤی پاراستووە، بەڵام لە هەمان کاتدا مرۆڤ بوونەوەرێکە توانای وێرانکردنی جیهانیشی هەیە، توانای نغرۆکردنی خۆی و ئەوانی تر و شتەکانی دەوروبەری هەیە. ئەوەی لەو ناوەندەدا هاوکێشەکان ڕادەگرێت، هەستکردنی مرۆڤە بە بەرپرسیاریەت بەرامبەر بە جیهان، هەستێکی ئەخلاقییە کە وا لە مرۆڤ دەکات جیهانی خۆش بوێت. خۆشویستنی جیهان لای ئارێنت گرێ دراوە بە مەسەلەی

مشـوورخواردن و خەمخـواردن لـە جیهـان، گـرێ دراوە بـە مەسـەلەی هەستکردن بەوەی کە بەرپرسیارین بەرامبەر بە جیهان، جیهانێک کە هەمیشـە جیهانێکی پلورال و پڕجیاوازییە و کـورت ناکرێتـەوە بـۆ ئـەم یـان ئـەو دەرکەوتـی بەتەنهـا. ئەوەشـی سیاسـەت لای ئارێنـت لـە فەلسـەفە جیـا دەکاتـەوە، ئەوەیە فەلسەفە کە باس لە مرۆڤ دەکات، هەمیشە باس لە مـرۆڤ دەکات وەک تاکەکەسـێک، لـە کاتێکدا سیاسـەت وەک کۆ بیـر لـە مـرۆڤ دەکاتـەوە، وەک کەسـێک لەگـەڵ ئەوانـی تـردا. فەلسـەفە بیـر لـە مـرۆڤ دەکاتـەوە و سیاسـەت بیـر لـە مرۆڤـەکان دەکاتـەوە، جیاوازییەکەشـیان لێرەدایـە، سیاسـەت لەباتی بیرکردنەوە لە کەسێک بەتەنها، بیر لە پلورالبـوون و جیاوازبوون و پێکەوەبوونی مرۆڤەکان بە کۆ لەناو جیهاندا دەکاتـەوە. لای ئارێنـت، کێشـەی فەلسـەفە لەوەدایـە، باسـی ئینسـان وەک بوونەوەرێکـی موجـەرەد، وەک تاکەکەسـێکی گەردوونـی دەکات، لـە کاتێکدا، بـە بۆچوونـی ئارێنـت، هەمـوو باسـکردنێکی مـرۆڤ بـەو موجـەرەدی و گشـتگیرییە، هـەم کوشـتنی فەردانیـەت و تاکەکەسـبوونی دەگمەنـی مرۆڤەکانـە، هـەم وێرانکردنـی پلورالبوونـی مرۆڤەکانیشـە. چونکـە وەک وتمـان، دەگمەنبوونـی مـرۆڤ تەنهـا لەپـاڵ مرۆڤەکانـی تـر و لەگـەڵ مرۆڤەکانـی تـردا دەر دەکەوێـت. ئەگـەر فەلسـەفە بەرجەسـتەکەری مـرۆڤ بێـت وەک کەسـێکی خاوەنمێشـک، ئـەوا سیاسـەت بەرجەسـتەکەری مرۆڤـە وەک بوونەوەرێـک لـە خوێـن و گۆشـت. ئەگـەر فەلسـەفە هەوڵـدان بێـت بـۆ گـەڕان بـەدوای ژیانێکـی باشـتر لـە دەرەوەی ئەشـکەوتە

ئەفلاتوونییەکەدا، واتە ئینکارکردن و نەفیکردنی ژیانی ڕۆژانە و ژیانی پێکەوەی پڕجووڵە و کردەی مرۆڤانە بێت، ئەوا سیاسەت سەرقاڵبوونە بە مرۆڤەوە لەناو ئەو ژیانە پێکەوەییە ڕۆژانەییەدا کە بەیەکەوە کۆیان دەکاتەوە، ژیانێکی هاوبەش کە مرۆڤەکان بەیەکەوە دروستی دەکەن و بەیەکەوە تیایدا نیشتەجێ دەبن و بەیەکەوە ئازارەکان و ناخۆشییەکان و خەونەکانی بەش دەکەن. لەو کاتەدا کە فەلسەفە ژیانی ڕۆژانە و پێکەوەیی مرۆڤەکان بە شتێکی کەمنرخ دەزانێت و پشت لە جیهان دەکات و بەدوای واقیعێکی بەرزتر و نرخدارتری ئەبستراکتدا دەگەڕێت، سیاسەت لەسەر ئەم جیهان و ژیانە کۆنکریت و بەرجەستە و پێکەوەییە کار دەکات. بەکورتی، هەموو فیکری هانا ئارێنت، بریتییە لە هەوڵدانێکی بێماندووبوون بۆ هەڵگرتنی هەموو ئەو سنوورانەی لەنێوان فەلسەفە و سیاسەتدا دروست کراوە، بۆ سڕینەوەی ئەو بۆشاییەی خراوەتە نێوان فەلسەفە و سیاسەتەوە. ئەوەشی بنەمای پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییەیە و ئەوەشی فەلسەفە و سیاسەت بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە، بریتییە لە هەستکردنێکی هاوبەش بە بەرپرسیارێتیی بەرامبەر بە جیهان، بەرپرسیاریەتێک هانا ئارێنت ناوی "خۆشویستنی جیهان"ی لێ دەنێت. جیهانێک، کە هەمیشە و هەردەم پلوراڵە و هەموو هەوڵدانێک بۆ سڕینەوەی ئەو پلورالیزمە، چ لە ئاستی فیکر و چ لە ئاستی سیاسەتدا، تاوانێکی گەورەیە و ئەرکی مرۆڤەکانە بە هەموو تواناکانیانەوە بەرەنگاری ببنەوە.

## جیانی ڤاتیمۆ و پلورالیزم

جیانـی ڤاتیمـۆ فەیلەسـووفێکی ئیتالییـە و خاوەنـی کۆمەڵێک ڕوانینـی گرنگـە دەربـارەی چەمکەکانـی جیـاوازی و هەقیقـەت و مـرۆڤ، کـە دەشـێت هاریکارمـان بن بۆ تێگەیشـتنێکی زیاتر لـە مەسـەلەی پلورالیـزم لـە ئاسـتە فەلسـەفییەکەیدا، بەتایبەتـی لـە دونیـای ئەمـڕۆدا، کـە دونیایەکـە پـڕە لـە ڕوانینـی فیکـری و فەلسـەفیی جیـاواز و پـڕە لـە ئامادەبوونـی زیاد لە گۆشـەنیگایەک بـۆ وێناکردنـی هەریەکێـک لـەو چەمکانـە. ڤاتیمـۆ جیـاوازی نابەسـتێتەوە بـە مەسـەلەیەکەوە، پابەسـتە بـە لەدایکبـوون و سـەرەتای تـازەوە، واتـە نایبەسـتێتەوە بـەو دیـدەوە کـە هانـا ئارێنـت لەسـەر لەدایکبوونـی مـرۆڤ و دروسـتبوونی بەردەوامـی سـەرەتای تـازە هەیەتـی. بـە مانایەکـی تـر، ڤاتیمـۆ مەسـەلەی جیـاوازی و پلوالیـزم نابەسـتێتەوە بـە ڕاسـتییەکی ئەنترۆپۆلۆژییـەوە، بەڵکـو دەیبەسـتێتەوە بـە هەوڵـدان بـۆ ڕزگاربـوون لـەو تەماحـە فەلسـەفییانەی دەیانەوێـت هەمـوو دونیا لـە ڕێگـەی چەنـد تێز و پرنسـیپێکی کەمـەوە تەفسیربکەن. ڤاتیمۆ لـەو خاڵـەدا لەگـەڵ هانـا ئارێنتدا هاوڕایە، کـە ئیشـی فیکر بریتییـە لـە گرنگیدان بـە "فـەردی" و "تایبەت" و بەخشـینی دەنگ بەوان لـە دژی سـتراکتور و سیسـتمە گەورەکانـی نـاو فیکر. لـە سـەردەمی کانتـەوە، پرسـیاری ئـەوەی ئایـا مـرۆڤ دەتوانێـت چیـی بزانێـت، یەکێکـە لـە پرسـیارە گرنگەکانـی نـاو فیکـر. پرسـیارەکە پرسـیارێکی ئەپسـتمۆلۆژی و مەعریفییـە، بـەڵام

شێوازی وەڵامدانەوەی و خودی وەڵامەکانی ئەو پرسیارە، دەرەنجامی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئینسانیی گەورەی لێ دەکەوێتەوە. لای کانت، مرۆڤ دەتوانێت تەنها لە هەندێک بواردا "هەقیقەت"ی شتەکان و دیاردەکان لە ڕێگەی لێکدانەوەی عەقڵانییەوە بزانێت، زانست شتێکی تایبەتمان لەسەر دونیا پێ دەڵێت و برێک لە نهێنییەکانمان بۆ لێک ئەداتەوە، بەڵام زانست سنووری خۆی هەیە و ئەوەشی هێجگار گرنگە، بەئاگابوونی خودی زانست خۆیەتی لە سنوور و توانا تایبەتییەکانی. کانت داوای ئەوە دەکات، زانست خۆی بە ڕەها نەکات، دۆزینەوەکان و شێوازە جیاوازەکانی مەعریفەی زانستی بەڕەها نەکات، بەڵکو لەوە تێبگات، کە ئەوەی بەدەستی هێناوە بەرهەمی ئیشکردنی کایەیەکی دیاریکراوە و کە گریمانە و میتۆد و شێوازی ڕوانین و بەرخوردیی تایبەتی هەیە. کانت لەپاڵ ژیانی عەقڵ و مەعریفەی زانستیدا باس لە جۆرە ژیانێکی دیکە دەکات کە بە "ژیانی ئەخلاقی"ی ناو دەبات و ئەم ژیانەشی بە هەمان ڕادەی ژیانی عەقڵی و زانستی بەلاوە گرنگە، ئەگەر گرنگتریش نەبێت. لای کانت، مرۆڤی عەقڵانی و مرۆڤی ئەخلاقی یەکتری تەواو دەکەن و لەوە تێدەگەن کە زانین و ناسینی دونیا سنووری هەیە و لە خاڵێکدا دەوەستێت، مرۆڤی عەقڵانی سەرەتا و کۆتاییی مرۆڤبوون نییە و ئەخلاقیبوونی مرۆڤ ڕەهەندێکی دیکەی مرۆڤبوونە، کە گرنگییەکی لەڕادەبەدەری هەیە. مرۆڤی عەقڵانی مرۆڤی زانستە و مرۆڤی ئەخلاقییش مرۆڤی هونەر و ئەدەبیات و دین و سەرجەمی ئەو چالاکییانەیە کە ناچنەوە ناو چالاکییە عەقڵییەکانەوە. لای کانت، ئەم دووانەش لە یەکتری جیاوازن

و کەسیان ناتوانێت بچێتە شوێنی ئەوی تریان و کەسیشیان ناتوانێت وەزیفەی ئەوی تریان ببینێت. ئەم ڕوانینە کانتییە لە مێژووی فیکردا دەرگای بەسەر چەندەها مەسەلەی فیکریی نوێدا کردۆتەوە، لە هەموویان گرنگتر ئەوەیە کە وەلامێکی بنبڕ بەو پرسیارانەی مرۆڤ بوونی نییە کە سەبارەت بە "جەوهەر"ی شتەکان و "دواهەمین ماناکان" دەکرێن. مرۆڤ ڕەنگە لە هەندێک ڕووبەر و ئاستی دیاریکراودا بە دڵنیاییی ڕەها بگات، بەلام لە زۆر ڕووبەر و ئاستی دیکەدا وەلامێکی بنبڕی بە پرسیارەکانی دەست ناکەوێت. ئەمە ئەگەر بۆ سەدەی هەژدەهەم و لای فەیلەسووفێکی وەک کانت ڕاست بووبێت، کە دونیا هێشتا پڕ بووە لەو ڕوانین و دونیابینییانەی کە وەلامی ڕەهایان بە پرسیارە گەورەکان هەبووە، ئەوا لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا، کە دونیا فرەدین و فرەکولتوور و فرەڕوانین و فرەدونیابینییە و تەنانەت هەموو ئەمانە دەکرێت لەناو یەک تاکەکەسدا بدۆزرێتەوە، زۆر ڕاسترە. بۆیە ئەوەی لەمرۆدا پێویستە، جۆرێکی دیکە لە بیرکردنەوەیە کە لە خەمی دۆزینەوەی جەوهەرەکان و هەقیقەتە ڕەهاکاندا نەبێت. ئەگەرچی ڤاتیمۆ فەیلەسووفێکی کانتی نییە، بەلام درێژە بەو دیدە کانتییە ئەدات کە ڕەخنە لە ناسینێکی ڕەهای بابەتییانەی دونیا و مرۆڤەکان دەگرێت و پێی وایە دەکرێت **"هەقیقەت"**ی شتەکان بۆ هەمیشە و هەتاهەتایە بزانین و بدۆزینەوە.

ڤاتیمۆ بۆ بەرگریکردن لە پلورالیزم، جۆرێک لە بیرکردنەوە پێشنیار دەکات کە ناوی "بیری لاواز،" یان "بیری بێزەبر"ی لێ دەنێت. ئەمەش ئاماژە بۆ ئەو جۆرە لە بیرکردنەوە دەکات، کە لە هەوڵی ئەوەدایە بوونیادە بالادەست

و سوننەتییەکانی بیرکردنەوە لە بوونیادی گشتگیر و تۆتالەوە بگۆڕێت بۆ بوونیادی خەفیفتری بێزەبر و بۆ بوونیادی لاوازی بێموتڵەق. ئەم لاواز و بێزەبرکردنەی فیکر، ئەم فیکرە لاوازە، بە مانای بیرنەکردنەوە یان لاوازکردنی تواناکانی بیرکردنەوە نایەت، مانای ئەوە نییە مرۆڤ میتۆدی نەبێت لە بیرکردنەوەدا، تێز و تیۆرەی تایبەتی نەبێت و هەوڵ نەدات بە شێوازی زانستییانە بیر بکاتەوە، بە پێچەوانەوە، بیر یان فیکری لاواز مانای کامڵبوونی فیکر و بەهێزبوونی لۆژیکی بیرکردنەوە لە ڕێگەی تێگەیشتنێکی هێمن و بێحەماسەت و بێتەماحی خورافی، لەو ڕاستییەی کە فیکری تیۆری پێویستە فیکرێکی نارەها بێت، سنوورەکانی خۆی بزانێت، تەماحی ئەوەی نەبێت ببێتە ئاسۆیەکی میتاتیۆری گەورە، هەمووان ناچار بن تەنها تەماشای ئەو بکەن. فیکری لاواز مانای ڕێگەگرتن لە دروستبوونی فیکری تۆتال و فیکری تۆتالیتاری، مانای دابەزاندنی فیکر بۆ ناو سیاقە مێژووییە جیاوازەکان، بەستنەوەیان بە بکەرە مێژووییە کۆنکریتییەکانەوە، وازهێنان لە خەباتی چەکداری لەناو فیکردا، کۆتاییهێنان بە تیرۆریزمی تیۆری و فیکری. مەبەستی ڤاتیمۆ لە دەستەواژەی "بێزەبر" یان "لاواز" دوو شتە: یەکەمیان پێداگرتن لە پلورالیزم و ناکامڵیی فیکر، دووهەمیان کۆتاییهێنان بە بیرۆکەی دواهەمین هەقیقەت. پلورالیزم هێمایە بۆ بوونی چەندەها تیۆرەی جیاواز، چەندەها لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی جیاواز، چەندەها تێزی جیاواز، چەندەها هەقیقەتی جیاواز، چەندەها چەمک و دەستپێکی جیاواز، کە هەموویان پێکەوە و لەیەک کاتدا ئامادەن و هەمووشیان شەرعییەتی تایبەتیان هەیە.

دووهەمیان مانای ئەوەیە، هیچ تێکستێک، هیچ لێکدانەوە و هەقیقەتێک، هیچ تێزێک دواهەمین لێکدانەوە و دواهەمین هەقیقەتی قەتعی نییە.[1] ئەمەش ئەو جۆرەیە لە فیکر، کە لە نادڵنیایی و گومانەکانی خۆی ئاگادارە، هۆشیارە بەوەی کە کامڵ نییە، ڕێژەییبوونی خۆی دەبینێت و ئەگەری فیکریی تر و تیۆرەی تر و لێکدانەوەی تر نەفی ناکات. فیکری لاواز وەک وتم، فیکرێکە خەباتی چەکداری دژ بە هەموو شێوەکانی تری فیکر ناکات، هەڵگری تیرۆری فیکری و نەفیکردنی ڕوانگەکانی تری بیرکردنەوە و تەماشاکردن ناکات. ئەم شێوازە لە بیرکردنەوە، هەم بنەمایەکی ئەپستمۆلۆژیی هەیە، کە دژ بە ئەپستمۆلۆژیایەکی ڕەهایە بۆ هەقیقەت، هەم بنەمایەکی مێژوویی هەیە، کە ئاگاداربوونە هەم لە ئاڵۆزییەکانی ناو ساتەوەختە مێژووییەکان و هەم لە ئاکاری کاتیبوون و ڕێژەییبوون و پلورالبوونی ئەو ساتانە.

ڤاتیمۆ کتێبی "فیکری لاواز" لە ساڵی ١٩٨٣دا دەنووسێت، لە ڕەوتێکی تیۆری و فیکریدا کە تێزی سەرەکی لەناویدا تێزی "قەیرانەکانی عەقڵ"ە. لە ساڵانی هەشتادا ئەو باوەڕە سادەیەی ڕۆشنگەری بە عەقڵی هەیە، تەواو لاواز دەبێت و چەندەها شێوازی بیرکردنەوە دێنە کایەوە کە گومان لە تواناکانی عەقڵ دەکەن. ئەم تێزەی "قەیرانەکانی عەقڵ" لەناو پێکدادانی چەندان شێواز و میتۆدی جیاوازی بیرکردنەوەدا لەدایک دەبێت، لەوانەش دیدە جیاوازەکانی مێژووگەرایی،

---

١_بڕوانە: Vattimo, Gianni (2010). The responsibility of the philosopher. Ed. Franca D'agostini. New Yory: Columbia university press.p. 2-3.

historicism، مارکسیزم، بوونیادگەرایی و بیرکردنەوەی نێگەتیڤ، ئەمە جگە لە چەندان شێوازی بیرکردنەوەی ئایینیی جیاواز، تیۆرەی ئەخلاقی و ڕوانینی ئەپستمۆلۆژی و دیدگەی تەئویلی هەمەڕەنگ، کە بەسەر یەکەوە دۆخێکی فیکری و تیۆری و ئەپستمۆلۆژی دروست دەکەن، کە فرەڕەهەند و فرەجۆر و ناکۆک و دژبەیەکە. تیزی "فیکری لاواز" لای ڤاتیمۆ، ڕەخنەیەکی هێمنە هەم لە مێتافیزیکا و هەم لە ئایدیۆلۆژیا، ڕەخنەیە لەو شێوازانەی فیکر، کە لەدەوری چەمکەکانی "جەوهەر" و "بوونیادی قوول" و "بنەمای گەردوونی" و "سیستم"ی دونیایی ڕێک خراون، فیکرێک پێی وابێت دەتوانێت گوزارشت لە "هەلومەرجێکی موفاریق" بکات کە لە هەموو بەشەکانی دونیادا ئامادەیە و لە پشتی هەموو مێژووە ناوچەیی و لۆکاڵییەکانەوە ئامادەیە. "فیکری لاواز" بەستنەوەیەکی توند و فرەلایەنی دیدگە تیۆرییە جیاوازەکانە بە دۆخە مێژووییە کۆنکریتەکانەوە، فیکرێکە، ئەوە لەبیر ناکات کە زیاد لە ئاسۆیەکی کولتووری، زمانەوانی، مێژوویی و چەمکیی هەیە و لەباتی پێداگرتن لەسەر بوونی ژێرخان یان بنەمای بابەتی، باس لە بوونی ژێرخان و بنەمای تەئویلی دەکات.[1] لەم فیکرەدا ڕاڤەکردن و لێکدانەوە ئامادەیە نەک دۆزینەوەی هەقیقەتی بابەتی، بۆیە ئەم فیکرە ئەگەر بنەمایەکی سەرەکییشی هەبێت، کە لەسەری دروست بووبێت، ئەوا ئەو گرێدانە کۆنکریتەی فیکرە بە واقیعەوە، هەم فیکر وەک دیاردەیەکی کۆیی و هەم واقیعیش وەک دیاردەیەکی کۆیی.

---

١_بڕوانە: Vattimo, Gianni & Pier Aldo Rovatti (2012). Weak Thought. State University of New York Press.p. 5

فیکری لاواز، فیکرێکە ئاڵۆزییەکانی ناو دونیای گواستۆتەوە بۆ ناو فیکر خۆی، نەک تەنها وەک تێز و تیۆرە، بەڵکو لە ئاستی شێوازەکانی بیرکردنەوە و لە ئاستی بیرکردنەوەی ئەپستمۆلۆژیدا.

کێشەی سەرەکیی ئەم فەیلەسووفە ئیتالییە لەگەڵ چەمکی هەقیقەتدایە، وەک زۆرێک لە فەیلەسووفانی سەدەی بیستەم، چەمکی هەقیقەت جێگەی تێرامانی ئەم پیاوەیە. ڤاتیمۆ سەبارەت بە هەقیقەت ئەم چوار ڕوانینە بنەڕەتییە نیشان ئەدات:[1]

١- هەقیقەت بەرهەمی پاسادان و بەڵگەهێنانەوەی بابەتی نییە، بەڵکو دەرەنجامی پرۆسەی شیکردنەوە و سەلماندنێکی تایبەتە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە هەقیقەت بنەمایەکی میتافیزیکی یان لۆژیکیی نییە، بەڵکو بنەماکانی لەناو زماندان، لەناو کۆمەڵێک ڕیتۆریک و گووتاردا.

٢- پرۆسەی شیکردنەوە و سەلماندنیش هەمیشە لەناو ئاسۆیەکی تیۆری و فیکریی کۆنترۆلکراودا دێتە کایەوە، کە تیایدا پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و ئینسانیی جیاواز و پەیوەندیی نێوان نەوەکان و سەردەمە مێژووییە جیاوازەکان، ئامادەیە. ئەمەش مانای ئەوەیە، هیچ هەقیقەتدۆزێک لە خاڵی سفر و سەرەتاوە دەست پێ ناکات، بەڵکو هەمیشە لەناو کۆمەڵێک بڕوا و قەناعەت و ئینتیما و لەناو کۆمەڵێک پەیوەندیی مەعریفی و نامەعریفییەوە دەست پێ دەکات. بەم مانایە، هەقیقەت هەمیشە لەناو ئاسۆیەکی تەئویلی و زمانەوانیی تایبەتدا بەرهەم دێت، نەک لەناو بۆشاییدا یان لەناو کردەیەکی

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨

بێگەرد و پاکژی بیرکردنەوەدا.
٣- هەقیقەت هەمیشە بەرهەمی لێکدانەوە و ڕاڤەکردنە، نەک دۆزینەوەی پێدراوێکی بابەتی لەدەرەوەی مێژوو و لە دەرەوەی زمان و لە دەرەوەی مرۆڤبوونێکی کۆنکریتدا.
٤- هەقیقەت پەیوەستە بە پراکتیک و جوولە و هەڵسوکەوت و ئەزموونی مرۆڤ خۆیەوە، مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی کۆنکریت، کە لەناو چوارچێوەیەکی ڕەمزی ئامادەیە و خاوەن کۆد و ڕێکەوتن و خو و ڕەوشتی تایبەتە. ئەم دۆخە پراکتیکییەی مرۆڤ، هەم سەرزەمینی بەرهەمهێنانی هەقیقەتە و هەم خۆشی بەشێکە لە کردەی بەرهەمهێانی ئەو هەقیقەتە.

هەموو ئەمانە ئەوە نیشان ئەدەن، کە ڤاتیمۆ مەسەلەی جیاوازی و پلوالیزم نابەستێتەوە بە ڕاستییەکی ئەنترۆپۆلۆژییەوە، وەک هانا ئارێنت دەیکات، بەڵکو دەیبەستێتەوە بە دەستپێکێکی سۆسیۆلۆژیی ئەپستمۆلۆژییەوە، بە شێوازی بەرهەمهێنان و تێگەیشتن لە هەقیقەتەوە. ڤاتیمۆ پلورالیزم وەک پێدراوێکی ئەنترۆپۆلۆژی مامەڵە ناکات، بەڵکو وەک پێدراوێکی سۆسیۆلۆژی و مەعریفی مامەڵەی دەکات. ئەوەی ڤاتیمۆ ئەنجامی ئەدات، بەستنەوەی جیاوازی و پلورالیزمە بە کۆمەڵێک گۆڕانکاریی گەورەوە لە دونیای ئەمڕۆدا، کە وای کردووە پلورالیزم ئاکاری سەرەکیی ئەو دونیایە بێت. ئەم دەستپێکە سۆسیۆلۆژییە ئەپستمۆلۆژییە بە یەکێک لە مردنە هەرە گەورەکانی مێژووی دوو سەد ساڵی ڕابردوو دەست پێ دەکات، مەبەستم مردنی خودایە بە مانا نیتشەییەکەی. لای ڤاتیمۆ، دونیای ئەمڕۆ دونیایەکە، خودای وەک هێزێک تێدا نەماوە کە بتوانێت یاسا بۆ هەموو مرۆڤایەتی دابنێت و

ئەمر و نەهییەکانی ئەمر و نەهییەکی سێنترالّی و گەردوونی بێت و بۆ هەموو شوێن و جێگەیەکی سەر ئەم ئەستێرەیە بخوات. دونیای ئەمرۆ بە ڕادەیەک ئاڵۆزە، کە ناکرێت هیچ دید و ڕوانین و تیۆرەیەک تەماحی ئەوەی هەبێت بەدوای "هەقیقەت"ی گریمانکراوی ئەو دونیایەدا بگەڕێت. مردنی خودا لە خوێندنەوەی ڤاتیمۆدا، تەنها ئاشکراکردنی مردنەکە و ڕاگەیاندنی هەواڵەکەیە، نەک ئەوەی ئیدیعایەک بێت، فیکرێک یان تیۆرەیەک یان میتۆدێک لە میتۆدەکان بیکات، چونکە ئیدیعاکردنی مردنی خودا خۆی دەشێت ببێت بە بنەمای میتافیزیکێکی نوێ لە بەرگێکی تازەدا. بەم مانایە، مردنی خودا مانای ئەوە نییە کە ئەپستمۆلۆژیایەکی هەڵە کۆتایی پێ هاتووە و ئەپستمۆلۆژیایەکی ڕاستتر جێگەکەی گرتۆتەوە، بەڵکو مانای ئەوەیە، هەموو ئەپستمۆلۆژیایەک کە تەماحێکی گەردوونی و ڕەهای هەبێت، پەکی کەوتووە. لای ڤاتیمۆ، ئەوەی لە دونیای ئەمرۆدا مردووە میتافیزیک و بوونیادە گەورە و ڕەهاکان و ئەو هەقیقەتانەیە کە خۆیان بە هەقیقەتی گەردوونیی جیاوازی قبوڵنەکەر دەزانن، هەقیقەتی تۆتالی، ئەو هەقیقەتانەی پێیان وایە گوزارشت لە "جەوهەر" و "بوونیادی قووڵ" و نهێنییەکانی "سیستم" دەکەن. ڤاتیمۆ ئەم مردنە گەورانە دەکات بە سەرەتای لەدایکبوونی جۆرێکی نوێ لە بیرکردنەوە کە ناوی "بیرکردنەوەی لاواز" یان "بیکردنەوەی بێزەبر" ناودەبات.[1] مردنی خودا لای ڤاتیمۆ، مردنێکە بووە

١_بڕوانە: Vattimo G and Zabala S (2011) Hermeneutic Communism: From Heidegger to Marx. New York Columbia .University Press. p 96

بە ڕووداو، شتێکە ناکرێت ڕێ لە ڕوودانی بگیرێت، ناکرێت بگەڕێینەوە بۆ ساتەوەختی بەر لەو مردنە، ڕەنگە کەسانێک هەبن ئینکاریی ئەم مردنە بکەن، خۆیانی لێ لا بدەن، وا بجوولێنەوە و بژین و بیر بکەنەوە، وەک ئەوەی خودا بە مانا نیتشەییەکەی نەمردبێت، بەلام هەموو ئەمانە هیچ لە ڕوودانی مردنی خودا کەم ناکەنەوە و نابنە هۆی گەڕانەوە بۆ سەردەمی پێش ئەو ڕووداوە. لەدوای مردنی خوداوە، هیچ زەمینە و بنەمایەک نامێنێتەوە بۆ بەرگریکردن لە هەقیقەتێک کە لە هەموو شوێنێکی دونیادا و لە هەموو کایەیەکدا و لای هەموو مرۆڤێک بخوات. هەقیقەت وەک میتافیزیک و گیانەوەرێکی زەبەلاح کۆتاییی پێ دێت، ئەمەش سەردەمی هاتنەکایەی "بیرکردنەوەی بێزەبرە."[1] ئەم بیرکردنەوەیەش بیرکردنەوەیەکی ڕێژەگەر نییە، ئەوەی بەرگریی لێ دەکات ڕێژەگەرایی نییە، بەڵکو جۆرێکە لە بیرکردنەوەی دیالۆگی، بیرکردنەوەیەک لەسەر بەشداربوون کار بکات، یاخود خۆی وەک بەشداربوویەک ببینێت و کار بکات.[2]

بنەمای بەرگریکردنی ئەم فەیلەسووفە لە پلورالیزم، پابەستی دروستکردنی مەسافەیەکی ئەخلاقی و مەعریفی و فەلسەفییە لە جەنگی هەقیقەتەکان لەگەڵ یەکتریدا. بۆ خۆپاراستن لەم جەنگە، ڤاتیمۆ دیدێک بۆ "هەقیقەت" گەشە پێ ئەدات، کە ڕەها و گشتگیر و گەردوونی نییە، بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە بکەوینە ناو ڕێژگەرایییەکی ڕەهاوە، ناو دۆخێکەوە، وا دەر

١_بڕوانە: Grimshaw, Mike (2014). Flaneuring with Vattimo: the annotative hermeneutics of weak thought. Critical research on Religion. Vol. 2(3)p.267

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٧٠

بکەوێت هەموو ڕایەک هەقیقەتێک بێت و هەموو هەقیقەتێکیش ڕایەک. ڤاتیمۆ دەڵێت، کاتێک نیتشە هاوار دەکات "خودا مرد،" ئەمە مانای ئەوە نییە کە هیچ بەهایەک لە ژیانی مرۆڤدا نامێنێتەوە، بەڵکو مانای ئەوەیە بەهایەک نامێنێتەوە کە بەهای هەموو بەهاکان بێت، سوپەربەها و تاکە بەها بێت، بەهایەک، کە بەتەنها هیی گرووپێک بێت. مردنی خودای نیتشەیی، مانای ئەوەیە شتێک نامێنێتەوە کە سەرچاوەی هەموو ڕاستییەکان بێت، بۆ ڕاستی زیاد لە سەرچاوەیەک دروست دەبێت. ڤاتیمۆ دەڵێت مەرگی خودا لای نیتشە مانای نەمانی خودا نییە، بەڵکو مانای دابەشبوونی خودایە بۆ چەندان خودای بچووک و سنووردار، نیتشە لە دیدی ڤاتیمۆدا بانگەشە بۆ بێخودایی ناکات، بەڵکو بانگەشە بۆ کۆمەڵێک خودای بچووک دەکات، ڤاتیمۆ ئەم هاوارە نیتشەییيە ناو دەنێت بانگەشەکردن بۆ "ئەخلاقیاتی فرەخودایی."[1] بەڵام ئەم خودا بچووکانە خودای ئاسمانی نین، خودایەک نین لە دەرەوەی جیهاندا بوونیان هەبێت، بەڵکو خودایەکن لەناو جیهاندا، بەشێکن لە ڕووبەرە ماتریالانەکەی بوون، خودایەکن بەشدارن لە جیهاندا و ڕەنگە بچنە دیالۆگیشەوە لەگەڵ خوداکانی تردا. ئەم سەرزەمینی و دونیاییبوونەی خودا بچووکەکان، وا دەکات نەمر و ئەبەدی نەبن، بکرێت بمرن، هەر بەڕاستییش دەمرن و خودای بچووکی تر لەناو دونیای ماتریالی و ڕۆحی نوێدا لەدایک دەبن. ڤاتیمۆ پێی وایە لەم دۆخەدا زیاد لە پێناسە

---

١_بڕوانە: Vattimo, Gianni and Santiago Zabala (2002). "Week Thought" and the reduction of violence. A dialogu with Gianni Vattimo. Common Knoweledge, Volume 8, Issue 3,, Fall 2002, .P. 454

و ڕوانینێک بۆ دونیا لەدایک دەبێت، زیاد لە گۆشەنیگایەک و زیاد لە ستراتیژیەتێکی تەئویلی، ئەوەی لەم دۆخەدا پێویستە، گەڕانەوە بۆ خودایەکی گەورە، بۆ سیستمێکی گەردوونی، بۆ تیۆریەک نییە هەموو دونیامان بۆ لێک بداتەوە، بەڵکو دروستکردنی ئەخلاقیاتی دیالۆگە لەنێوان ئەو خودا بچووک و ڕوانین و لێکدانەوە جیاوازانەی ناو دونیادا. ڤاتیمۆ دەڵێت، ئەوەی گرنگە لەم دیالۆگەدا ڕوو نەدات، ئەوەیە نەگۆڕدرێت بۆ "جەنگێکی دۆگماییانە لەنێوان کۆمەڵێک هەقیقەتی ململانێکەر لەگەڵ یەکدا."[1] "بیرکردنەوەی بێزەبر" ڕۆڵی ئەوەیە نەهێڵێت ئەو جۆرە پێکدادانە دۆگماییانە ڕوو بدەن، چونکە لە دونیای ئەمڕۆدا ئەو جۆرە پێکدادانانە کارەساتی گەورە دروست دەکەن. ڤاتیمۆ دەڵێت، هیتلەر، کە شەش ملیۆن جوولەکەی کوشت، لەبەر ئەوەی "ڕای" وا بوو کە جوولەکە خراپن، مەسەلەکە لای هیتلەر هەر لە بنەڕەتەوە مەسەلەی ڕا نەبوو، بەڵکو ئەو پێی وا بوو، ئەوەی ئەو باوەڕی پێیەتی و ئەوەی ئەو ئەنجامی ئەدات، تاقە "هەقیقەت" و "ڕاستییەکی زانستی"یە کە قابیلی گومانلێکردن نییە.[2]

لەم ڕوانینەدا هەر فیکرێک وا دەستی پێ کرد کە بڵێت "هەڵەیە پێمان وا بێت دونیا وایە، نا دونیا ئاوایە..." یان ئەمە لۆژیکی بیرکردنەوەکەی بێت "ئەوە ڕاست نییە کە... بەڵکو ئەوە ڕاستە کە..." ئەم جۆرە کلێشە فیکرییانە کلێشەی ترسناکن، زادەی فیکرێکن، ئەوەندەی خەریکی "هەقیقەتفرۆشی"یە، کە یەکێکە لە ترسناکترین بازرگانییەکانی دونیای ئەمڕۆ، ئەوەندە

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤٥٤.
٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤٥٤

لە خەمی باشترکردنی دونیادا نییە بۆ ئەوەی شوێنی جیاوازییە زۆرەکانی تێدا ببێتەوە. ئەو شێوازە لە بیرکردنەوە، شێوازی دابەشکردنی دونیایە لەنێوان هەڵە و ڕاست، زانست و جەهل، ئەوەی دەبێت بکرێت و ئەوەی دەبێت لەناو ببرێت. هەرکەسێک وتی دونیا وا نییە بەڵکو وایە، هەقیقەت ئەوە نییە بەڵکو ئەمەیە، دوورە لە بیرکردنەوەیەکەوە کە شوێنی لانی کەمی جیاوازی و دیالۆگ و ڕاگۆڕکێی تێدا ببێتەوە. لە دیدی ڤاتیمۆدا، هیچ فیکرێک ناتوانێت هەموو نهێنییەکانی دونیامان بۆ کەشف بکات، فیکرێک بوونی نییە هەڵگری بنەمایەکی میتافیزیکی بێت، بتوانێت دونیا لە گشتێتیی خۆیدا بخوێنێتەوە. ئەم شێوازانە لە بیرکردنەوە، شێوازێکی شەڕانگێز و دوژمنکار و توندوتیژن و ڕۆحێکی گەورەی تێکشکاندن و وێرانکردن ئاراستەیان دەکات. ڤاتیمۆ سەر بەو فەیلەسووفانەیە کە پێی وایە دەبێت بە شێوەیەکی هێمنتر و دۆستانەتر لەگەڵ جیهان و هەقیقەتەکانی ناویدا هەڵسوکەوت بکەین، چونکە هەمیشە ئەگەری زیاد لە لێکدانەوە و ڕاڤەکردنێک بۆ دیاردەکان و پەیوەندییەکان لە ئارادایە. ئەگەر لە قۆناغەکانی بەر لە دروستبوونی دونیای مۆدێرندا ئەگەری بوونی ڕوانین و لێکدانەوە و بینین هەبووبێت، ئەوا ئەم ئەگەرە لە دونیای مۆدێرندا بەتەواوی لەناو چووە، دونیای مۆدێرن دونیایەکی تەواو پلورال و پڕ جیاوازییە و ناکرێت یەک لۆژیکی گەردوونی و گشتی هەموو ئەو جیاوازییانە ئاراستە بکات. ڤاتیمۆ لێرەدا، ڕێک بە پێچەوانەی ئەدۆرنۆ و هرۆکهایمەرەوە، باوەڕی وایە کە مەسەلەی هاتنەکایەی میدیای جەماوەری نابێتە هۆی ئەوەی مرۆڤەکان لەیەکتری بچن و ئەمیان ببن بە کۆپیی

ئەوی تریان، ڤاتیمۆ پێی وایە، تەکنۆلۆژیای زانیاری و میدیای جەماوەری، دۆخی پارچەپارچەبوون و کەرتکەرتبوونی زیاتر و گەورەتری دروست کردووە، بەتایبەتی پارچەپارچەبوونی ڕوانین و تێگەیشتنمان بۆ واقیع، بۆ ئەوەی هەیە و لە ئارادایە. ئەمەش ژمارەی ئەو کولتووورە بچووک و فەرعییانەی لە واقیعدا هەن، بەتەواوی زیاد کردووە و دۆخی پلورالیزمێکی گەورە و بەرفروانی لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا بەتەواوی بەهێز و فراوان و قووڵ کردۆتەوە.[1]

ئەم فەیلەسووفە بەوە بەناوبانگە، کە کۆمەڵێک دژ بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە، کە لای زۆر کەس قابیلی کۆکردنەوە نین، لەوانەش بۆ نموونە، کۆکردنەوەی نیتشە و مەسیحیەت و هایدگەر و کانت و تۆماس کون و گادامیر بەیەکەوە. ئەمەش بە مەبەستی بەرهەمهێنانی فیکرێک، بتوانێت بەنەرمی و هێمن و لەسەرخۆ لەگەڵ دونیادا بجووڵێتەوە، فیکرێک، ڤاتیمۆ ناوی "فیکری لاواز،" یان "فیکری بێزەبر"ی لێ دەنێت. فیکرێک، کە پەرۆشی دونیایە و لە غەمی تیمارکردنیدایە. لە ڕاستیدا لێرەدا شتێک لە ڕۆحییەتی هانا ئارێنت لە مەسەلەی خۆشویستنی دونیادا ئامادەیە، دونیایەک کە بەردەوام لە ڕێگەی لەدایکبوونەوە سەرەتای تازە دروست دەکات و ئەگەری نوێ لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. ئەم شێوازە لە فیکری بێزەبر و نەرم، فیکرێکە بەبێ حیکایەتی گەورە و قسەی گەورە و گشتگیریی گەورە، فیکرێکە هەڵگری ئەو هەموو توندوتیژییە

---

[1] ـ بڕوانە: Woodward, Ashley(2002). Nihilism and the postmodern in vattimo's Nietzsche." An Internet Journal of Philosophy Vol.6.2002.

نییە کە فیکری میتافیزیکی لە هەموو شێوەکانیدا هەڵگریەتی. "فیکری لاواز" فیکرێکە پەیوەندییەکی لاوازی بە هەقیقەتەوە هەیە و بە شێوەیەکی لاوازیش ئیددیعای هەقیقەت دەکات، بە ڕۆحییەتی ناسینی هەموو دونیا لەناو تێزێکی فیکری و سیستمێکی بیرکردنەوەدا کار ناکات. "فیکری لاواز" فیکرێکە بە جۆرێک لە میهرەبانی و ناسکییەوە مامەڵەی وشەکان و شتەکان و مرۆڤەکان دەکات، نەک مامەڵەیەکی دیکتاتۆرییانە، ڤاتیمۆ پێی وایە ئەرکی ئەم فیکرە ئەوەیە کە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و دەوروبەرەکەی، مرۆڤ و دونیا و مرۆڤ بوون، کەمترین توندوتیژیی تێدا بێت.[1]بوونی مرۆڤ و کۆمەڵگە لەم فیکرەدا دیاردەیەکی سادە نین، "شت"ێک نین بکرێت مرۆڤ بەئاسانی لە چوارچێوەی تێزێکی فیکری و فۆرمێک لە فۆرمە زۆرەکانی میتافیزیکدا لێی تێبگات، جیهان "سیستم"ێک نییە یاساکان و میکانیزمەکانی بدۆزینەوە و بێ دوودڵی بزانین لەکوێدا وەستاوین و چی لە ئارادایە و بەرەو چ ئایندەیەک دەڕۆین. هەموو هەقیقەتەکانیش لە پرۆسەیەکی بەردەوامی تەفسیرکردن و ڕاڤەکردندا دروست دەبن و هەرگیزیش نابن بە شتێکی ئەبەدی و کامڵ، هیچ "واقیع"ێکیش لە دونیادا نەماوە پارچەپارچە نەبووبێت، شتێکیش بوونی نییە وەک "جەوهەر" یان "بوونیادی قووڵ" بیانناسێنین و پێمان وا بێت هەموو پارچەکان و هەموو گشتێتیی دونیا لەناو "سیستم"ێکدا بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە و ڕاڤە دەکات.

بەکورتی، وەک چۆن هانا ئارێنت لە ئاستی سیاسی و

---

١_بڕوانە: (ل ١٦٥) Groot,Ger (١٩٩٨). *Twee zielen – gesprekken met hedendaagse filosofen*. SUN, Nijmegen

بەڕێوەبردنی ژیانی گشتیدا بەرگری لە جیاوازی دەکات و دژ بە تۆتالیتاریزمی سیاسی دەجەنگێت، ڤاتیمۆ لە ئاستی مەعریفی و ئەپستمۆلۆژیدا ئەم کارە دەکات. لای ئارێنت، مرۆڤبوون دیاردەیەکی موجەرەد و بانمێژوویی و بانکۆمەڵگە نییە، هەمیشە نیشتەجێی ناو ژیانی گشتییە و لە گۆشت و خوێن و ناو و ناوونیشان دروست بووە، ئاوا لای ڤاتیمۆ فیکریش بێناو و ناوونیشان و موجەرەد نییە و هەمیشە لەناو چەندەها پارچەی جیاوازی جیهان و واقیعدا ئامادەیە.

## فارابی و مەسەلەی پلورالیزم

یەکێک لەو فەیلەسووفە ئیسلامییانەی دەشێت هەندێک ڕوانینی سەرەتایی دەربارەی مەسەلەی جیاوازی و پلورالیزم لە بیرکردنەوەیدا بدۆزینەوەیە، فارابییە. بەڵام فارابی وەک هانا ئارێنت خەریکی بەسیاسیکردنی دونیا و بەسیاسیکردنی فەلسەفە نییە، وەک ڤاتیمۆش بەدوای بەڕێژەییکردن و پلورالکردنی مەعریفە و ئەپستمۆلۆژیاوە نییە، فارابی خەریکی بەڕێژەییکردنی دین و بەرگریکردنە لە دۆخی فرەدینیی شارەکان و نەتەوەکان و مرۆڤەکان. فارابی (٨٧٠-٩٥٠) هەندێک ڕوانینی هەیە سەبارەت بە "حوکمڕانی چاکەکار" و "سروشتی شار" و "میللەتان" و "مرۆڤ" و "دین،" کە دەکرێت وەک سەرەتایەکی گرنگ بۆ قسەکردن لەسەر پلورالیزم بیانبینین. کە ئەمە دەڵێم، بە هیچ شێوەیەک نامەوێت بەرگری لەو تێزە بکەم کە فارابی فەیلەسووفێکی

پلورالیستە و پلورالیزم ڕوانینێکی ئیشلەسەرکراوە لە فیکری ئەودا، لانی کەم بەو مانایانەی ئەمڕۆ ئێمە بە پلورالیزمی دەبەخشین، مانایەک، کە بەخشینی مافی یەکسان بە جیاوازییەکان خاڵی هەرە سەرەکی و بنەڕەتییە. پلورالیزم و جیاوازی بەو مانایەی ئەمڕۆ دەیزانین، بەشێک نییە لە فیکری دونیای بەر لە مۆدێرنە و بەشێک نییە لەو کێشە فیکری و تیۆرییانەی فەیلەسووفانی دونیای کلاسیک خۆیان پێوە سەرقاڵ کردبێت. وەک فەیلەسووفی ئەمەریکی جۆشوا پارنێس دەڵێت "فارابیی جۆن لۆکی دونیای بەر لە مۆدێرنە نییە،" فارابی لە دونیایەکدا دەژی، کە مرۆڤەکان پلەوپایە و نرخی جیاواز و نایەکسانیان هەیە، هەیانە کۆیلەیە و هەیانە سوڵتان، بۆیە ناکرێت چاوەڕوانی ئەوە بین ڕوانینی بۆ مرۆڤەکان ڕوانینێکی یەکسان و لەویشەوە بۆ دینەکان ڕوانینێکی یەکسان بووبێت.[1] فیکری فارابی لە زیاد لە شوێنێکدا لە مەسەلەی پلورالیزم نزیک دەبێتەوە و لە هەندێک ئاستیشدا بەرگری لە پلورالبوونێکی تایبەتی دونیا دەکات. ئەوەی لێرەدا پێویستە ئەنجامی بدەین، ئەوەیە بزانین ئایا فارابی لەکوێدا لە پلورالیزم و پاراستنی جیاوازییەکان نزیک دەبێتەوە؟ چییان دەربارە دەڵێت و بە چ لۆژیکێک بەرگرییان لێ دەکات؟ بۆ باسکردنی ئەم بابەتەش، دەگەڕێمەوە بۆ ئەو کتێبە گرنگەی فەیلەسووفی ئەمەریکی جۆشوا پارێنس Joshua Parens لەسەر فیکری فارابیی نووسیوە، کتێبێک

---

١_بڕوانە: Parens, Joshua (2006). An Islamic philosophy of virtous religions. Introducing Alfarabi. USA, State University of New York Press. p. 1.

کە چەندان ڕەهەندی گرنگ لە فیکری ئەم فەیلەسووفە موسڵمانەدا دەکاتەوە.[1] ئەو پرسیارانەی ئەم فەیلەسووفە لە فیکری فارابیدا بەدوای وەڵامەکانیاندا دەگەڕێت، ئەمانەیە: ئایا یەک دین دەتوانێت بەکەڵکی هەموو کۆمەڵە جیاوازەکانی مرۆڤایەتی بێت؟ ئایا دەکرێت زیاتر لە یەک دینی باش لە جیهاندا بوونی هەبێت؟ ئەگەر بکرێت زیاد لە یەک دینی باش هەبێت، ئەی باشە چۆن و بۆ چ هۆیەک ئەو دینە باشانە دەتوانن هەبن؟[2]

ئەم نووسەرە نیشانی ئەدات کە لەناو فیکری فارابیدا چەند بۆچوونێک دەربارەی دین هەن، کە ڕێگرن لەوەی باوەڕ بەوە بهێنین کە یەک دین بتوانێت خۆی وەک تاکە دینی ڕاستەقینە و تاکە دینی باش لە هەموو جیهاندا نیشان بدات، یاخود ئەم ویست و تەماحەی هەبێت. فارابی ڕێگە بۆ ئەوە دەکاتەوە مرۆڤ باوەڕی بەوە بێت، کە دەشێت زیاد لە دینێکی باش و چاکەکار لە دونیادا بوونی هەبێت. لە ڕاستیدا ئەمە لای فارابی تەنها ئەگەرێکی تیۆری نییە، بەڵکو پێداویستییەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی سەرەکییە، چونکە بە باوەڕی فارابی، ناکرێت یەک دین بەسەر ئەو هەموو مرۆڤ و کولتوور و ژینگە جیاوازانەدا بسەپێنرێت کە لە دونیادا هەن.

ئەگەرچی فارابی فەیلەسووفێکە لە زۆر بابەتدا قسەی کردووە و نووسیویەتی، بەڵام ئەوەی بۆ مەبەستی ئەم نووسینە گرنگییەکی تایبەتی هەیە نووسینە سیاسییەکانیەتی،

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١

بەتایبەتی کتێبی "وەدەستهێنانی بەختەوەری"یە، "تحسیل السعادە"یە، ئەو مۆدێلەی فارابی لەم کتێبەدا بەرگری لێ دەکات، مۆدێلی فەیلەسووف-پادشای ئەفلاتوونە. بنەمای فەلسەفە سیاسییەکەی فارابی ئەم مۆدێلە ئەفلاتوونییەیە. کردنی ئەم مۆدێلە ئەفلاتوونییە لە سیاقی ئیسلامیی فارابیدا خۆی تەحەدایەکی گەورەیە، چونکە ئەو مۆدێلە سیاسییەی فوقەهاکان بەرگرییان لێ کردووە، مۆدێلی فەیلەسووف-پادشا نییە، بەڵکو مۆدێلی پێغەمبەر-یاسادانەر، النبی-المشرع.[1] لە سەردەمی فارابیدا دروستکردنی دەوڵەتێکی ئیسلامیی جیهانی، یان دروستکردنی ئیمپراتۆریەتێکی ئیسلامیی جیهانی، بەشێک بووە لەو بۆچوونانەی لەناو موسڵمانەکاندا بوونی هەبووە، باوەڕێک بووە زۆر جار وەک بەشێک لە دینەکە وێنا کراوە و گریمانێ کبووە مەحاڵ نەبووە، ئەگەرچی هەندێک دەستەی دینی هەڵی دەگرن بۆ کۆتاییی زەمەن و هاتنی مەهدی بۆ دروستکردنی سیستمێکی جیهانیی بێخەوش و پێرفێکت.[2]

تێزی سەرەکیی فارابی لە کتێبی "وەدەستهێنانی بەختەوەری"دا تێزی مەحاڵبوونی دروستکردنی "شارێکی چاکەکار-المدینە الفازیلە." بۆیە ئەگەر دروستکردنی تەنها شارێکی چاکەکار مەسەلەیەکی مەحاڵ بێت، ئەی چۆن دروستکردنی جیهانێکی چاکەکار، دروستکردنی دەوڵەتێکی جیهانیی چاکەکار مەحاڵ نییە. ئەم مەسەلەی مەحاڵبوونە بە پلەی یەکەم پەیوەندیی بە "سروشت"ی مرۆڤەوە هەیە. فارابی پێی وایە دروستبوونی فەیلەسووف-پادشا خۆی

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٠

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٩

کارێکی هێجگار زەحمەت و پڕکێشەیە، بۆ نیشاندانی ئەم زەحمەتییەش، ئەو چوار جۆر فەیلەسووف لە یەکتری جیا دەکاتەوە، کە تەنها یەکێکیان فەیلەسووفی ڕاستەقینەیە و توانای ئەوەی هەیە کە ڕۆڵی فەیلەسووف پادشا ببینێت. ئەو چوار شێوازەش بریتین لە "فەیلەسووفی نوقسان،" "فەیلسووفی ساختە،" "فەیلەسووفی ڕووکەشپەرست" و "فەیلەسووفی باتڵ."[1] هەریەکێک لەم شێوازانە لە فەیلەسوفی ناڕاست نووقسانیی تایبەتیان هەیە کە ڕێگر لەوەی ببن بە فەیەلسووفی ڕاستەقینە، ئەو نوقسانییانە دەشێت نوقسانیی تیۆری یان کردەیی یان ئەخلاقی بێت. فەیلەسووفێک کە قابیلی ئەوە بێت ببێت بە پادشا. لەم خاڵە زەحمەتتر و قورستر ئەو پەیوەندییەیە کە فەیلەسووف پادشا لەگەڵ ئەو شارەدا دروستی دەکات کە دەبێت بە حوکمڕانیی. لە هەموو شارێکدا زیاد لە جۆرێک خەڵکی جیاواز دەژین، کە ڕوانینیان بۆ "بەختەوەری" تەواو جیاوازە لە ڕوانینی فەیلەسووف-پادشا. ئەگەر شار و دانیشتوانەکەی نەیانەوێت سوود لە حیکمەت و مەعریفەی فەیلەسووف-پادشا وەر بگرن و هەر هێزێک کەوتە دوای وەدیهێنانی ڕوانینی خۆی بۆ بەختەوەری، ئەودەم بوون یان نەبوونی فەیلەسووف وەک پادشا سوودێکی ڕاستەقینەی نابێت. ئەمەیە وا دەکات تەنانەت لە ئاستی یەک شاردا زۆر زەحمەتە، ئەگەر مەحاڵ نەبێت، بکرێت شارێکی چاکەکار و پێرفێکت دروست بکرێت.[2] خاڵێکی دیکە، کە فارابی لەپاڵ سۆکراتدا بەرگریی لێ دەکات، ئەوەیە فەیلەسووف هەر لە

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٣١

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٣٤

بنەڕەتەوە نایەوێت حوکمڕان بێت، نایەوێت ببێت بە پاشا، چونکە دەزانێت هەمیشە چەندان هێز و کەسایەتی و گرووپی تر هەن کە تەماحی تریان هەیە و کاری ئەو وەک فەیلەسووف-پادشا زۆر زەحمەت، ئەگەر نەڵێم مەحاڵ، دەکەن.[1]

خاڵێک کە فارابی گرنگییەکی تایبەتی پێ ئەدات، مەسەلەی جیهادی هێرشبەرانەیە بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام بە نیازی دامەزراندنی ڕژێمێکی جیهانیی چاکەکاری بێخەوش. فارابی دامەزراندنی ئەم ڕژێمە جیهانییە لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی ئیسلامەوە بە هۆی جیهادی سەربازییەوە، واتە دامەزراندنی خەلافەتێکی جیهانی، بە خەون و ئایدیالی فوقەهاکان دەزانێت. ئەوەی فارابی لەم بارەیەوە ئەینووسێت، بەرگریکردن نییە لەم ئایدیالە، بەڵکو پرسیارکردنە دەربارەی واقیعیبوون و توانای بەرجەستەکردنی لەناو مێژوودا.[2] لە دیدی فارابیدا، ناچارکردنی کەسانی تر بۆ ئەوەی بەزۆر ببن بە چاکەکار، لە ڕێگەی جەنگەوە دینی ڕاستەقینەیان بەسەردا بسەپێنرێت و بەختەوەر ببن، کاری نەکردەیە. ئەوانەی بەو جۆرە ناچار دەکرێن چاکەکار بن، بەختەوەر نابن، ڕەنگە تەسلیم ببن و گوێڕایەڵ بن، بەڵام بەختەوەر و چاکەکار نابن.

فارابی هەر لە بنەڕەتەوە پێی وایە کە دین فرەجۆر و فرەشێوەیە، هەمیشە زیاد لە دینێک هەیە و ئامادەیە. جگە لەمە، هەموو دینێکیش پێویستە بەبەردەوامی خۆی بگونجێنێت لەگەڵ ئەو سەردەم و شوێنەدا کە تیایدا ئامادەیە. لەپاڵ ئەم ئەرگومێنتی فرەجۆری و فرەشێوەیییەی دیندا، فارابی

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٥٥-٣٦

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦١

پێی وایە میللەتەکانیش فرەجۆر و جیاوازن، هەر میللەت و نەتەوەیەک ئاکاری تایبەتی هەیە و لە میللەت و نەتەوەکانی تر جیاوازە. لە پەیوەندیی نێوان دین و میللەتیشدا، فارابی باس لەوە دەکات، ئەو یاسا دینییانەی کە هەن، بۆ ئەوەی بتوانن میللەتێکی چاکەکار دروست بکەن، پێویستە لەگەڵ ئاکاری ئەو میللەتەدا بگونجێت. تەنها بەم خۆگونجاندنە دین دەتوانێت میللەتێکی چاکەکار دروست بکات.[1] فارابی پێی وایە، ڕاستە دینەکان کۆمەڵێک ڕوانین و پراکتیکی هاوبەش و هاوشێوەیان هەیە، بەڵام ئەوەی یەک دین بەسەر هەموو دونیادا بسەپێنرێت، یان ئیمپراتۆریەتێکی جیهانی دروست بکرێت، کە یەک دینی هەبێت، ئەوە شتێکە تەواو شوێنی گومان و نارەحەتیی ئەوە. لای فارابی، بینین و دانانان بە جیاوازییە دینییەکان خۆیاندا بەشێکی گرنگی پاڵپشتیکردنی چاکەکارییە.[2] چاکەکاری مانای ئەوە نییە یەک دین دەست بەسەر دونیادا بگرێت، یان دونیا لەناو دینێکدا شوێنی هەموو جیاوازییەکانی بکاتەوە، بەڵکو لەوەدایە، ئەو جیاوازییانە بپارێزرێن و هەر شار و میللەت و نەتەوەیەک بەپێی هەلومەرجی خۆی دینداریی خۆی ڕێک بخات.

ئەوەی فارابی بەرگریی لێ دەکات، ئەوەیە هیچ دینێک ناتوانێت حوکمێکی دادپەروەرانەی هەموو دونیا بکات، دونیا زۆر گەورەتر و پلورالتر و پرجیاوازیترە لەوەی یەک دین بتوانێت ڕژێمێکی دادپەروەرانە لە هەموو پارچەکانیدا دروست بکات و حوکمی بکات. هەر لە بنەڕەتیشەوە وا باشترە هیچ

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧٧

٢_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨١

دینێک ئەو تەماحە جیهانییەی نەبێت، بەتەمای ئەوە نەبێت ببێت بە تاکە دینی دونیا. فارابی پێی وایە پرۆژەی ئەوەی یەک دین ببێت بە دینی هەموو دونیا، تەنها پێویستی بەوە نییە کە هەموو نەتەوەکانی دونیا ببن بە نەتەوەی چاکەکار، بەڵکو پێویستی بەوەشە هەموو شارێک لە شارەکانی دونیا و ناو یەک نەتەوەش ببن بە شاری چاکەکار.[1] جگە لەمە، بۆ ئەوەی سەرۆکی هەموو نەتەوەیەک و هەموو شارێک لە شارەکانی دونیا ببێت بە سەرۆکێکی چاکەکار، دەبێت هەریەکێکیان فەیلەسووف-پادشا بێت، نەک سەرۆکێکی دینی یان سیاسیی ئاسایی. ئەگەر ئەمەش ڕوو بدات، کە لە دیدی فارابیدا مەحاڵە ڕوو بدات، ئەودەم دەبێت ئەو فەیلەسووفە پادشایانە هەموویان هەڵگری یەک مەعریفە نین، ئەمەش ناکرێت، چونکە ئەو فەیلەسووف-پادشایانە هەریەکێکیان هەڵگری ئەو مەعریفەی دەبێت کە لەگەڵ سروشتی خەڵکی ئەو ناوچەیەدا و لەگەڵ ئاو و هەواکەی و لەگەڵ شوێنەکەیدا دەگونجێت. بە مانایەکی دیکە، ناکرێت جیهان لە ڕێگەی یەک شێوە لە مەعریفە و یەک شێوە لە دینەوە بەڕێوە ببرێت. بۆیە ئەوەی پێویستە، ئەوە نییە دینێکی چاکەکار و چاکەخواز هەبێت بۆ هەموو دونیا، بەڵکو چەندان دینی لەو جۆرەیە کە هەریەکە بەکەڵکی ناوچەیەک لە ناوچەکانی دونیا و میللەتێک لە میللەتەکانی بێت. بۆیە فارابی پرۆژەی دروستکردنی حوکمڕانییەکی جیهانی لەژێر سایەی یەک دیندا نەک بە کارێکی کردەکی - عەمەلی، نازانێت، بەڵکو

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢

بە ئایدیالێکی باشیشی نازانێت.[1] ئەگەر ئەمە دیدی فارابی بێت بۆ مەسەلەی چۆنێتیی ڕوانین بۆ مەسەلەی حوکمڕانی و دەوڵەتداری لە جیهاندا، هەنگاوی دوای ئەوە، هەنگاوێک کە فارابی لە چوارچێوەی ئاستی گەشەکردنی مەعریفی و ئەو پارادایمانەی لە سەردەمی ئەودا بەرجەستە بوون، نەیتوانیوە بینێت، مەسەلەی لێبووردن و قبوڵکردنی جیاوازییە دینی و فیکری و مەعریفی و سیاسییەکانە. بەڵام وانەیەک بکرێت لەم ڕوانینە فەلسەفییانەی فارابییەوە فێری ببین قبوڵکردنی جیاوازی و پلورالیزمە لە دونیادا و ڕێکخستنیانە بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانەی دوور لە جەنگ و شەڕ و کوشتار.

جگە لەمە، لە فیکری فارابیدا ئەو تێزە ئاشکرایە کە ناکرێت حوکمەتێکی جیهانیی دینیی ئایدیالی لە ڕێگەی جەنگ و شەڕوشۆڕ و کوشتاری دینییەوە دروست ببێت. فارابی لە ڕێگەی شوێنپێهەڵگرتنی ئەفلاتوونەوە بەو ڕاستییە دەگات، کە تەنانەت دروستکردنی ڕژێمێکی پاکژ و خاوەنفەزیلەت لە ئاستی شارێکدا مەحاڵە، بۆیە دروستکردنی لە ئاستی جیهاندا کاری نەکردە و تەواو مەحاڵە. ئەم ڕوانینە وا لە فارابی دەکات گومانێکی زۆری لەوە هەبێت کە لە ڕێگەی جیهادەوە، لە ڕێگەی جەنگ و پەلاماری دینییەوە، بکرێت سیستمێکی ئایینیی جیهانی دروست بکرێت کە بۆ هەموو شارەکان و نەتەوەکان و مرۆڤەکان باش بێت. بە هەمان شێوەی ئەفلاتوون، لای فارابیش، دروستکردنی شارێکی پاکژ و چاکەکار مەحاڵە، واتە مەحاڵە بکرێت سیستمێکی سیاسیی

---

١_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢

چاکەکار، کۆمارێک، تەنانەت لەناو شارێکدا دروست بکرێت، کە سیستمەکە بێکێشە و پێرفێکت و چاکەکار بێت، چ جای دروستکردنی حکومەتێک بۆ هەموو دونیا کە خاوەنی ئەو ئاکارانە بێت. بۆیە پێویستە هەر نەتەوەیەک ئەو شێوازە لە دینی هەبێت کە لەگەڵ سروشت و ئاکار و هەلومەرجی تایبەتی خۆیدا دەگونجێت. ئەوەی دونیا پێویستی پێیەتی، یەک دین نییە بۆ هەمووان، چونکە ئەمە مەحاڵە، بەڵکو زیاد لە دینێکە کە هەریەکێکیان گونجاوە لەگەڵ سروشتی ئەو مرۆڤانەدا کە هەڵی دەگرن. لە دیدی فارابیدا، ئەسڵەن یەک دین ناگونجێت لەگەڵ سروشت و پێکهاتی جیاوازی شارەکان و نەتەوەکان و مرۆڤەکاندا. بەکورتی، ئەوەی فارابی لە خوێندنەوەی ئەم فەیلەسووفە ئەمەریکییەدا داوای دەکات، وازهێنانە لە دوو شت: یەکەمیان لە هەوڵدان بۆ دروستکردنی یەک حکومەت بۆ هەموو دونیا. دووهەم لە سەپاندنی یەک دین بەسەر هەموو دونیادا.

لێرەشدا ئەو خاڵەی لەنێوان هانا ئارێنت و ڤاتیمۆ و فارابیدا هاوبەشە، پێداگرتنی هەریەکێکیانە لەسەر مەسەلەی جیاوازی و پلورالیزمیی کۆمەڵایەتی و ئینسانی و دینی. جیاوازییەک لای هانا ئارێنت تۆتالیتاریزم نەفی دەکات و هەوڵی لەناوبردنی ئەدات، لای ڤاتیمۆ هەقیقەتگەرایی دەسڕێتەوە، لای فارابیش خوازیاری ئەوەیە کۆتایی بە پرۆژەی سەپاندنی یەک دین بەسەر هەموو دونیادا بهێنێت. لە هەرسێ دۆخەکەدا ئێمە لە بەردەم فیکرێکداین، کە بە شێوازی جیاواز بەرگری لە پلورالیزمی جیهان و کۆمەڵگە و مرۆڤەکان دەکات.

# دەرەنجام

بۆ بەرگریکردن لە پلورالیزم، دەکرێت بە زیاد لە شێوەیەک بیر بکەینەوە و بە زیاد لە شێوەیەک بەرخورد بکەین. دەشێت بەرگریکردنەکەمان بەرگریکردنێکی سیاسیی فەلسەفی بێت بەمەبەستی بەگژاچوونەوەی ئەو ئەگەرە تۆتالیتارانەی کە بەشێکن لە پێکهاتەی دەوڵەت و دەسەڵاتی مۆدێرن. دەشێت ئەم بەرگرییە بەرگریکردنێکی فیکریی مەعریفی بێت، پابەستە بەو ڕاستییەوە کە کۆمەڵگە مۆدێرنەکان کۆمەڵگەی پڕ جیاوازیی هەمەجۆرن، لە جیاوازیی بۆچوون و ڕوانین و خەونبینینەوە، بۆ جیاوازیی ئەخلاق و شێوەژیان و پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی. بەڵام دەشێت بەرگرییەکی میتافیزکی بێت بەوەی کە گەردوون خۆی وەک گەردوونێکی پلورال و پڕ جیاوازی ببینێت و لەناو ئەم گەردوونەشدا ئەزموونکردنی شتەکان و دیاردەکان وەک ئەزموونکردنێکی جیاواز وێنا بکات. لە هەمان کاتدا دەشێت ئەم بەرگرییە بەرگرییەکی ئەپستمۆلۆژی بێت، بەو مانایەی پێ لەسەر ئەوە دابگرێت کە چەمکەکان و تیورەکان و هەقیقەتەکان هەموویان پابەستن بە دۆخێکی ئینسانی و مێژوویی دیاریکراوەوە و لە ناوەوەڕا چەندەها درز و کەلێنینان تێدایە، کە وایان لێ دەکات نەتوانن جەوهەری و ئەبەدی بن. چ هەقیقەتە سیاسییەکان و چ هەقیقەتە ئەخلاقییەکان و چ هەقیقەتە فەرهەنگییەکان، هەموویان بگۆڕن و ڕێژەگەران.

لەم ناوچەیەی ئێمەدا هیچ شتێک هێندەی سەرهەڵدانی ڕادیکاڵیزمی ئیسلامی گرنگیی پلورالیزممان نیشان نادات. ئەزموونی سعودیە، تاڵیبان، ئێران، قاعیدە و داعش نیشانمان ئەدات ئەوانەی نەفیی پلورالیزم دەکەن، چ جۆرە مۆتەکەیەکی سیاسی و ئەخلاقی و کولتوورییان لێ دەر دەچێت. چۆن لەپێناوی سەپاندنی یەک جۆر لە تێگەیشتنی دینی و یەک وێنەدا بۆ باشە و خراپە و یەک وێنە بۆ مرۆڤ، ئامادەن هەموو شتێک وێران بکەن. پلورالیزم لە دیدی ئەمانەدا هێرشکردنە سەر قەداسەتی تێکستەکان و تێگەیشتنەکانیانە، لەم ڕوانینەدا، وەک چۆن خودا یەکە و شەریکی نییە، ئاواش تێکستە دینییەکان یەک مانایان هەیە و قابیلی تەفسیر و لێکدانەوەی جیاواز نین. نەفیکردنی پلورالیزم چ لای ئەم هێزانە و چ لای هاوشێوە ئایدیۆلۆژییە عەلمانی و ناعەلمانییەکانیان، هاوشانە بە مۆنۆپۆلیزەکردنێکی تەواو و فراوانی هەقیقەت، هاوشانە بە بێماناکردن و بێنرخکردن و سووککردنی هەموو شتێک، نەکەوێتە سنووره داخراوەکانی ئەو هەقیقەتەوە. لەم ڕوانینەدا هەقیقەت هەموو ئەگەرێکی ڕێژەییبوون و کرانەوە و دیالۆگی پلورالییانە لەدەست ئەدات.

دەرەنجامی ئەمەش، پەرگیری، فاناتیزم، و پەککخستنی لێبووردەیی و وێرانکردنی ڕۆحیەتی ڕێککەوتن و نەفیکردنی دانوستانە، کە دواهەمین دەرەنجامی هەموو ئەمانەش، بەرهەمهێنانی توندوتیژییە لە هەموو شێوەکانیدا.

## سەرچاوەکان:

Berman, Paul Schiff (2013). Jurisgenerative Constitutionalism: Procedural Principles for Managing Global Legal Pluralism. Indiana Journal of Global Legal Studies Vol. 20, Issue 2, P. 665.

Collins, R., Makowsky, M. (red.), The Discovery of Society. (2010) New York: McGraw-Hill, pp. 92-104

Grimshaw, Mike (2014). Flaneuring with Vattimo: the annotative hermeneutics of weak thought. Critical research on Religion. Vol. 2(3)p.267

Groot,Ger (1998). *Twee zielen – gesprekken met hedendaagse filosofen.* SUN, Nijmegen

Hannah Arendt (1958). The human condition. Chicago: University of Chicago Press. p 176-177.

Hannah Arendt (1993). Between Past and Future. New York: Penguin Books.

Hannah Arendt (2005). The Promise of Politics. Ed. Jerome Kohn. New York: Schocken

Parens, Joshua (2006). An Islamic philosophy of

virtous religions. Introducing Alfarabi. USA, State University of New York Press. p. 1.

Peter Berger (2014). The many altars of modernity. Toward a paradigm for religion in a pluralist age. De Gruyter Mouton.

Siobhan Kattago (2013). Why the world matters: Hannah Arendt's philosophy of New beginnings. The European Legacy, Vol. 18, No. 2,

Rawls, Anne Warfield (2012). Durkheim's theory of modernity: Self-regulating practices as constitutive orders of social and moral facts. Journal of Classical Sociology, 2012, Vol.12(3-4), pp.479-512

Richard J. Bernstein (2015). Cultural Pluralism. Philosophy and Social Criticism, Vol. 41(4-5) 347–35

Vattimo, Gianni and Santiago Zabala (2002). "Week Thought" and the reduction of violence. A dialogu with Gianni Vattimo. Common Knoweledge, Volume 8, Issue 3,, Fall 2002, P. 454.

Vattimo, Gianni (2010). The responsibility of the philosopher. Ed. Franca D'agostini. New Yory: Columbia university press.

Vattimo G and Zabala S (2011) Hermeneutic Communism: From Heidegger to Marx. New York Columbia University Press. p 96.

Vattimo, Gianni & Pier Aldo Rovatti (2012). Weak Thought. State University of New York Press.

Woodward, Ashley(2002). Nihilism and the postmodern in vattimo's Nietzsche." An Internet Journal of Philosophy Vol.6.2002.

فرانسوا شاتالى (١٩٨٤). تاريخ الافكار السياسيه. ترجمه د. خليل احمد خليل. بيروت. معهد الانما العربى. ل ١٢.

ئەم کتێبە باس لە سێ چەمکی سەرەکیی ناو دونیای مۆدێرن دەکات، کە بەسەر یەکەوە ڕوانینێکی نوێ بۆ مرۆڤ دەهێننە کایەوە وەک بوونەوەرێکی خاوەنماف و یەکسان، وەک کەسێکی خاوەنکەرامەت، کە لەناو دونیا و کۆمەڵگەیەکی پلوراڵدا دەژی.

ENDESE

٦٠٠٠ دینار